شوان رابەر

# کورتەیەک
# لە بیروباوەڕی پێشینە چاکەکان

## ( ئەهلی سوننە و جەماعەت )

منتدى اقرأ الثقافي

www.iqra.ahlamontada.com

1434 چاپی دووەم 2013

# کورتەیەك

# لە بیر و باوەڕی پێشینە چاکەکان

ئامادە کردنی

عبدالله عبدالحمید الاثري

پێداچوونەوە و پێشەکی نووسینی

چەندان زانای پایەبەرز و دانسقە

بەکوردی کردنی

شـوان رابـەر

( بەپەراوێزەوە )

# ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب : کورتەیەك لە بیروباوەڕی پێشینە چاکەکان
ئامادەکرنی : عبدالله عبدالحمید ئەسەری
ودرگێرانی بە پەراوێزەوە لەعەربی : شوان رابەر
تیراژ : ٣٠٠٠ دانە.
نۆرەی چاپ : چاپی دووەم (١٤٣٤ ك – ٢٠١٣ ز – ٢٧١٣ کو )
چاپ : چاپخانەی منارە - هەولێر

لـە بەرێوەبەرایـەتی گشـتی کتێبخانـە گشـتییەکان ژمـارەی سـپاردن (٢٥٤٤)
ساڵی ٢٠١٢ هەولێر

# بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

**خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ :**

**يَا قَوْمَنَا أَجِيبُوا دَاعِيَ اللَّهِ وَآمِنُوا بِهِ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ {الأحقاف/٣١} .**

**واتە :** ئەی گەلەکەمان ، دە وەڵامی بانگەوازخوازی خوای گەورە بدەنەوەو بەدەمیەوە برۆن کە بۆلای خوای گەورەو ڕێبازەکەی بانگتان دەکات ، تابەهۆی ئەوە خوای گـەورە لێتان رازی بێ و لە سزاوئازاری دژوارو بە ئێشـی دۆزەخ بتـان پـارێزێو بتـان باتـە بەهەشتەوە .

**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ {آل عمران/١٠} .**

**واتە:** ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان هێناوە دە لەخوای گەورە بترسـن بـەجۆرێك کـە شایستەی ئەوە ، ئاگادار بن مەمرن مەگەر بە موسڵمانێتی و لەسەر ئیسلام نەبێ .

ئەی پەروەردگارمان ، کارو کردەوە کانمان لێ گیرا بکـە ، بەراسـتی تـۆ زۆر بیسـەرو زاناو دانایت .

**ئەی خوایە :** هەموو کارو کردەوەکانم چاك و پاك بکە ، وە بە دلسۆزی بۆ خۆت لێم قەبول بکە ، هیچ شتێکی کەسی تێ مەکە .

خوایە بە هۆی ئەم پەرتوکە ئەم کەسانە خێر بارو سود مەند بکەیت :

دانەرەکەی ، خوێنەرەکە ی ، گوێگرەکەی ، بلاوکەرەوەکەی .

خوایە دوعا و نزاو پارانەوەکانمان لێ گیرا بکەیت .

## ئەو زانایانەی

## بەم پەرتوکە داچوونەتەوە یا پێشەکییان بۆ نووسیووە ئەمانەن

١- الشيخ العلامة عبدالله بن عبدالعزيز العقيل

٢- فضيلة الشيخ العلامة عبدالله بن عبدالرحمن الجبرين

٣- فضيلة الشيخ العلامة صالح بن فوزان الفوزان

٤- معالي الشيخ صالح بن عبدالعزيز ال الشيخ

٥- الشيخ صالح بن عبدالرحمن الحصين

٦- فضيلة الشيخ الدكتور سعود بن ابراهيم الشريم

٧- الاستاذ الدكتور ناصر بن عبدالكريم العقل

٨- الاستاذ الدكتور محمد بن عبدالرحمن الخميس

٩- فضيلة الشيخ الدكتور ماهر بن ياسين الفحل

١٠- الشيخ الدكتور عبدالمحسن بن عبدالعزيز العسكر

١١- الشيخ الجليل محمد راشد بن خالد القرة گويلى

١٢- فضيلة الجليل محمد بن جميل زينو .

## دەستپێك

سوپاس‌و ستایشـێکی شایستەو بێ پایان بۆ خوای بەرزو بالای کردگاری بوونەوەرو جیهان، داوای لێخۆشبوون‌وکۆمەکی‌وهاوکاری‌و رەحمەت‌ودرود هەر لەو دەکەین ، وە پەنا دەگرین بە خوای تاك‌ودانا لە کارو کردەوە بە دەکان‌وخوە خراپەکانی دل‌و دەروونمان ، هەرکەسێ خوای گەورە راستە رِێ ی بکا بەکەس گومراو سەرگەردان نابێ ، وە هەرکەسێکیش خوای گەورە گومراو سەرگەردانی بکا بە کەس راستە رِێ و رێنما ناکرێ ، وەگەواهی دەدەم کە هیچ خوایەکی بە هەق نیە جگە لەو خوایەی کە تاك و تەنیایە و بێ هاوتاو هاوبەشەو دروستکەرو بەرێوەبەری بوونەوەرە ، وە گەواهیش دەدەم کە موحەممەد (ﷺ) بەندە و کۆتاپەیامبەری خوای گەورەیە .

ئەی برای بەرێزی موسلمان : ئەم نووسینە تەنها چەند وشەیەکی کورت و پوختن لەبارەی رونکردنەوەی : ( **کورتەیەك لە بیرو باوەڕی پێشینە چاکەکان** ) واتە : سەلەفی سالح‌و ئەهلی سوننەو جەماعە .

ئەمڕۆ زیاتر ئەو باسانە کۆکراینەوەو نوسراینە کە ئوممەتی ئیسلامی تیادا دوچاری ناکۆکی و پەرتەوازەیی‌ودوبەرەکی بووە ، کە خۆی لەو کۆمەڵە هاوچەرخانە دەنوێنێ ، چونکە ئەو کۆڕو کۆمەڵانەی کە ئەمڕۆ لە گۆڕەپاندا کاردەکەن و هەن ، هەر هەموویان بانگەواز بۆ بەرنامە و بیر وباوەڕەکەیان دەکەن و خۆیان بە نمونە و پێشەنگ و راست‌وڕەوا دەزانن و تاکانەوپاکانەی کۆمەڵی خۆیان دەکەن بەجۆرێ کەکار لە خەڵکی تێك چوە و سەریان لێ شێواوە و ، نازانن کە پەیڕەوی لە کێ بکەن‌و بەدوای کێ و کام لایەن بکەون ؟! .

بەڵام سوپاس بۆ خوای گەورەومیهرەبان ، کەخێر و چاکە لەو ئوممەتە هــەرگیز نـابڕێ ئەگەر هەمیشە تارۆژی بەرێ کۆمەڵێك هەبن لەسەرهەق و هیدایەت بن ، هــەروەك پەیامبەری خوای گەورە لەو بارەویەوە هەواڵی داوەو فەرموویەتی :

**( لاتزال طائفة من أمتي ظاهيرين على الحق ، لا يضرهم من خذلهم حتى يأتي أمر الله وهم كذلك ) رواه مسلم .**

**واتە :** هەمیشە لە ئوممەتی من کۆمەڵێك لەسەر هەق هــەن و دەبــن ، تـا فرمـانی خوایــان بــۆدێ ( تــارۆژی دوایــی )، ئــەو کەســەی کەلەســەر ئــەوە خاویــان دەکاتەوەودژیەتیان دەکا و سەر شۆڕیان دەکا ، هیچ زەرەرو زیانێکیان پێ ناگەیەنێ ، بەڵکو تاکاتی خۆی هەر لەسەر ئەو ڕێبازە پیرۆزەو ئازیزە دەژێنو دەمرن .

لێرەدا پێویستە لەسەرمان کە پێناسەی ئەو کۆمەڵە پیرۆزە بکەین کە پەیوەستە بەو ئیسلامە ئازیزو ڕاستەی کە پێغەمبەری خـوای گــەورە و چـینی هاوەڵەبـەڕێزەکان و شوێن کەوتووەکانیان هێناویانە ، ئەو کۆمەڵەش کۆمــەڵی ســەرکەوتوو : ( **الفرقة الناجية ، الطائفة المنصورة** ) یە کە بە ئەهلی سوونەو جەماعــە ، بــە ئــەهلی حەدیس و سننەوشوێن کەوتن ناو دەبرێن .

جابۆیە پەلەم کرد لە کورت کردنەوە و پوخت کردنەوەی ئەم کتێبە( کورتە/موجز ) یــە لەپەرتوکەکــەم بــەناوی ( **الوجيز في العقيدة السلف الصالح** ) کــە لــە پەرتووکــەکانی ئــەو پێشــەوا چــاکانەم وەرگرتــووە کــەخاوەن ( زانســت و زانیــاریو دادگەریو شوێن کەوتن )ن .

وەسور بووم لەسەر ئەوەی کە ئەم ( کورتە ) باسە ببێتە کتێبێکی سوك و خنجیلانە بۆ ئاسان تێگەیشتن لە ئاینو بیروباوەری ئیسلام ، کە کورتە و پوختەی بــیرو بــاوەڕی ئەهلی سوننە و جەماعەیــە بــە شــێوازێکی کــورت وپوخــتو ئاســان لــە خــۆی دا

کۆبکاتەوە ، بۆئەوەی هەموو خوێنـەرە بـەڕێزو ئازیزەکـان بەباشـی لێ ی تێبگـەن و بەهرەمەند بن ، بە تایبەت تازە دەست پێکەر و پێگەیشتوان لە ڕۆڵـەکانی رابـوونی ئیسلامی پیرۆز ، وە بۆ پوختە تێگەیشتن و فێربوونی بیرو بـاوەڕی پێشـینە چـاکەکان سەبارەت بەو لاوانەی کـەتازە رێنمـایی کـراوو پەیوەسـتن بەئیسـلام ، بەشـێوەیەکی راست و رون و سوك و ئاسان ، چونکە زانستی بیرو باوەڕ وەك زنجیرەیەکی پێکەوە لکاو و پەیوەست وایـە کەهـەر ئالقەیـەك پەیوەسـتە بـە ئەویکـە ، جـا ئەگـەر مرۆڤـی موسڵمان لە کورتەی بیرو باوەڕ تێ نەگا ، ناتوانێ لە درێـژە و سـەرجەم بەشـەکانی تری تێ بگا .

وەئەسڵی کتابەکەم خستە رووی زانایانی پایـە بـەرزی وەك ( شـێخ سـعود شـورەیمی خەتیبی مزگەوتی حەرام و شێخ محمدجمیل زینوو و دکتۆر محمـد خمـیس ) و چـەندان زانای تر .

خوای گەورە پاداشتی خێریان بداتەوە ، بۆئەوەی تالیقی لەسەریدەن ، ئـیتر داواکـارم لە خوای بالا کەوا بکا کردەوەکانم تەنها بۆ ئەو بێ ، وەلێم گیرا بکـا ، بـەهۆی ئـەوە موسڵمانان بەهرە مەند بن.... خوایە لێم قبول بکەو ، وەری بگرە لێم .

باوکی محمد

عبدالله عبدالحمید عبدالمجید أسماعیلی ئەسەری

نیشتەجێی ئەستەمبوڵ

١٥شەعبانی ١٤١٨ك

# پێناسە پێویستەکان ( التعريفات الضرورية )

## پێناسەی بیروباوەڕ

### بیرو باوەڕ لە زماندا :

لەبەستن و گرێ دان ( عقد ) ەوەیە ، واتە : بەندو پەیوستو پەیوەند ( ربط ) ، یـا ئیمزا ( إبرام ) کردن ، یا متمانە و پەیوەستوتوندکردن ( توثيق)، یا گـرتن و تونـد کردنی بەهێز ( الشد بالقوة )، وەلە دڵنیایی و یەکلایی و بڕەوی ( اليقين الجـازم ) ەوەیە.

گرێ دان پێچەوانەی هەڵوەشاندنەوە (حل) ە ، هەروەك دەگـوترێ گـرێ ی دا ، گـرێ دەدا ، بەگرێ دان ، هەروەك سوێند خواردن و مارە کردن ، بەگرێ دان ناو دەبرێ وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

**لاَ يُؤَاخِـذُكُمُ اللّـهُ بِـاللَّغْوِ فِـي أَيْمَـانِكُمْ وَلَكِـن يُؤَاخِـذُكُم بِمَـا عَقَّـدتُّمُ الأَيْمَـانَ فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاَثَـةِ أَيَّامٍ ذَلِكَ كَفَّارَةُ أَيْمَانِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ وَاحْفَظُواْ أَيْمَانَكُمْ كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ {المائدة/٨٩}.**

**واتە :** خوای گەورە دەربارەی ئەو سوێندانە ناتان گـرێ کـە بەسـەر زارەکـی (بـەبێ نیـەت) بەدەمتانـەوەدێن ، بـەڵکو لەسـەر ئەوانـە دەتـان گـرێ و لەسـەرتان حسێبەوگوناهبار دەبن کە لەدڵەوە بەنیازو مەبست گوتووتانە .

بیرو باوەر: ئەو حکومەیە پیاوی خاوەن بیرو باوەر گومان و دوو دڵی قەبوڵ ناکا، بیر و باوەڕ لە ئاییندا مەبەستی پێ ئیتقانی جگە لە کردەوەیە ، وەك بیر و بـاوەڕ بـەبوونی خوای گەر ورە و ناردنی پێغەمبەر (ﷺ) .

بیروباوەر ( **عقیدة** ) کۆی بیروباوەڕەکان (**عقائد**) ە .

پوختەی بیرو باوەڕ ئەوەیە کە دڵی مرۆڤی لەسەر گرێ دەدرێ ، چ هەق بێ یا باتیل ، پێی دەگوترێ بیروباوەر، با بڕوای بەهەر شتێك بێت .

## بیر و باوەڕ لەرووی زاراوەوە :

بریتییە لەو شتانەی کە پەیوەستن بەدڵەوەدەروون و، دڵ تەواو بەڕاستیان دابنێ و نـاخ و دەروون پێیانەوە پابەند و پەیوەستو هۆگر و دڵنیـا بـێ ، تـا دەبێتـە یـەقینێکی جێگیر لەدڵدا کە هیچ گومان و دڕدۆنگیەکی تری تێکەڵ نا بیّو کاری تێناکات .

بیروباوەر ، واتە : ئەو ئیمانە تەواوەی کە مرۆڤی خاوەن بیر و باوەڕ هەرگیز دووچـاری گومـان و دودڵی ناکا ، دەبێ لەگەڵ واقیعیش دا بێتەوە ، شەك وگومـان قەبول نـەکا ، چـونکە ئەگـەر زانسـت و بـڕوا هەبوونەکـەی نەگاتـە ئاسـتو پلـەی دڵنیـایی و بێگومـانی ، بەعەقیدە و بیرو باوەڕ ناونابرێ و دنانرێ ، بەلکو بۆیە بە بەعەقیـدە و بیرو باوەڕ ناودەبرێ و دادەنرێ ، چونکە مرۆڤ دڵی خۆی لەسەر ئەوە گرێ دەداو کۆتو بەندی دەکات .

# بیروباوەڕی ئیسلامی

بریتییـە لـە : بـڕوا هـەبوونێکی تۆکمـە و تەواوویـەو بـەخوای تاك‌وتـەنها وبـە فریشتەکانی و بەکتێبەکانی و بەپەیامبەرانی و بە ڕۆژی دوایی و بە قـەزاو قـەدەری خوای گەورە لەرووی چاکە و خراپە ، وە بەهەموو ئەو شـتانەی کەلـەبارەی جیهـانی نادیار و پەنهان بەبەڵگە سەلمێنراون ، وەبە بنچینەکانی ئایین و هەموو ئەو شـتانەی کە پێشینە چاکەکان لەسەری کۆکن ، وە بریتییە لە خۆ بەدەستەوە دانێکی تەواو بۆ خوای گەورە لـەبارەی : ( ئـیش و کـارو حـوکم و دەسـەڵات و گوێرایـەڵی و شـوێن کەوتنی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) .

بیرو باوەڕی ئیسلامی : هەر کاتێ ئەو ناونیشانە هات ، واتە : بیر و بـاوەڕی ئـەهلی سوننە و جەماعە ، بیروباوەڕی سەلەفی ساڵح ، چونکە ئەوە ئەو ئیسلامەیە کە خوای باڵادەست وەك دین بۆ بەندەکانی خۆی ڕەوانەی کردوەو پێی ڕازییـە [1] ، کـە بریتیەلـە بیرو باوەڕی هەرسێ سەدە هەڵبژێردراوەکـەی ( هـەوەڵان و شـوێن کـەوتوان و شـوێن کەوتوانیان بەچاکە ).

---

[1] وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ {التوبة/٣٣} .

**واتە :** خوای گەورە ئەو خوایەیە کە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بە ڕێنمایی کەر و بەئاینێکی هەق و ڕاست و دروستەوە ڕەوانە کردوە ، تا بەسەر هەموو ئاینەکانی تردا فەرمانڕەوازاڵ و باڵادەست بێ، ئەگەر چی کافرو هەڵگەڕاوەکانیش پێیان ناخۆش بێ و پێی بتەقن .

وە دەفەرموێ : وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا {المائدة/٣} .

**واتە :** تەنها بەوە لێتان ڕازیم کە ئیسلام تاکە ئایین و ڕێبازی ژیانتان بێت . وەرگێر .

وە دەربارەی بیرو باوەڕی ئیسلامی لەلایەن ئەهلی سوننە و جەماعە چەند ناوێکی تر هەیـە کـە ئـاوەڵ واتـای ئـەم زاراوەیـەن ، لەوانـە : ( یـەکتا پەرسـتی ، سـوننە ، بنچینەکانی ئایین ، فیقهی گەورە ، شـەریعەت ، ئیمـان ) . کەبـەو مانایـە دێـن . ئەوانە بەناوبانگترین ناوو زاراوەن کە لەلایەن ئەهلی سـوننە لـەبارەی زانسـتی بـیرو باوەڕەوە بەکار دەبرێن .

## پێناسەی پێشینە ( التعریف السلف )

### پێشینە لەزماندا :

**واتە :** ئەوەی کە ڕابراو پێشکەوتو تێپەڕی ، دەگووترێ : ئەوشتە پێش کەوت واتە: ڕابرا و تێپەڕی ، مەبەست لە پێشینە ( سلف ) واتا کۆمــەڵی پێشـکەوتووەکان یـا گەڵی پێشکەتوەکان لە ڕەوت و ڕێبازو ڕۆویشتن دا ، وەك خوای گەورە دەفەرمووێ :

**فَلَمَّا آسَفُونَا انتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَاهُمْ أَجْمَعِينَ { ٥٥} فَجَعَلْنَاهُمْ سَلَفًا وَمَثَلًا لِلْآخِرِينَ {الزخرف/٥٦}** .

**واتە:** کاتێ کە ئێمە یان هەراسان و قەلس کـرد، تۆڵـەمان لێ سـەندنەوە و، هــەر هەموومان بە تێکڕای نغرۆ و نقـوم کـردن ، کردمانـە پەنـدو ئامۆژگـاری و نمونـەو پێشینە بۆ ئەوانەی لە دوای ئەوانەوە دێن .

سەلەف : ئەوانەن کە وەپێش تۆ کەوتون لە ژیانو نەژادو وەچەی تۆ ، کەلە چـاکە و تەمەن لەسەرووی ئێوەن ، لەبەر ئەوە ناو براوە بەسەردەمی پێشینەویەکەم.

## پێشینە لەزاراوەدا :

هەرکاتێ نـاوی سـەلەف لەلایـەن زانایـانی بـیر و بـاوەڕ هـات ، پێناسـەکەی مەبەستی پێ سەحابە یا سەحابە و تابعین یا سەحابە و تـابعین و تابیعینـەکان) ە لەو پێشەوایانەی کـە شـاهێدی چـاکە و پێشـەوایەتی و شـوێن کـەوتنی سـوننە و دورکەوتنەوە لە بیدەعەیان بۆ دراوە ، خوای گەورەش سەبارەت بە وان فەرموویەتی :

وَمَن يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَى وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّى وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ وَسَاءتْ مَصِيرًا {النساء/١١٥} .

**واتە** : هەر کەسێ نەیارێتی پێغەمبەر (ﷺ) بکا ، دوای ئەوەی کە ڕێگای راسـت و دروستی بۆ رون بۆتەوەو ، بەدوای ڕێبازێك دەکەوێ کەجیایە لەهی ئیمانـداران ، لـە دونیادا رووی دەکەینە ئەو رووگەیەی کە رووی تـێ کـردوەو بـەرەو ئـەوێ ناراسـتەو رێنمای دەکەین ، وەلە دوا رۆژیشدا دەیخەینە نێـو دۆزەخـەوە کـە چارەنووسـێکی زۆر سەخت و دژوارو سامناکە .

وەدەفەرموێ :

وَالسَّابِقُونَ الأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ رَّضِيَ اللّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ {التوبة/١٠٠} .

**واتە** : ئەوکاروانە پێشەنگانەی کە سەرەتا لە کۆچکەران و پشتیوانان و ئەوانەی کە بەراست و دروستی شوێنیان کەوتوون ، خوای گەورە لەهەموویان رازی یەو، ئەوانیش

لەخوای خۆیان رازین ، وە بەهەشتێکی بۆ ئامادەکردوون کە جۆگەو روبار بەژێر دارو درەختەکانی دا دەڕوات، کە بەهەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە .

وەپێغەمبەری خوای گەورە ش (ﷺ) دەفەموێ :

**( خیر الناس قرني ثم الذین یلونهم ثم الذین یلونهم ) بخاری و مسلم .**

**واتـە :** باشترین خەڵکی ، خەڵکی سەردەمی منن ، لەپاشان ئەوانـەن کـە بـەدوای ئەوان دێن ، پاشان ئەوانەی دوای ئەوانن .

هەر کەسێ کە بانگهێشە دەکا بۆ ئەوەی کە پێغەمبەری خوای گـەورە(ﷺ)و هاوەڵـە بەڕێزەکان و شوێن کەوتوانیان بانگەوازیان بۆ کردوە ، ئەو کەسە لەسـەر بەرنامـە و ڕێبازی سەلەفە .

ماوەیەکی زەمەنی دیاریکراو مەرج و پێوەر نیە بۆ سەلەفیەت ، بەڵکو، هەر گـەل و وەچەیەك بەپێی تێگەیەشتنی سەلەف کۆك بێ لەگەڵ کتاب و سـوننەت لـە ڕووی بیر و باوەر و کردرو گوفتارو ئاکار و ئەحکام و رەوشت و رەفتار، ئەوە سەلەفی یە، با لـە نێـوان ئـەو و ئەوانیشـدا ، ماوەیـەکی مـەکانی و زەمـانی زۆر هـەبێ ، وە بەپێچەوانەوە هەر کەسێ سەرپێچی سەلەفیش بکا لەوان نی یە، با لەکاتی ئـەوان و لەگەڵ ئەوانیش دا ژیابێ .

پێشەوای پێشینە چاکەکان ، پێغەمبەری خوایە (ﷺ) وەك خوای گەورە سەبارەت بەو فەرموویەتی :

**مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاء عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاء بَيْنَهُمْ تَرَاهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ السُّجُودِ ذَلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَمَثَلُهُمْ فِي الْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ**

**فَاسْتَوَى عَلَى سُوقِهِ يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ الْكُفَّارَ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِنْهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا {الفتح/٢٩}.**

**واتـه :** محمد ( صلى الله عليه وسـلم ) پێغەمبـەری خـوای گەورەیـە ، وە ئەوانـەی لەگەڵ ئەون یا شوێن کەوتەی ئەون ، کردارو سیفەتیان وایە کە لەسەر بـێ بـاوەڕان توند و بێ بەزەیین ، وە لەنێوان خۆیاندا نەرم و نیان و بەزەیین .

خوای شکۆدار بەراورد لەنێوان گوێڕایەڵی خۆی و گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکەی ( صلی الله علیه وسلم )دەکا ، گوێڕایەڵی کردنی پێغەمبەرەکەی بە گوێڕایەڵی کردنی خۆی بەندکردووەو داناوە وەك دەفەرموێ :

**وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُوْلَئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاء وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَئِكَ رَفِيقًا {النساء/٦٩} .**

واتە: هەرکەسێك بە گـوێ ی خـواو پێغەمبـەر (ﷺ) بکـا ، ئـەو کەسـانە لەگـەل ئەوکەسانەن کە خوای گەورە نازو نیعمەتی خۆی بەسەر دارشتون لـە پێغەمبـەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان ، ئەوانە هاوڕێ ی چاکن . وە دەەفەرمووێ :

**مَّنْ يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ وَمَن تَوَلَّى فَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا {النساء/٨٠} .**

**واتـه :** هەرکەسێ فەرمانبەری وگوێدێری پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) بکـا، ئەوا فەرمانبەری خوای گەورەی کردوە ، وەئەوەی کە سەرپێچیو سەرەخەریشی دەکـا، خۆی زەرەر دەکاتو پارێزگاری لێ ناکرێت .

خوای گەورە هەواڵی پێ داوین کە گوێڕایەڵی نەکردنی پێغەمبەر (صـلی الله علیـه وسلم) دەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوە و پوچەڵ کردنەوەی کارو کردەوەکانی مرۆڤ .

هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ :

**يَـا أَيُّهَـا الَّـذِينَ آمَنُـوا أَطِيعُـوا اللَّـهَ وَأَطِيعُـوا الرَّسُـولَ وَلَـا تُبْطِلُـوا أَعْمَـالَكُمْ {محمد/٣٣} .**

**واتـە :** ئەی ئەوکەسانەی کـە بڕواتـان هێنـاوە دەبـەگوێی خـواو پێغەمبەرەکـەی (ﷺ) بکـەن، کـارو کردەوەکانتـان پوچـەڵ مەکەنـەوە بـەهۆی ئـەوەی کـە گوێڕایـەڵی خـواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) نەکەن ، خوای گەورە نەهی کردوە کەسەرپێچی کـارو فرمانـەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بکەین، هەروەك خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی :

**وَمَن يَعْصِ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُ يُدْخِلْهُ نَارًا خَالِدًا فِيهَا وَلَهُ عَذَابٌ مُّهِينٌ {النساء/١٤} .**

**واتـە :** هەرکەسێك لەخواوپێغەمبەرەکەی (ﷺ) یـاخی بـێو سەرپێچـیان بکـات ، وەسنوری یاساو فرمانەکانی خوای گەروە ببەزێنێ ، خوای گەورە دەیخاتە نێـو ئـاوری دۆزەخەوە ، کەبەهەمیشـەیی تیـادا دەمێنێتـەوە ، وەسـزاێکی زۆرسـەختودژواروبە ئێش‌و سەر شۆڕکەری بۆ هەیە .

خوای گەورە فەرمانمان پێ دەکا کە هەرچیەکی کە پێغەمبـەر (ﷺ) فرمانمـان پێـی بکا وەری بگرین ، وەهەر چیەکی لێ مانی یاساغو قەدەغە دەکا لێی دوربکەوینـەوەو وازی لێ بێنین ، هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی :

**وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا وَاتَّقُوا اللَّـهَ إِنَّ اللَّـهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ {الحشر/٧} .**

**واتـە :** هەرچیەکی لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێتـان دەگـا ، وەری بگـرن ، وەئـەوەی کەلێتانی قەدەغەدەکا ، مەیکەن وپێیەوە پابەند بن، لـەخوا بترسـن چـونکە سـزای خوای گەورە زۆر توندو بەئێش‌وئازارو دژوارە .

خوای گەورە فرمانمان پێ دەکا کەپێغەمبـەر (ﷺ) بکەینـە دادوەرو فـەرمانڕەوا لـە هەموو کێشەوئیش و کارەکانی ژیانماندا ، وەهەمیشە بگەڕێینەوە لای حکومو یاساو فەرمانڕەوایی خوای گەورەو ئەو ، هەروەك خوای گەورە سەبارەت بەوە دەفەرموێ :

**فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّىَ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُواْ فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا {النساء/٦٥} .**

**واتـە :** ئەی موحەممەد (ﷺ) سـوێند بەپـەروەردگارت ئەوکەسـانە ئیمانیـان تـەواو نابێو دانامەزرێ ، تا نەتکەنە حاکمو فەرمانڕەواو دادوەر لەهـەموو ئـەو کێشـانەی کە لەنێوانیاندا روودەدات، وەنابێ دوای بڕیاردانی تۆ هیچ گەردو دودڵیو نارەزاییـەك لەدڵ و دەروونیاندا پەیدا بێ ، بەرانبەر ئـەو بڕیـارەی کەبەسـەرتاندا داون ، بـەڵکو دەبێ تەواو تەسلیم و ڕازی بن بەفرمانی تۆ .

خوای مەزن وبێ هاوتا پێمـان ڕادەگەیـەنێ کەپێغەمبەرەکـەی (ﷺ) تاکـە نمونـەی نمونانە ، تا کە سەر مەشق و پێشەنگ‌ومامۆستای چـاکە و پـاکی و ژیانـە ، بۆیـە پێویستە تەنها شوێن پێ ی ئەو بکەوین و هەمیشە پەیڕەوی لە ڕێبـازی پـاکی ئـەو بکەین ، هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی :

**لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا {الأحزاب/٢١}.**

**واتـە :** بێگومـان بۆ ئێوە لەپێغەمبەری خوای گەورەدا (ﷺ) جـوانترین رابەرایـەتیو سەر مەشقی هەیە کەبەدوای بکەونو دەرسو پەنـدی لێـوەربگرن ، بـۆ کەسـێ کـە دەیەوێ بەخواو بەرۆژی بەرێ بگاو خوای گەورە لەخۆی رازی بکاو بچێتە بەهەشت .

خوای بێ هاوتا ڕەزامەندی خۆی بە ڕەزامەندی پێغەمبەرەکەی(ﷺ) بەندو بەراورد کردوە ، وەك خۆی سەبارەت بەوە دەفەرموێ :

وَاللّهُ وَرَسُولُهُ أَحَقُّ أَن يُرْضُوهُ إِن كَانُواْ مُؤْمِنِينَ {التوبة/٦٢} .

**واتە** : خوای گەورە پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) بەنیشانەی خۆشویستنی بەندە بۆخوای گەورە داناوە ، وەك خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ :

قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ {آل عمران/٣١} .

**واتە** : ئەی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) پێ یان بڵێ ئەگەر خوای داناتان خۆش دەوێ ، دە بەدوای من بکەون ، ئەوسا خوای گەورەش ئێوەی خۆش دەوێ و لەتاوانەکانتان خۆش دەبێ ، خوای گەورە زۆر لێبوردە و بەرەحمو بەسۆزە .

بۆیە سەلەفی سالح کاتێ کە کێشەو ناکۆکیان دەبێ ، یەکسەر دەگەڕێنەوە سەر سەرچاوەی قورئان و سوننە ، هەروەك خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێ :

فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً {النساء/٥٩} .

**واتە** : ئەی ئیماندارینە ، هەرکاتێ ئێوە لەشتێکدا کێشەو ناکۆکی و دوبەرەکی تان لێ پەیدا بوو ، بۆ چارەسەرکردنی کێشەکەتان ، کێشەکەتان بگێڕنەوە لای خوا و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ، لای قورئانو سوننە ( لای شەریعەتی ئیسلام ) ئەگەر ئێوە بڕواداران و بڕواتان بەخوای گەورەوو بەرۆژی دوایی هەیە ، ئەوە بۆ ئێوە باشترین یاساو شەرعو حوکمو لێکدانەوەودادوەرییە .

باشترین پێشینە لە دوای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) سەحابەکانن کە راستی و پاکی دینەکەیان لە پێغەمبەرەوە وەرگرتووەو پاراستووە، هەروەك خوای گەورە سەبارەت بەوان دەفەرمووێ :

وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُّبِينًا {الأحزاب/٣٦} .

**واتە** : هیچ پیاو و ئافرەتێکی ئیماندار بۆیان نیە ئەگەر خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بڕیارێکیان دا ، قسە لە بریارو فرمانی ئەواندا بکەن و ، سەبارەت بە بریارو فرمانی ئەوان سەرپشكو یاخیو سەرپێچ بن ، هەرکەسێك بە گوێ ی خواو پێغەمبەر (ﷺ) نەکاو ، سەرپێچیان لێ بکا، لە گومراییەکی ئاشکرا دایە . وە دەفەرمووێ :

مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُم مَّن قَضَى نَحْبَهُ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلًا {الأحزاب/٢٣} .

**واتە** : لەنێو بڕوادارن هەندێ پیاو ( کەس ) هەن کەهەمیشە لەسەر ئەو بەڵێن و پەیمانەن کە بەخوای گەورەیان داوە و، لەگەل پەیمانو بەلێنەکەیان راستیان کردوە ، جاهی وایان هەیە لە پێناو خوای گەورە شەهید بووە وبەخوای گەورە گەیشتووە ، ئی واشیان هەیە چاوەنوارەو ، هیچ گۆرانکاریان بەسەردا نەهاتوە .

سەلەفی سالّح ئەو دووسەدانەن کە بەدوای ئەوانەوە هاتوون ، هەروەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ :

( خير القرون قرني ، ثم الذين يلونهم ثم الذين يلونهم ) بخاری مسلم .

واتـە : باشترین سەدەو سەردەم سەردەمی منە لەڕووی چـاكەو دینداریـیـەوە، پاشـان ئەوسەردەمەیە كەبەدوای سەردەمی منەوە دادێ ، پاشان ئەوسـەردەمەیە كەبـەدوای ئەوەوە دادێ . وەبەم سیغەیەش هاتووە كە دەفەرمووێ :

( خير الناس قرني ، ثم الذين يلونهم ثم الذين يلونهم ) بخاری مسلم .

واتـە : باشترین خەلكی سەردەمی منە لەڕووی چاكەو دینداریـیـەوە، پاشـان ئەوخەلكانەن كەبەدوای سەردەمی منەوە دادێن ، پاشان ئـەو خەلكانـەن كەبـەدوای ئەوانەوە دادێن . وە پێغەمبەر (ﷺ) سەبارەت بە سەحابەكانی دەفەرمووێ :

( أوصيكم بأصحابي ، ثم الذين يلونهم ثم الذين يلونهم ) صحيح سنن الترمذي للالباني .

بۆیە : سەحابە و تابیعەكان لەهەموو كەس هـەقترن كەخـەڵكی بـەدوایان بكـەوێ، چونكە ئیمانیان لەخەڵكی تر زیاتر راستر و پتەوترە و، لەخوا پەرستی دا دڵسۆزترن. ئەوانە : تاكە پاسەوانی بیرو بـاوەڕی ئیسـلامی و پـارێزەری پاسـاكەی بونـە و ، بـە كردەوە و بەگوتەكاریان پێی كردوە ، لەبەر ئەوە خوای زانا پێغەمبەرانی هەڵبـژاردون بۆ بڵاوكردنەوەی ئایینی خۆ و، بۆ گەیاندنی سوننەتی پێغەمبەری خۆی ( صـلی الله علیـە وسـلم ) هـەروەك پێغەمبـەر (صـلی الله علیـە وسـلم) لەفەرمودەیـەكی دا دەفەرموێ :

( تفرق امتي على ثلاثٍ و سبعين ملةً كلهم في النار ، إلا ملة واحدة ).

واتە : ئۆممەتی من دەبێتە (٧٣) پارچە و كۆمەڵ ، لەوانە هـەموویان لـەناو ئـاگرن (دۆزەخـیین ) ، تـەنها یـەك كۆمـەڵ و میللـەت نـەبێ ، هاوەڵـەكان گوتیـان ئـەی پێغەمبەری خوای گەورە(ﷺ) ئەو كۆمەڵە كامەیە ؟ كەلەناوئاگرنی یە ، فەرمووی:

**( ما أنا عليه و أصحابي )**[2].

**واتە : ئەو سوننەتو ڕێبازەیە کەمن و هاوەڵەکانم لەسەرینە بۆیە دەستی پێوەبگرن.**

**سەلەفی لەرووی ڕەوتو ڕێبازو شەریعەتی ئیسلامەوە بەهەموو کەسێك دەگـوترێ ، کە پەیڕەوی لە سەلەفی سالح بکاو لەسەر ڕێباز و بەرنامەکـەیان بـڕوا لـە هـەموو سەردەمەکاندا ، بەوە لەو کەسانە جوێ دەبێتەوە کەسەرپێ چی و لادان لەبەرنامـەی سەلەفی سالح دەکەن و ، شوێن ڕەوت و ڕێبازی تر دەکەون .**

**وەرگێر : سـەلەفی لـەرووی زمـان و زەمەنـەوە بـەو سـێ سـەردەمە دەگـوترێ کـە پێغەمبەری خوای گەورە (صلى الله عليه وسلم ) گەواهی بۆ داون و دەفەرموێ :**

**خير القرون قرني ثم الذين يلونهم ، ثم الذين يلونهم .**

**واتە : باشترینی خەلکی سەردەمەکان خـەلکی سـەردەمی مـنن ، ئەوسـا خـەلکی سەردەمی دوای ئێمەن ، ئەوسا خەلکی سەردەمی دوای ئەوانن .**

**کەواتە ، سەلەف واتە : ئەوەی پێشترکەڕابرا . وەلێ لەرووی ئیسـلامەوە سـەلەفیەت لەدوای ئەوان لەسەر هیچ چاخو کەسێ تاپۆو مالو گوشراو نیە ، بەلکو هەرکـەسو کۆمەلێك پەیڕەوی لە سێ جیلەئیسلامییەکەی سەرتای ئیسـلام بکـا ، سـەلەفییە . لەوەش گەورەتر ئیسلامی و موسلمانە ، چونکە خوای گـەورە نـاوی موسـلمانی لـە ئەهلی ئیسلام ناوە نەك شتێکی تر ، وەك خۆی دەفەرموێ :**

**هُـوَ سَـمَّاكُمُ الْمُسْلِمِينَ مِـن قَبْـلُ وَفِـي هَـذَا لِيَكُـونَ الرَّسُـولُ شَـهِيدًا عَلَـيْكُمْ {الحج/٧٨}.**

[2] صحيح سنن الترمذي و الباني .

واتـە : خوای گەورە ناوی موسلمانی لە میلەتو شوێنکەوتوانی پێغەمبەر(محمـد) و لە شوێنکەوتوانی پێغەمبەرەکانی تریش ناوە سەلامی خوای گەورەیان لەسەر بێت .

کەواتە : ناوی موسلمان لە ناوی سـەلەفی و ... هتـد شـەرعی تـر و قورئـانی تـرو گەورەترە کەلە خۆمانی بنێین وشانازی پێوە بکەین . بەو پێیە نەبێ سـەلەفیەکانیش کەبانگەشەی سەلەفیەت دەکەن دەبنە حزبوکۆمـەل ، ئەگەرچـی خۆیـان بەحسـاب بڕوایان بە حزبایەتی ئیسلامی نیەو حزبایەتی ڕەت دەکەنەوە ، وەلێ حزبن ، چـونکە حزب بریتتی یە لە : گردبوونەوەی چەند کەسێك لەسەر بەرنامە و ڕێبازو شتێك کە کۆمەلێ ئامـانج و مەبەستیان هەیە و ، خەبات لە پێناو تاقیق کردن و بە دیهێنانی دا دەکەن ، کەواتە ئەوانیش حزبن ، لەوەش گەورەترو موسیبەتتر ئـەو کەسـانەن کـە بڕوایان بە لایەنە ئیسلامیەکان نیە و دژیایەتیان دەکەن ، تا ئەو ڕاددەیـەی هەنـدێ جار هەندێ کەس بە گومڕاشیان دەزانن، کەچی لایەنی عەلمانی و ناسیۆنالیسـتەکان بە فەرمانڕەوای هەق و بـە وەلی ئـەمری موسـلمانان دەزانـن ، ئـەوەش پێچـەوانەی ئیسلامەو لە ئیسلام حالی نەبوونە ، چونکە تێگەیشتن لە ئیسلام دەبـێ بـە پـێ ی قورئان و سوننە بێ و لە کرداریشدا لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر بن (ﷺ)، نـەك بـەس بە قسەو ڕەنگو روخساروسەروسیماوجلوبەرگ و ... هتد ، هەروەك چەندان ئایەت و حەدیس لەسەر مەسەلەی حـزبو تـەنزیمو بـەڕێوەبردنن ، چـۆن دەبـێ نکـولی لـەم مەسەلەیە بکرێ کە پێغەمبەر (ﷺ) بەکردار کۆمەل بووە و پەیڕەوی لەوە کردووە .

وە خوای گەورەو کارلەجێ سەباری بە مەسەلەی ڕەوتو ڕێگا دەفەرموێ :

**وَمَن يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَى وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّى وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ وَسَاءَتْ مَصِيرًا {النساء/١١٥} .**

واتە : هەر کەسێ نەیارێتی پێغەمبەر (ﷺ) بکا ، دوای ئەوەی کە ڕێگـای راسـت و دروستی بۆ رون بۆتەوەو ، بەدوای ڕێبازێك دەکەوێ کەجیایە لەهی ئیمانـداران ، لـە دونیادا رووی دەکەینە ئەو رووگەیەی کە رووی تـێ کـردوەو بـەرەو ئـەوێ ئاراسـتەو ڕێنمای دەکەین ، وەلە دوا ڕۆژیشدا دەیخەینە نێـو دۆزەخـەوە کـە چارەنووسـێکی زۆر سەخت و دژوارو سامناکە .

هەموو موسڵمانێك کەهەوڵ و کۆشش دەکا ، شانازی بەوەچەو نەژادو ڕەگەزی خۆیەوە دەکات کەپاڵ دەدرێتە لای ئەو .

وە گۆیە ( لفظ) ی سەلەفیەت لەڕێبازی سەلەفی سـالحدا بۆتـە زانسـتێك لـەبارەی تێگەیشتن لە ئیسلام و، وەرگـرتن و دانـەوە و جـێ بـەجێ کردنـی ، وە لەبـەر ئـەوە چەمکی سەلەفیەت بـەو موسـڵمانانە دەگـوترێ کـە تـەواو پەیوەسـتن بـەقورئان و سوونەت بەپێی تێگەیشتنی سەلەف لـەم دوو سەرچـاوەیە بـە پێـزە کـە قورئـان و سوننەن .

# پێناسەی خەڵکی سووننە و جەماعە

سوننە لە رووی زمانەوە : سوونە لە زماندا لـە ( سـنّ ) ە وەرگـیراوە، واتـا داینـا ، داڕشت، سنّ = دانان ، دارشتن .

سوننە ، واتە: ( رەوت ، رێگا ، ڕێباز) ج چاك بێ یا خراپ .

هەروەك پێغەمبەری خوای گەورە (ﷺ) سەبارەت بەوە دەفەرموێ :

**( لتتبعن سنن من كان قبلكم شبراً و ذراعاً بذراع ) رواه مسلم .**

واتـە : ئێوە بست بەبست و گەز بەگەز بەدوای (یاسا و رەوت و ڕێباز ) تێك دەکـەون کە لەپێش ئێوە دا بوە و هاتووە .

وەدەفەرموێ : **( من سنّ في الإسلام ، سنة حسنة ، فله أجرها وأجر من عمل بها بعده ، من غير أن ينقص من أجورهم شئ ، ومن سن في الاسلام سنة سيئة ، كان عليه وزرها و وزر من عمل بها من بعد ، من غير أن ينقص من أوزارهم شئ ) مسلم .**

واتـە : هەر کەسێ لەئیسلامدا ڕێگە و ڕێبازێکی چاك دابنێ ، خێری خۆی و خێـری ئەوکەسەشی پێدەگا کە لەدوای ئەوکاری پێ بکا ، بـێ ئـەوەی لـە خێـرو پاداشـتی ئەوان کەم بکاتەوە ، وە بە پێچەوانەوەش هەر کەسێ لەئیسلامدا ڕێگە و ڕێبـازێکی خراپ دابنێ ، گوناهو تاوانی خۆی و گوناهو تاوانی ئەوکەسەشی پێدەگا کە لەدوای ئەوکاری پێ دەکا ، بێ ئەوەی هیچ شتێك لە گوناهو تاوانی ئەوان کەم بکاتەوە.

سوننە لە رووی زاراوەوە : بریتییە لەو دیاری و ڕێبـازەی کـە پێغەمبـەر (ﷺ) و هاوەڵەکانی لەسەرینە لـەرووی (زانســت وزانیـاریو بـیر و بـاوەڕو کـردە و گوتـە و دانپیانان) ، هەروەها سـوننە بەسـوننەتەکانی عیبـادەت و ئیعتیقـادات دەگـوترێ ، لەبەرانبەر ئەوە بە سوننەی خراپ و داهێنراو و بیدعەکاریش دەگوترێ .

پێغەمبەری خوای گەورەیش (ﷺ) سەبارەت بە سوننەتو ڕێبازی خۆی دەفەرموێ :

**فإنه من يعيش منكم بعدي فسيرى إختلافاً كثيراً فعليكم بسنتي و سنة الخلفاْء المهديين الراشدين ١ . صحيح سنن ابى داود / البانى .**

واتە : بێ گومان : ئی واتان هەیە کە لەدوای من دەژی و جێ دەمێنێ ، زۆر ناکۆکی و دوبەرکی دەبینێ ، ئاگادار بن ئەوسا لەسـەرتانە کەپـەیڕەوی لەیاسـا و بەرنامـەو ڕێبازی من و ڕێبازی خەلیفە سەر راست و ڕێنمایی کراوەکان بکـەن[٣]، نـەك بـەدوای ڕێچکەو ڕێبازی خراپ و گومڕا بکەوەن .

## کۆمەڵ ( جماعه ) لەزماندا :

کۆمەڵ لەکۆ وەرگیراوە ، واتا : کۆکردنەوە وگردکرنەوەو گرتنە خـۆی شـتێك کـەلێك نزیـك ببنـەوە ، هـەروەك دەگـوترێ : کـۆمکردەوە ئەوسـا کۆبویـەوە . کۆمـەڵ لـە کۆبوونەوە لێك جوێ بوتەوەو وەرگیراوە ، کەدژی پارچە پارچەیی (تفرقه و تفرق) ە .

جەماعە : ژمارەیەکی زۆرن لەخـەڵکان، دەبنـە کۆمـەڵێك کـە یـەك بـیرو بـاوەڕو مەبەستو ئامانج کۆی کردونەتەوە .

جەماعە: گەلێکن کەلەسەر یەك کارو فرمان و هەلوێست کۆبوونەتەوەوکاردەکەن .

---

[٣] پێغەمبەری خوای گـەورە(ﷺ) دەفـەرموێ : ( **عليكم بسنتي و سنة الخلفاء الراشدين المهديين ، تمسكوا بها ، وعضوا عليها بالنواجذ ) سنن ابى داود .**

واتە : لەسەرتانە دەست بە ڕێبازی من و ڕێبازی خەلیفە سەر راستەکانمەوە بگرن و ، زۆربە توند و بەندی خرێنە وددانەکانی لێ گیر بکەن ، چونکە ئەو خەلیفانە لەسەر ڕێبازی منن . وەرگێر.

**کۆمەڵ ( جماعە ) لەزاراوە دا :**

کۆمەڵی موسڵمانان ، پێشینەی ئەو ئۆمەتەن لەهاوەڵانی پێغەمبەر و پەیڕەوان و شوێن کەوتوانیان بەچاکە تا رۆژی دوایی کەلەسەر کتابی خوای گەورەو سوونەتی پێغەمبەر(ﷺ) کۆبوینەوە ، لەرووی ئاشکرا و نادیار ( ظاهر و باطن ) لەسەر ئەو رەوت و رێبازەن کە پێشەوای مرۆڤایەتی لەسەری رۆویشتوەوکاری پێکردوە .

خوای گەورە فرمانی بەبەندە بڕوادارەکانی خۆی کردوە و هانی داون لەسەر کۆمەڵبوون و کۆبون و یەکگرتن و هاوکاری ، فرمان دەکا کە هەرگیز دوبەرەك و ناکۆك و پارچە پارچە مەبن . وەك دەفەرموێ :

**وَاعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ اللّهِ جَمِيعًا وَلاَ تَفَرَّقُواْ {آل عمران/١٠٣} .**

واتە : دەهەمووتان پێکەوە بە تێکرا دەست بە بەرنامەی خوای گەورە بگرن کە بریتی یەلە قورئانی پیرۆزوسوننەتی بەپێزی پێغەمبەر (ﷺ)، هەرگیزلە سەری ناکۆك و پارچە پارچە مەبن .

وەدەفەرموێ : **وَلاَ تَكُونُواْ كَالَّذِينَ تَفَرَّقُواْ وَاخْتَلَفُواْ مِن بَعْدِ مَا جَاءهُمُ الْبَيِّنَاتُ وَأُوْلَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ {آل عمران/١٠٥} .**

واتە : قەت وەکو ئەو کەسانە مەبن کە بوونە پارچە پارچە و ناکۆك بوون ، دوای ئەوەش کە بەیانیان بۆ هات و رێی ڕاست و هەڵەیان بۆ ڕوون بۆوە ، ئەوانە لەرۆژی دوایی سزایەکی بە زۆر بەئێش‌وئازارو ژانیان بۆ هەیە .

پێغەمبەری پێشەوایش (ﷺ) دەفەرموێ :

**إن هذه الملة ستفرق على ثلاثٍ و سبعين ، ثنتان و سبعون في النار، واحدة في الجنة ، وهي : الجماعة . صحيح سنن أبى داود / الباني .**

واتە: بێگومـان ئەو گەلە لەمەو دوا دەبێتە حـەفتاو سـێ کۆمـەڵ، لەوانـە هـەفتاو دوویان دەچنەناو دۆزەخ، تەنها یەکێکیان بەهەشتی یە، ئەویش کۆمەڵو جەماعەیە.

وە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ :

**عليكم بالجماعة ، وإياكم والفرقة ، فإن الشيطان مع الواحد ، وهو مع الاثنين أبعد ، ومن أراد بحبوحة الجنة ، فليلزم الجماعة . امام احمد / ج /٥ ، ص ٣٧٠ ، رقم / ٢٣١٩٤ .**

واتـە : هەمیشە کۆمەڵ و یەك بـن ، خۆتـان لـە پارچەپارچـەیی و دوبـەرەکی و نـاکۆکی بپارێزن، چونکە شەیتان لە گەڵ تاك ویەکە ، لە کۆ و دوان دورترە ، هەرکەسـێك دەیـەوی ڕەزامەندی خوار بەهەشتی نەبراوە بە دەست بێنێ ، با دەست بە کۆمەڵەوە بگرێ.

سەبارەت بە جەماعەش هاوەڵێکی شکۆدار ( عبدالله کوڕی مسعود ) ڕەزای خوای لێ بێ دەفەرموێ : ( **الجماعة ما وافق الحق ، إن كنت وحدك**[4] ) .

واتە : کۆمەڵ (جەماعە) ئەوەیە کەلەگەڵ هەقدا (لەگەڵ قورئانو سـوننەدا) کـۆك و هاوتـاو پەیوەسـت بـێ ، بائینسـان بەتـەنیاش بێـت .واتـە: هـەقی و ناهـەقی بەکەموزۆری نیە.

ئەهلی سوننەو جەماعە : ئەوانەن کەپابەنـد و پەیوەسـتن بەسـوننەتی پێغەمبـەری پێشەوا و یارانی و شوێن کەوتوانیان تارۆژی دوایی ، ئەوانەن کەلە ڕووی بیروبـاوەڕ و کردە و گوفتەوە ڕێبازی ئەوان دەگرنە بـەر ، لـە پـەیرەو کـردن و شـوێن کـەوتنیادا خۆڕاگر و بەردەوامن ، لەشتی نارێك و داهێنـراودا خـۆدوورگرن ، ئەوانـە هەمیشـە لەسەرئەو ڕێبازەن و سەرکەوتوون تارۆژی دوایی ، بۆیە شوێن کەوتن یان سەر ڕاستی و هەقو هیدایەتە و دژایەتی کردنیش یان گومڕایی و سەرگەردانی یە .

[4] لە ( **شرح اصول إعتقاد أهل السنة** ) اللالكائي .

# ئەهلی سوننە و جەماعە

بەو ڕەوشت و تایبەتمەندیانە لە کۆمەڵەکانی تر جۆێ دەبنەوە :

١- ئەهلی سوننە و جەماعە خەڵکێکی میانە ڕۆو مام ناوەندن ، لـە نێـوان زێـدە رۆیـی و کـەمرۆیین ، لـەرووی (ئایـدۆلۆژیا و ئاکـار وئـەحکام) ەوە ، لـە نێوەنـدی کۆمەڵەکانی ئەو گەلەن ، هەروەك ئەو گەلە لەنێوەندی گەلانی گێتی یە.

٢- سەرچاوەی لێ وەرگرتنیان تەنها قورئان و سوننەیە و ، گرنگی بەودوانە دەدەن و خۆیان بەدەست دەقەکانی ئەم دوانە دەدەن بـەپێی تێگەیشـتن و خواسـتی بەرنامـەی سەلەفی سالح .

٣- پێشەوایەکی گەورەی وایان نی یە کەهەموو شـتێکی لێ وەربگـرن یـا لـەخۆی قەدەغەبکەن بەقسەی ئەو، تەنها پێغەمبەری پێشەوا نەبێ ، ئەوانە لە هەموو کەس زانا و ئاگادارترن لە ( حال و بال و کردار و گوفتارو فەرمووده ) کـانی ئـەو ، بۆیـە لەهەموو کەس زیاتر سوننەیان خۆش دەوێ و بـەدوای دەکـەون وکـاری پێدەکـەن‌و ، سورن لەسەر پەیڕەوی لێ کردنی و لەهەموو خەڵکێکی تر زیاتر خۆشیان دەوێت .

٤- لەرووی ئایینەوە ، دایمـە واز دێـنن لـە نـاکۆکی و دوبـەرکی و لـەدیالکتێك (جدل) کردنی بێ هودە، لەسەر مـەسەلەکانی ( حەلال و حـەرام ) و دوردەکەنـەوە و گومان پەیدا ناکەن ، بەڵکو هەموو بیروباوەڕی دین وەرگرن و پەیڕەوی لێ دەکەن .

٥- زیاتر ڕێباز و بیرو باوەڕی سەلەفی سالّح بەگەورە دەزانن ، چونكە لەهـەمووانی زیاتر بە ( ساغ و پاك و توندو ڕێك ..) تر دەزانن .

٦- تاویل ڕەت دەكەنەوە ، تەنها خۆبەدەست دەق و شـەرعەوە دەدەن ، نـەقلّ وەپـێش عەقلّ (بیر و بۆچوونە هزریـەكان) دەخـەن ، مـل بـۆ دەقـەكانی قورئـان و سـوننە شۆڕدەكەن.

٧- لەمەسەلەیەكدا بەڵگە شەرعیەكان كۆدەكەنەوە ، دەقی هاوشـێوە (متشـابه) دەگێڕنەوە لای كار پێ كراو ( محكم ) .

٨- ئەوانە پێشەنگ و پێشڕەوی پیاو چاكانن ، ڕێنمایی كراون بۆ سەر ڕێی راست و دروست ، بەهۆی خۆگریان لەسـەر هـەق و كـۆك یـان لەسـەر بـیرو بـاوەڕی پتـەوی ئیسـلامی ، هاوتاییوسـازان ( توافـق ) و كۆكـاری دەكـەن لـەنێوان زانسـت و خواپەرستی ، لەنێوان پشت بەخوا بەستن و كاركردن بەهۆ كارەكانی ژیان ، لـەنێوان خۆش ویستن و بێزاندن و ڕق لێ بوونەوە ، لەنێوان سۆز و زەیو نەرم و نیانی لەگـەڵ بڕواداران و توندو تیژی و توڕەیی لەسەر بێ باوەڕان ، ناكۆكیو دوبـەرەكیان نـی یـە لەگەڵ جیاوازی ( إختلاف ) ی جێ و كاتدا .

٩- ئەوانە بە ( ئیسلام و موسڵمان و سوننە و جماعـە و بـڕوادار ...) نـاودەبرێن و بەغەیری ئەم ناوانە ناو لە خۆیان نانێنو ناونابرنێن .

١٠- زۆر سورو مكوڕن لەسەر گەیاندن و بڵاوكردنـەوەی بیربـاوەڕی ڕاسـتەقینەی ئیسلام و ئاینی ڕاست و بەهێزی ئیسلام وفێركردنـی خـەڵكی و راسـتە ڕێ كـردن و

ئامۆژگاری کردنیان بۆ ڕێی راست ودروستی ئیسلام و گرنگی دان بەکاروباری هەقی موسڵمانان .

١١- لەهەموو خەڵکی زیاتر هۆگرن بەدین ، خۆگرن لەسـەر کـردار و گوفتـار و بانگەواز و بیرو باوەڕ و هیواو ئاوات و تالی و ناسۆریەکانی ژیانیان .

١٢- سورن لەسەر کۆمەڵ بوون و کۆکبوون و یـەکبوون و هـۆگری و ، هەمیشـە بانگەوازی بێ وچانی بۆ دەکەن ، خەڵکی لەسـەر ئـەوە هـان دەدەن و ، خـەڵکی دور دەخەنەوە لە دوبەرەکی‌و ناکۆکی و کۆمـەڵکاری ، خـەڵکی لـەوە بێـدار و هۆشـیار دەکەنەوە.

١٣- خوای کار بەجێ پاراستونی لەوەی کەلە خۆڕاو بێ بەڵگەی شەرعی خـەڵکی بێ باوەڕ بکەن ، بەڵکو لـەرووی زاسـت وزانیـاری‌و دادگـەری و شـەرعیەوە فرمـان بەسەر خەڵکی دا دەدەن .

١٤- یـەکتریان خـۆش دەوێ لەسـەر ئیمـان و تـەقوا ، ڕەحـم بەیـەکتری دەکـەن، هاوکاری یـەکتری دەکـەن لەسـەر هـەمان مەبەسـتن ، نـەنگی یـەکتر دادەپۆشـن ، دۆستایەتی و دوژمنایەتی ، پشتگیری و بەرهەڵستی یـەکتری دەکـەن تـەنها لەسـەر ئایین و ڕەزامەندی خوای کردگار .

## بەکورتی : ئەهلی سوننە و جەماعە

چاکترین خەڵکن لەڕووی کردار و گوفتار و ئاکارو ڕەوشت و بیروباوەڕ و تێگەیشــتن و پێگەیشتنو خۆپاك کردنەوەیان و گوێڕایەڵی کردنیان بــۆ خــواو پێغەمبەرەکــەی و ، دور بینن لە دونیاو سینە فراوانن لەبەردەم کێشەو ناکۆکیــەکان و زانــا و ئاگــادارن بەکارو بنچینەکانی تری ژیانو ئایین .

پوختەی قسان دەربارەی واتای ئەهلی سوننەو جەماعە : ئەوەیە کەئەوان کۆمەڵێکن کەپێغەمبە(ﷺ) ی خوای گەورە بەڵێنی پێ داون بەسەر کەوتنیان لە ڕۆژی دوایــدا ، لەبەر ئەوەی بەدوای سوننەتو ڕێبــازی پێغەمبــەری پێشــەوا (ﷺ) کــەوتوون و ، کۆکن لەسەر یەك (ڕێ و ڕێباز و بیرباوەڕ و ئاکــار و ڕەوشــت و....) ی ئیســلامی و ، پەیوەستن بەکۆمەڵی موسڵمانانەوە

بەهۆی ئەوەش پێناسەی ئەهلی ســوننە و جەماعــە لەپێناســەی ( ســەلەف ) جیــا نابێتەوە ، بەڵکو پێشتر پێناسەی (سەلەف) مان کرد کەبریتیە لە : کۆمــەڵێك کــە کار بەقورئان دەکەنو تەواو پەیوەستن بە سوننەی بەپێزی پێغەمبەری خوا ، کەواتــە (ســەلەف) ئەهلی سوننەن ، ئەوانەن کــە پێغەمبــەر (ﷺ) گرنگــی زۆری پێــداون ، ئەهلی سوننەش بریتین لەپێشینە چاکەکان و ئەوانەی کەلەسەر ئەو ڕێبــازە دەڕۆن و دەمرن .

دەستەواژەی پێشینە چاکەکان ( سلف الصالح ) لە زاراوەی زاناکانی ئــەهلی ســوننە لێکۆڵەرەوەکان ئاوەڵ واتای ( ئــەهلی ســوننە و جەماعــە )یــە، هــەروەك ( ئــەهلی

ئەسەر و ئەهلی حەدیس و تائیفەی مەنسور و فرقەی ناجیـە و ئـەهلی ئیتیبـاع...) شیان پێ دەگوترێ .

هەموو ئەوانە لەلایەن زانایانی سەلەف بـەکاردێن ، بـەوەش هـەموو ئـەو کۆمـەڵـە داهێنەرو ئارەزوومەندانەی وەك : ( خەوارج و جوهیمیـە و مورجیئـە و رافـزە ...) و زیاتریش لەئەهلی سوننە و جەماعە جوێ دەبنەوە .

سوننە لێردا بەرانبەر بیدعەیە ، جەماعە بەرانبەر فرقەیە ، ئـەوەی مەبەسـتە لـەو فەرموودانەی کە دەربارەی پەیوەست بون بەکۆمەڵ و دورکەوتنەوە لە پارچە پارچەیی بەکارهاتوون تەنها ئەوەیە .

# تایبەتمەندیەکانی بیرو باوەڕی ئەهلی سوننە و جەماعە
# بۆچی بیرو باوەڕی پێشینە چاکەکان
# باشترە بۆ بەدواکەوتن و پەیڕەوی لێ کردن

بیروباوەڕی ڕاست و دروست بنچینەی ئەو ئایینە پیرۆزەیە ، هـەروەها شـتێکیش کەلەسەر غەیری ئەو بنچینەیە بنیاد بنرێ ، سەرەنجامەکەی هـەر هـەرەس هـاتن و خرنۆش بوونە ، بۆیە دەبینین کەپێغەمبـەر (ﷺ) بەدرێـژایی ژیـانی چـەند گرنگـی بەرەگ و ڕیشەو داکوتانی ئەو بیروباوەرە پاك‌وبێگەردە داوە لە دڵو دەروونی یـاوەرانی دا ، ئەوەش لەپێناو دروست کردنی کەلەپیاوانە کـە لەسـەر بنچـینە و ڕێسـایەکی تۆکمە و تەواوو پتە وو بەهێز دروست دەبنو دادەمەزرێن .

قورئانی پیرۆز بۆماوەی سیانزە ساڵی رەبەق کەلەشـاری مەککـە دابەزیـە خـوارەوە ، بەردەوام قسەی لەسەر یەك کێشە دەکرد و نـەدەگۆڕا ، کـەبریتی بـوو لەمەسـەلەی دامەزراندنی بیرو باوەڕ و یەکتا پەرستی خوای کردگاری بێ هاوتا ، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەمککە زۆر گرنگی داوە بە خەڵکی تەنها بۆئەوەش بانگهێشتی دەکردن، هاوەڵانی لەسەر ئەوە پەروەردە و سازو تەییار دەکردن .

وەگرنگی دیراسەکردنی بیروباوەڕی پێشینە چاکەکان دەگەڕێتەوە بـۆ چـۆنیەتی بینـا کردنی بیروباوەرێکی ساف و بێ گەرد و پێویستی کـار کردنێکـی تـەواو لـە پێنـاو گەڕانەوەی خەڵکی بۆ ئەو بیر و باوەڕە نازدارو چاك‌وپاکە ، قوتارکردنیان لە تـاریکی و گومڕایی و دوو دڵی و دووبەرەکی و ناکۆکی کۆمـەڵبوون و کۆمەڵکاری ، کە ئـەوە یەکەم شتە دەبێتە ئەرکی سەرشانی بانگبەری ئیسلام کە بانگەوازی بۆ بکەن و پێی هەستن و چاکی بکەن .

# بیرو باوەڕ
# بە پێی بەرنامە و پەیڕەوی پێشینە چاکەکان

هەندێ لەو تایبەتمەندیە تاقانەی کە بەهاو گرنگی پەیوەسـت بـونی ئـەو بیروبـاوەڕە روون دەکەنەوە ئەمانەن :

**یەکەمیان** :ـ ئەو بیروباوەڕە تاکە ڕێگایە بۆئەوەی ئادەمیزاد لە بیر تەسکی حیزبایەتی کردن و پارچە پارچەیی رزگار بکا ، وە بەگشتی ڕیزی موسـوڵمانەکان پتـەوو یـەك بخا ، بەتایبەت ڕیزی زانا و بانگبەران ، لەسەر هـەق و دادگـەری کۆیـان بکاتـەوە ، بەپێچەوانەی ئەوە ، ئەو چارەنووسە بەدو شومەی ئەمڕۆ موسـڵمانان پێـی دوچـاری هەرەس هاوردن و کێشەو نـاکۆکی بـێ ئەنـدازەی نـاوە خـۆیی و چـەند کردارێکـی ناشایستەو بەد بوینە ، کەبەهۆی ئەوە قەوارە و شەوکەتی ئیسلامی لەدەست دراوە ، پاچەپارچەیی موسلمانانو هەلنـەگرتنی بـیرو بـاوەرێکی پـاكو بێگـەردو راسـت و دروستی ئیسلامی یە

گرنگترین هۆکاری دووربەرکی نێوان موسڵمانان لە رووی فرە بەرنامە و تێگەیشـتن و سەرچاوەی وەرگرتنە ، بۆیە یەککردنی ئەو لایەنانەی کـە باسـکران تاکـە فاکتـەرو هۆکـارە بۆیـەکبوونی ئوممـەتی ئیسـلامی ، هـەروەك ئـەوە لەسـەردەمی یەکـەمی ئیسلامی بەدی هات ، بۆیە بەو شێوەیە ئیسلام بونیاد نراو سەروبەری گرت .

**دووەمیان** : ئەو بیرو باوەرە پاكوبێ گەردە مرۆڤی موسـڵمان راسـتە و خـۆ بـەخوای گـەورە و پێغەمبەرەکـەی (ﷺ) بەخۆشەویسـتی هـەردووکیان پابەنـدوگرێ دەدا ، بەوشێوەی کە موسڵمان هـەرگیز خـۆی وە پـێش خـواو پێغەمبەرەکـەی (ﷺ) نـەخا لەهیچ شتێکدا ، بەڵکو هەمیشە سەر بۆ فەرمانەکانیان شـۆڕ بکـا ، چـونکە بـیرو

باوەڕی پێشینان سەرچاوەی گوتـەو فـەرموودەی خـوای گـەورە و پێغەمبەرەکەیـەتی (ﷺ) ، هەمیشە دوورە لەهەواوئارەزوو گومان و گەمە پێکردن و دڕدۆنگی و دەست تێ وەردان و ،خـالیو چـۆڵە لـەکار تێکـەرە دەرەکیـەکانی وەك ( ئـەقلو لۆژیـك و ژیربێژی و پیتۆڵ و ......هتد ) ە مرۆیەکان و بەرهەمی بیری بەشەر .

سێیەمیان : ئەو بیروبـاوەڕە پاکەوبێگـەردە زۆر سـوك و ئاسـان و ئاشـکرا و روون و بێگەردە و هیچ پەردە و پۆشاك و نەنگ و نادیاریەکی تیا نیە ، دورە لەلادان و گرێ کوێرە و ئاڵۆزیو بالۆزی ، هـەڵگر.و بـڕوا پـێ بوەکـەی زۆر هۆشـیار وسەرڕاسـتو ئاسودە و دڵشادە ، زۆر هۆگرو ئارام و دڵنیایـە و لـەگومان و دڕدۆنگـی و وێرنـە و ئەندێشە و خـوت خوتـەی خـراپو خێـو (شـەیتان) ی نـەفرەت لێکـراو زۆر دورە ، گلێنەی چاوە ، چونکە بەپێی ڕێبازی پاکی پێغەمبەری خـوا و هاوەڵـە بەڕێزەکانـە ، خوا لەهەمووان رازی بێ تارۆژی بەرێ .

چوارەم : ئەو بیر و باوەرە راستە یەکێکە لەگەورەترین و گرنگترین هۆکارەکانی نزیـك بوونەوە لەخوای گەورە و سەرکەوتن لە دواڕۆژدا بەهۆی رەزامەندی ئەو[٥]

---

هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ : وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا {المائدة/٣}

واتە: من تەنها بەوە لێتان رازی دەبم کە ئیسلام ڕێباز و ئایینی ژیانتان بێت ، نەك شتێکی تر . وەرگێر.

# بنچینە و بنەماکانی
# بیروباوەڕی پێشینەچاکەکان
# ( ئەهلی سوننە و جەماعەت )

# أصول
# عقيدة السلف الصالح
# أهل السنة و الجماعة

# بنچینەکانی

## بیروباوەری ئەهلی سوننە و جەماعە

ئەهلی سوننە و جەماعە : ( ئەوانەی کەلەسەر بەرنامە و ڕێبازی پێشینە چـاکەکان ڕۆیشتون ) لە ڕووی (کردار و گوفتار وئەحکام و ئاکار و بـیرو بـاوەڕ ...) ەوە لەسـەر چەند بنچینەیەکی نەگۆڕ و ڕوون دەڕۆن ، ئەو بنچینانەش لەقورئانی پیرۆز و هـەموو ئەو فەرموودە بەپێزانە وەرگیراون ، چ بەشێوەی ( تواتر[6] یا ئاحاد[7] ) هاتوون و بـەپێی تێگەیشتنی هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیـه وسـلم) شـوێنەکەوتوە چاکەکانیان بەڕاست دانراون ، واتا فەرمموودەی ڕاست و دروست ( صحیح ) ن .

بنچینەکانی ئایین ، پێغەمبەر (ﷺ) ی پێشەوا ڕاست و تـەواو رونـی کردونەتـەوە ، بۆیە ئەهلی سـوننە و جەماعـە لەهـەموو سـەردەمێکدا هەمیشـە پابەنـدن بـەو بنچیانە و ، خۆیان لە وشەو گووتەی خراپ و داهێنراو دور دەگرن ، بەڵکو پەیوەستن بەگووتەی ڕاست و ڕەواو شەرعی ، کەواتە لێرەدا ئەوانە (هەرکەسـێ کەپابەنـد بـێ بەو بەرنامە و ڕێبازە باسکراوە لەهەموو چاخێکدا ئەو کەسە درێژە پێدەرو پـەیڕەوی کاری هەقیقی ڕێبازو بەرنامەی پێشینە چاکەکانە

بنچینە و بنەماکانی ئایین لەلایەن ئەهلی سوننە و جەماعە لەسـەر ئـەو بنچـینانە کورت و پوخت دەکرێنە

---

[6] حەدیسی تەواتر : ئەوەیە کە کەسانێکی بڕوا پێکراوی زۆر ، یەك لەدوای یەك ئەو فەرموودەیان گێڕاوەتەوە ، وەرگێڕ.

[7] فەرموودەی ئاحاد : ئەوەیە کەتەنها یەك کەسی بـڕوا پێکـراو ئـەو فەرموودەیـە بگێڕێتـەوە ، کەمەرجەکانی فەرموودەی موتەواتیری تێدا نایەتە دی . وەرگێڕ.

## بنچینەی یەکەم
## کۆڵەگە و بنەماکانی بیر و باوەڕ ( أركان الإيمان )

بیر و باوەڕی پێشینە چاکەکان ( ئەهلی سوننە و جەماعـە ) لـە ڕووی بنچـینەکانی ئیمانەوە کورت دەبێتەوە لە : بڕوا بوون بەهەر شەش روکنـەکانی ئیمـان و بەراسـت دانانیان ، هەروەك پێغەمبـەر (صـلى الله علیـه وسـلم) ی خـوا لەفەرموودەیـەکی جبریلدا ( سەلامی خوای گەورەی لەسەر بێت ) پێمان رادەگەیەنێ کاتێ کـەناو بـراو دێتە لای پێغەمبەر و پرسیاری لێ دەکا لەبارەی بیر و باوەڕەوە ، هەروەك پێغەمبـەری خوای گەورە (ﷺ) دەفەرموێ :

**( أن تـؤمن بـالله ، وملائكتـه ، وكتبـه ، ورسـله ، واليـوم الآخـر ، وتـؤمن بالقدر خيره و شره) . بخاري و مسلم** [8]

واتـە : بیروباوەڕ ( ئیمان ) ئەوەیـە کەئینسـان بـڕوای تـەواو و نـەگۆڕو دەمـەزراوی بەخوای خاوەن بوونەوەر و، بە فریشتەکانی و بە سەرەجەم پـەرتوك و پەیامبـەرەکانی و، بەرۆژی دوایی و، بەقەزاو قەدەری خـوای کردگـار هـەبێ لـەڕووی شـتی چـاکە و خراپە.

---

[8] وەخوای گەورەش دەفەرموێ: آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللّهِ وَمَلآئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِ وَقَالُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ {البقرة/٢٨٥} .

واتـە : پێغەمبـەر و ئیمانـداران بڕوایـان بـەقورئان و بـەخوا و بەسـەرجەم فریشـتەکانی و پەرتوکەکانی و پەیامبەرانی هەیە و جیاوازی لەنێوان پێغەمبەرەکان‌وپەرتوکەکانی خوا گەورەدا نەکەن . وەرگێر.

بیروباوەڕ لەسەرُ ئەو شەش پایانە بەرپا دەبێ ودادەمەزرێ، جا ئەگەر هەرکاتێ مــرۆڤ پایەکی لەوانە نەبێ ئیمانی دانامەزرێ ، چونکە روکنێك لــە روکنــەکانی ئیمــانی لەدەست داوە ، لەبەر ئەوەی ئیمان تەنها لەسەر ئــەو شــەش روکنانــە دادەمــەزرێ ، هەروەك بینا و ساختومان تەنها لەسەر بناغە و پایەکانی خۆی دادەمەزرێت .

ئەو شەش شتانەش بریتین لە پایەکانی ئیمان ، ئیمانی پیاو تەواو نابێ تەنها بەوانــە نەبێ بەپێی بەڵگەکانی قورئان و سوننەی سەحیحەوە ، وە کەســێ ئینکــاری شــتێك (یەکێك) لەوانە بکا و بڕوای تەواوی پێــی نــەبێ ، بــڕواداری راســتەقینە نــی یــە و ئیمانی دانامەزرێ .

# پایەی یەکەم ( الركن الاول )

# بڕوا بون بەخوا ( الإيمان بالله )

باوەڕ بوون بەخوای باڵادەست بریتییە لە : بەڕاست دانان و دان پیا هێنانێکی تـەواو بە بوونی خوای گـەورە و تێکـرای سـیفەتە بـەرزەکانی و پەرسـتنی ئـەو بەتـەنها ، بەجۆرێ لەو شتانە بەدڵ دڵنیا و بڕواداربی کە شوێنەوارەکەی لە (کردار و گوفتـار و ئاکـارو رەوشـت ...) ەکانتـدا ڕەنـگ بداتـەوە ، تـەواو پەیوەسـت بیـت بەهـەمـوو فەرمانەکانی خوای گەورە و دوربەکەویتەوە لە شتە یاساغ و قەدەغەکراوەکان ، ئـەوە کرۆك و گەوهەرو بنچینەی تەواوی بیرو باوەڕی ئیسلامییە ، هـەموو پایـەکانی بـیرو باوەڕیش تەنها لەسەر ئەوە دادەمەزرێن و پاشکۆی ئەوەن ، کە بڕوا هـەبوون بـەخوای گەورە بڕوا هەبوون بە بوونەکەی و بەندایەتی بۆ کردنی دەگێڕێتـەوە ، هـەروەك ئـەم شتانەش (زگماك و سروشت ، ئەقڵ و ژیـر، یاسـا و بەرنامـەی ئیسـلام ، هەسـت و نەست ) هەموویان بەڵگەن لەسەر بوونی خوای پاك و بێ هاوتا . هەر لەجۆری بـڕوا هەبوون بەخوای دانا ، بڕوا هەبوونە بە یەکتایی خوایێتی و ناوەکـانی و سـیفەتەکانی خوای گەورە بەدان پێهێنانی هەرسێ جۆرەکانی یەکتا پەرستی و بڕوا پێ بوون و کار پێ کردن بە

١- **یەکتا پەرستی لە پەروەردگارێتی دا (التوحيد في الربوبية).**

٢- **یەکتا پەرستی لە خوایەتی دا( التوحيد في الا لوهية).**

٣- **یەکتا پەرستی لە ناوو سیفەتەکاندا( التوحيد في الأسماء و الصفات )**

## یەکەم : یەکتا پەرستی لە پەروەردگارێتی دا

واتە : دەبێ بڕوای تەواوو نەگۆرت بەوە هەبێ کەخوای تاك و تـەنیا ، بەتـەنها خـۆی پەروەردگاری هەموو بوونەوەرە ، هەموو شتێك لە بوونەوەرەدا دروستکراوی خۆیـەتی و خۆی خاوەنیەتی و ، هیچ هاوبەشێکی نی یە و خۆی بێ نیازو مەبەستو پێویستە لەهەموو کەس ، ئەسلەن هەموو کەس پێویستی بە خوای گەورەیە ، خـوای گـەورە دروستکەر و دانەر و بەڕێوەبەری جیهانە ، تەنها خـۆی کردگـاری بەنـدەکان و رۆزی دەرەو، دەبێ بڕوای تەواو نەگۆڕی بەتاك و تەنیا یی خوای خولقێنەر بەدڵ و بەکردە وە هەبێ کە خوای گەورە دەتوانێ هەموو شتێك بکات کە دەیەوێت .[9]

---

[9] وە ( فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ) ، {البروج/١٦} . واتە : هەر شتێك کەبیەوێ دەیکا و دەبێت یا دەفەرموێ : إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئًا أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ {يس/٨٢}

واتـە : فرمانی خوای گەورە ئەوەیە کە دەیـەوێ ، هـەر کاتـێ شـتێکی بـوێ ببـێ ، یەکسـەر بەفرمانو ویستی خوای گەورە دەبێت . وەرگێر.

(١) بەلأم بڕوایان بەجۆرەکانی تری تەوحید نەبووە، بەڵکو بەکردەوە دژایـەتی ئـەحکام وئـایینی ئیسلامیان کردوە، دوای ڕاو ئارەزوی گلاوی خۆیان کەوتون. وەرگێڕ .

(٢) چونکە هەرخوای گەورە پەروەردگارو بەڕێوەبـەرو دەسـەلأتدارە بەسـەرهەموو ژیانودونیـاو بونەوردا، موڵك ومالّی دونیا و دوارۆژ هەمووی هـەرهی خوایـە، وەك خـوای گـەورە لەوچـەند فەرمودەیـەی دائامـاژە بەوراسـتیە دەکـات و دەفـەرموێ : ﴿الْحَمْدُ للّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ {الفاتحة/٢} ﴾

واتە : سوپاسو ستایشی بێ پایان بۆ پەروەردگاری جیهانیان .

یا دەفەرموێ : وَهُوَ الْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِ وَهُوَ الْحَكِيمُ الْخَبِيرُ {الأنعام/١٨} .

واتە : خوای گەورە لەسەر بەندەو دروستکراوەکانی خۆی پەیدارو زاڵو دەسەلاتدارە ، وەکارزان و شارەزایە.

یا دەفەرموێ : وَاللّٰهُ خَيْرُ الرَّازِقِينَ {الجمعة/١١}

واتە : خوای گەورە باشترین ڕزق و ڕۆزی دەرە بە بەندەو دروستکراوەکانی خۆی .

یا دەفەرموێ : اللّٰهُ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَنْ يَشَاء وَيَقْدِرُ {الرعد/٢٦} .

واتـە : خوای گەورە رزق و رۆزی کەسێك فراوان و زۆر دەکـا کـە دەیـەوێ و هـی هەندێکیشـیان تەنگ و کەم ئەگەر بیەوێ

یا دەفەرموێ : يُدَبِّرُ الأَمْرَ يُفَصِّلُ الآيَات {الرعد/٢}

واتە : خوای گەورە کاروبارەکانی ژیان و بوونەوەر بەر یوە دەبات و، شتەکان لێك جیا دەکاتەوە

رە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: انت رب السماوات والارض... متفق علية

واتە : ئەی خوایە تۆ خوای ئاسمانەکان و زەوی یە

یـاخوای گـەورە دەفــەرموێ: اللّـهُ خَـالِقُ كُـلِّ شَـيْءٍ وَهُـو الْوَاحِـدُ الْقَهَّـارُ {الرعـد/١٦}﴾ (الرعد:١٦).

واتـە : خوای گەورە دروستکەرو بەدیهێنەری هەموو شتەکانی ژیانە ، خوایەکی تاك و تەنیاو زاڵ و دەسەلاتدارە بەسەر هەموو شتەکاندا

یا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللّهَ فَالِقُ الْحَبِّ وَالنَّوَى يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَمُخْرِجُ الْمَيِّتِ مِنَ الْحَيِّ ذَلِكُمُ اللّهُ فَأَنَّى تُؤْفَكُونَ {الأنعام/٩٥} ﴾.

واتە : خوای گەورە دروستکەرو بەدیهێنەری دەنك و دانەوێلە و ناوکیەتی ، زیندو لـە مـردوو دەر دێنێ و مردوو لە زیندو دەردێنێت . وەرگێر

(٣) چونکە خوای گەورە هەرلەسەرەتاوە مرۆڤی لەسەر سروشت وپاکی دروسـت کـردوە، بـەلاّم لەژیاندا جـۆری پـەروەردەی ئـەو پیـاوە وای لێـدەکا، کەببێتـە جولەکـەو گـاورو ئاگرپەرسـت (خوانەناس) ، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ : فِطْرَةَ اللّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاس عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ {الروم/٣٠}

وەچەندان بەڵگەی بەهێزی شەرعی لەسەر بڕوا بوون بەپەروەردگارێتی خـوای گـەورە هاتوون ، وەك خوای گەورە فەرمووویەتی :

أَلاَ لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ تَبَارَكَ اللّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ {الأعراف/٥٤} .

واتـە: ئاگاداربن هەموو کارو فەرمان و دروست کردنێك هی خوایە ، چـونکە خـوای پەروەردگاری جیهان بەرزو بالاّ دەستو بەهێزە.

وە دەفەرموێ : هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً {البقرة/٢٩} .

---

واتـە : سروشتو دروستکردنی خوای گەورە ئەوەیە کە خوای گەورە خەلکی لەسەر دروستکردووە ، سروشتو دروستکردنی خوای گەورە گۆرانکـاری بەرسـەر دانایـەت ، ئـا ئـەوە ئـاینی رێـكو بەهێزی خوای گەورەیە ، وەلێ زۆر کەس ئەم راستیە نازانێت .

واتـە: نەخشەو سروشتی خوای بێ هاوتا هەرئەو نەخشەو سروشتە پاکەیە کـە پێغەمبـەر (ﷺ) دەفەرموێ :

( كل مولود يولد على الفطرة فأبواه يهودانه او ينصرانه او يمجسانه)

بخاري ج١، ص٤٦٥، رقم١٣١٩+مسلم/ج٤، ص٢٠٤٨،رقم/٢٦٥٨.

واتـە: هەمور منالّو مەلۆتکەو تازە لەدایك بوێك لەسەر نەخشەو سروشتو پاکی لەدایك دەبێ، بـەلاّم دایـك وباوکەکەیـە دەیکاتـە گـاور یـا جولەکـە یـا ئـاور پەرسـت بـەهۆی چـۆنیەتی پەروەردەکردنی. وەرگێڕ.

خوای گەورە کۆمەڵی ئادەمیزادو پەری تەنها بۆ پەرستنو بەندایەتی خۆی دروست کـردون ، وەك دەفەرموێ : وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ {الذاريات/٥٦} . وەرگێڕ .

واتە : خوای گەورە دەفەرموێ من ئینسانو ئەجینەم تەنها بۆ پەرستشو بەندایەتی کردنی خۆم دروستم کردوون ، نەك بۆ پەرستشو بەندایەتی کردنی کەسو شتێکی تر.

واتە : خواى گەورە ئەو خوايەيە كە هەرچى لە زەوى و ئاسمانەكانە بۆ ئێوەى دروست كردووە .

يا دەفەرموێ : إِنَّ اللَّهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ {الذاريات/٥٨} .

واتە : بێگومـان خواى گەورە خۆى خاوەن رزق و رۆزى و هێـز و تونـا و دەســەلاتێكى زۆر فراوانو بەهێزو بە گوڕو تينە.

وە دەفەرمووێ : قُلْ مَن بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ {المؤمنون/٨٨}

واتـە : بلێ : ئايا دەسەلات و فەرمانڕەوايى هەموو شتێكى ئەرزو ئاسمان بـە دەسـت كێ يە ، بێگومـان بە دەست خواى گەورەيە

ئەو جۆرە يەكتا پەرستيەش بێ بڕواكانى قورەيشو زۆربەى گـەلانى گێتـى و خـاوەن پەرتووكو ئايينەكانيش تييـادا نـاكۆك و دودڵو دڕدۆنـگ نەبوونـە ، بـەڵكو هــەر هەموويان بڕوايان وابووە كە دروستكەرو بەڕێوەبەرى گەردونو جيهـان تـەنها خـواى تاكو تەنيايە(١) ، هەروەك خواى گەورە دەربارەيان دەفەرمووێ :

وَلَـئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَات وَالْـأَرْض لَيَقُولُنَّ اللَّـهُ قُلِ الْحَمْـدُ لِلَّـه بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ {لقمان/٢٥}

واتە: ئەگەر لێيان دەپرسى كێ ئەرزو ئاسمانەكانى دروست كردوە، لەوەلامدا دەڵـێن: خواى گەورە دروستى كردون .(٢) لەبەرئەوەى دڵو دەروونـى بەنـدەكان پـاكو بەنـدو سروشتدارە لەسەردان نان بەڕاستى يەوە(٣). بۆيە هـەڵگرى ئـەو بيروبـاوەڕە نابێتـە يەكتاپەرست (موحد) ێكى تەواو، تاپابەند نـەبێ بـەجۆرى دووەمـيش لـەجۆرەكانى يەكتاپەرستى (توحيد ) كەبريتى يە لە

قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاء وَالأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ السَّمْعَ والأَبْصَارَ وَمَن يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيَّتَ مِنَ الْحَيِّ وَمَن يُدَبِّرُ الأَمْرَ فَسَيَقُولُونَ اللّهُ فَقُلْ أَفَلاَ تَتَّقُونَ {يونس/٣١} .

واتـە: ئەی محمد (ﷺ) پێیان بلێ: ئایا کێ لە ئەرزو ئاسمانـەکان خـواردنو خـۆراكو رسقتان پێ دەدات ، وە کێ خاوەن و دروستکەری گـوێ و دەمـو چـاوەکانە ، وە کـێ زیندو لە مردوو دەر دێنێ ، وەکێ مردوو لە زیندوو دەردێنێ ، وە کێ کاروبارەکـانی ئەرزو ئاسمان و بوونەوەر بەرێوە دەبا ، لە کۆتاییدا دەڵـێن : خـوای گـەورە دروسـتی کردوون ، دەتۆش پێیان بڵێ : بۆ لە خوای گەروە ناترسن و نای پەرستن .

## دووەم : یەکتا پەرستی لەخوایێتی دا

واتـە: تاكوتەنیا کردنی خوای گەورە بـەهۆی کاروکردەوەکـانی بەندەکانیـەوە، واتـە: دەبێ بەندەکان بەهۆی بەندایەتیو خواپەرستیانەوە یەکتایی خوای گـەورە بسـەلمێنن. بەیەکتا پەرستی لەخواپەرستیداش ناودەبرێ، واتا بـڕوا هـەبوونێکی تـەواوو نـەگۆڕ بەوەی کـەخوای گـەورە خـوای هەقـەو هـیچ خوایـەکی بەهـەق نییـە کەشایسـتەی پەرستنوبەندایەتی بۆکردن بـێ جگەلـەو، هـەموو پەرسـتراویك جگەلـەو پڕوپـوچ و باتیلوبـێ هودەیـە، دەبـێ بەنـدەکان تـەنها ئـەو بـەتاك بگـرن و، هەمیشـە سەربۆفرمانەکانی ئەو دابنوێنن وپەیڕەوی ڕەها تەنها لەبەرنامەی ئەو بکەن، وەنابـێ هیچ کەسو بونەوەرێك هاوبەشی بۆپەیـدابکاو لـەفرمانی لابـدا باهـەرکێ ولەهـەر کوێیـەك بێت، وەنابێ لەڕووی بەندایەتی کردنو وخواپەرستییەوە هیچ شتێك بۆجگـە لەخوای گەورە ئەنجام بدات ، بۆنموونە وەك: ( ڕۆژو ونوێژو حـەج وزەکـات وپاڕانـەوەو

فریاکەوتن وهانا بۆبردن وداوا لێکـردن ولـێ خواسـتن وخـۆش ویسـتن ودۆسـتایەتی ودوژمنایەتی کردن وسەربڕینو قوربـانی بـۆ کـردنو داوای لێخۆشـبوون لێکـردنو ...هتـد) جگـە لەوانـەش کـە جـۆری خواپەرسـتی ئاشـکراو نادیـارن وپەیوەنـدیان بەخواپەرستی یەوە هەیـە ، تـەنها دەبـێ بۆخـوای گـەورەوکردگار بکـرێن و، دەبـێ بەگشتی لەهەموو ئەو ڕووانە تەنها خوا بپەرسترێ و ، نابـێ هەنـدێك یـان بکـرێن وهەندێك یان نەکرێن ، ئەگـەر وابـێ مـرۆ گـومڕا دەبێـت. هـەروەك خـوای گـەورە دەفەرموێ:

إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ {الفاتحة/٥}.

واتـە: خوایە هەرتۆ دەپەرستین ، وە داوای کۆمەکی و یارمەتیو هاوکاری هەر لـەتۆ دەکەین.(١). وە فەرموویەتی :

وَمَن يَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ لَا بُرْهَانَ لَهُ بِهِ فَإِنَّمَا حِسَابُهُ عِندَ رَبِّهِ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ {المؤمنون/١١٧}.

واتـە: هەرکەسێ وێڕای خوای گەورە داوی پەرستراو وخوایەکی تریکـاو بـڕوای پـێ هەبێ ، بەبێ ئەوەی کە بەڵگەی لەسەرڕاستیو هەقی هـەبێ ، حسـابی ئـەو کەسـە لەلایەن خوای گەورەیەو هەر ئەو دەزانێ کە ڕۆژی دوایی چی لێدەکا ، خوای گەورە بێ بڕوایان سەر ناخاتو یارمەتیان نادات . (١) . وە خوای گەورە دەفەرمووێ :

وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ {الذاريات/٥٦}.

واتـە: من ئینسـان و ئەجینەم تەنها بۆ پەرستنی خۆم دروستکردوون .

یەکتا پەرستی لـەخوایێتی دا: ئەوەیـە کەسـەرجەم پەیامبـەرانی خـوای گـەورە بانگەوازیان بۆ کردووە ، سەرەتا وکۆتا ، ڕووی ئاشکراو نادیاری ئایینە، لەبـەر ئـەوە پێغەمبەران (علـیهم السـلام) هـەناردراون وپەرتوکـەکان دابـەزیون وشمشـێرەکانی

جیهاد سواون، بەهۆی ئەو ( یەکتا پەرستی ) یـەوە نێـوان بـڕوادارو بێـبڕوا، نێـوان ئەهلی بەهەشت ودۆزەخ جوێ دەبێتەوە، ئـەوەش واتـای ئـەو فەرمودەیـە دەگەیـەنێ کەخوای گەورە دەفەرموێ :( لا إله إلا الله ) واتە: هیچ خوایەکی هەق نی یە تـەنها خوای کردگاری بونەوەر نەبێ .

وە دەفەرموێ : وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِك مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ {الأنبياء/٢٥}.

واتـە: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) ئێمە هیچ نێردراوێکمان پـێش ئێـوە نـەناردووە، مەگـەر نیگاو سروش مـان بۆ کردوە کەهیچ خوایەك نی یـە تـەنها (مـن) نـەبێ، دەکـەواتا تەنها بەندایەتی من بکەن و من بپەرستن (٢)

هەندێ لە سیفەتە بەرزەکانی خوای گەورە ئەوەیە کە خۆی بەتەنیا (پەروەردگارو دروستکەر و دەسـەلاتدارو و ژێنـەر و مرێنـەرە...)ە و ، هـەموو سیفەتێکی بـەرزو بەرێزو تەواوی هەیـە، پاکـە لەهـەموو کـەموکوڕی و نـەنگێك ، هـەموو شـتێك بەدەست ئەوە و ، نابێ هیچ جۆرە عیبادەتێك بۆغەیری ئەو بکرێ ، وە یەکتاپەرستی ( پەروەردگارێتی ) یش لە پێداویسـتیەکانی یـەکتا پەرسـتی خوایەتیـە ، چـونکە هاوبەشی پەیداکەرەکان (مشرکین )یەك خوایان نەدەپەرست ، بەڵکو چەندان خوایان دەپەرست ، وایان دادەنا کەئەو خوایانە بۆیە دەپەرستن تـا لـەخوای گـەورەیان نزیـك بکاتەوە [١] ، ئەگەر چی دانیـان بـەوە دادەنـا کـە ئـەو خوایانـە هـیچ جـۆرە سـود و

(١) چونکە خوای گەورە دەفەرموێ :
وَإِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ لاَّ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ {البقرة/١٦٣}.

زەرەرێکیان پێ ناگەیەنێ ، بۆیە خوای گەورەش بە بڕواداریان دانانێ ، هەرچەندە دان بەیەکتاپەرستی (پەروەردگارێتی) یش دا دەنێن ، بەلام دان بە یـەکخوایی دانـانێن ، لەبەر ئەوە خوای گەورە بـەبێ بـاوەڕ و هاوبـەش پەیـدا کـەریان دادەنـێ لـە بـارەی خواپەرستی یەوە.

---

واتـە : ئەی خەلکینە خوای ئێوە یەك خوایە ، هیچ خوایەکی بەهەق نیە تەنها ئەو نـەبێ ، کـە خوایەکی بەخشندەی میهرەبانە .

وە پێغەمبەریش(ﷺ) دەفەرموێ: ( فليكن أول ماتعودهم إليه ، شهادة أن لا اله الا الله ).

واتە: با یەکەم شت کەلەسەری رابێن‌و فرچك‌و خوی پێوە بگرن‌و بۆلای بگەڕێننەوە شایەتمان بێت.

یا دەفەرموێ : ( الى أن يوحدو الله ) . متفق عليه .

واتە : لەیەکتاپەرستی خوای گەورە دا خوا بەیەك بگرن . وەرگێڕ .

(٢) وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاَهُمَا فَلاَ تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلاَ تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلاً كَرِيمًا {الإسراء/٢٣}

واتـە : ئەی پێغەمبەر (ﷺ) پەروەردگاری تۆ بڕیاری داوە کە جگە لە خوای گـەورە نەپەرسـتن و بەندایەتی بۆ نەکەن ، وە لەگەل دایك‌و باوکانیشتاندا چاك‌و بەرێز بن ، وەکاتـێ کـە گەیشـتنە تەمەن‌و هەرەتی پیر بوون سوکترین قسەی بریندارکەرو ناشیرین‌و سوکیان پێ مەلێن‌و نیگەران و هەراسان‌و تورەیان مەکەن ، بەلکو قسەی بەرێ‌و جێ‌و رێزیان پێ بلێن . وەرگێڕ.

[١٠] وەك خوای گەورە لەسەر زارای ئەوبت پەرستانە دەفەرموێ :

مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى {الزمر/٣}

واتە : ئێمە ئەو بت وسەنەمما نە تەنها لەبەر ئەوە دەیپەرستین تا لـەخوا مـان نزیـك بخەنـەوە . وەرگێڕ.

لێـرەدا هــەڵگری بیروبـاوەڕی سـەلەف بـە تەوحیـدی ئولوهیـەت لەخـەڵکی تـری جیادەبنەوە و جیاواز یان هەیە ، بەپێی ئەوە مانـای یەکتاپەرسـتی بریتییـە لـەوەی کەهیچ دروست کەرێك نی یە تـەنها خـوای کردگـار نـەبێ ، بێگومـان تەوحیـد ی ئولوهیەتیش بەدی نایێ تەنها بەم دوو رەگەز و بنچینە سەرەکیانە نەبێت .

یەکەمین : بڕوابوون بەوەی کە کردنی سەرجەم جۆرەکانی خوا پەرستی بۆ خوای تـاكو پـاك و بـێ هاوتایـە و ، نابـێ بـۆ هـیچ کەسـێکی تـر بکـرێ ، وەهـیچ هـەق و تایبەتمەندیەکی دروستکەر بە دروستکراوەکان نادرێت ، نوێژ و خواپەرستیو کڕنۆش و بەندایەتی بۆ غەیری خوا ناکرێ ، پشت بەغەیری خوا نابەسترێ .

وەك خوای گەورە سەبارەت بەوە دەفەرموێ :

**قُلْ إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿الأنعام ١٦٢﴾.**

واتە ئەی موحەممەد ( ﷺ ) تۆ بڵێ بێگومان هەموو (نوێژ و قوربانی و ژیانومـان و مردنمان) بۆ خوایە و ، ئەو خوایەی کە هیچ هاوبەشێکی نی یە ، وەبـەوە فـەرمانم پێ کراوە لەلایەن پەروەدگارەوە ، وەمنیش یەکەم موسڵمانم[١١]

وەفەرموویەتی : أَلَا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ {الزمر/٣}

---

[١١] وەپێغەمبەریشمان (ﷺ) دەفەرموێ :

(وما تقرب الي عبدي بشيء احب الي مما افرضته عليه) بخاری

واتە : خوای گەورە دەفەرموێ: بەندە بەوە لە من نزیك دەبێتەوە کە پێ ی خۆشەو لەسەرم فەرز کردوە . وەرگێر .

واتە : ئاگادار بن ئایینی پوخت و پـیرۆز تـەنها هـی خوایـە ، واتـا تـەنها ئـایین و کـاروکردەوە و خواپەرسـتی چـاك و پـاك و بـێ ریـا لەلایـەن خواوەنـدی گـەورەوە وەردەگیرێت‌و قبوله [١٢]

دووەمـین : دەبـێ خواپەرسـتی بـەپێی ئـەو دەق و فەرمانانـەبێ کـەخوای گـەورە و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) فەرمانیان پێ کردوەودەیانەوێ . جا کەوتا

- خواپەرستی‌و بەندایەتی کردن بەتەنها بۆ خوای گـەورەو مـل بـۆ کەچـکردنی و فەرمانبەری کردنی ، ماناو مەبەستی (لاإله إلا الله) دەسەلمێنێ و دێنێتە دی .
- شوێن کەوتنی پێغەمبەر ی خوای گەورە(ﷺ) ومـل کەچـکردن و گوێـدێری بـۆ فەرمانەکان و دورکەتنەوە لەقەدەغەکراوەکانی ، ماناو مەبەستی (محمداً رسـول الله) دەگەیەنێ‌و دەسەلمێنێ

---

[١٢] وەك خوای گەورە سەبارەت بەوە دەفەرموێ :

وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاء وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ وَذَلِكَ دِينُ الْقَيِّمَةِ {البينة/٥}

واتـە : بەندەکانی خوای گەورە فرمانیان تەنها بەوە پێکراوە کە بـە لسـۆزی و نیازپـاکی خـوای گەورە بپەرستن ، ئەو خوایەی کە خاوەنی ئاینێکی پاك‌و پیرۆزو بێ نەنگە ، وە فرمانیان پێکراوە کە بە لسۆزی و نیازپاکی نوێژ بۆ خوای گەورە بکەن‌و زەکات لـە سـەروەت‌و سـامانیان بـدەن ، چونکە ئەم ئایینە ئاینێکی ڕێك‌و پێك‌و بە پێزو بە هێزە. وەرگێڕ.

# بەرنامە و ڕێبازی ئەهلی سوننە و جەماعە

ئەوانەی کەلەسەر ئەو بەرنامە و ڕێبازەن تەنها خوا دەپەرستن و هاوبەشی بۆ بڕیار نـادەن، وەتــەنها لــەخوای گــەورە داوای یارمــەتی و کۆمــەکی هاوکــاری و داد و فریادتەنها لە خوای گەورە دەکەن و پشتی پێ دەبەستن ، وەتـەنها لـە خـوای گـەورە دەترسن‌و بەگوێرایەڵی و خواپەرستی و کاروکردەوەی چـاك وپـاك خۆیـان لـە خـوای گەورە نزیك دەکەنەوە

هەرودك خوای بەرزومەزن سەبارەت بەوە فەرموویەتی

وَاعْبُدُواْ اللّهَ وَلاَ تُشْرِكُواْ بِهِ شَيْئًا {النساء/٣٦}

واتـە تەنها بەندایەتی بۆخوای گەورە بکەن و ئەو بپەرستن و ، هیچ شتێك مەکەنـە هارتای خواو هەرگیز هاوبەشی بۆ پەیدا مەکەن[١٢]

---

[١٢] وە پێغەمبەریش( ﷺ) دەفەرموێ (حق الله على العباد أن يعبدوه ولا يشركوا بـه شـيئا).
بخاری/ج٣،ص/١٠٤٩،برقم٢٧٠١ + مسلم/ج/١، ص/٥٩، رقم/٣٠.

واتە : هــەقی خــوای گــەورە لەســەر بەنــدە دروســتکراوەکانی ئەوەیــە کەتــەنها ئــەو بپەرسـتن وبەندایەتی ئەو بکەن ، بەهیچ شێوەیەك هیچ هاوبەشێکی بۆ بڕیارِ نەدەن .

وەدەفەرموێ : (من مات من أمتي لايشركوا بالله شيئاً دخل الجنة) بخاری

واتـە هەر کەسێك لەئوممەتی من بمرێو قـەت هاوبەشـی بـۆ خـوا بریـارِ نـەدابێ ، دەچـێتە بەهەشتەوە

وەدەفەرموێ : (من لقي الله ولايشركوا بة شيئاً دخل الجنة) بخاری

واتە: هەرکەسێك بمرێو بەسەلامەتی بەخوای گەورە بگا بە بێ ئەوەی کە شەریکی بۆ بڕیار دابێ ، خوای گەورە عەفوی دەکاو دەچێتە بەهەشت . وەرگێر .

# سێیەمین : یەکتا پەرستی لەناوو سیفەتەکاندا

**واتە: بڕوا هەبوونێکی تەواو بەوەی کە خوای گەورە خاوەنی چەند ناوێکی جوان و سیفاتێکی بەرزو پاك و تەواوە ، خوای گەورە ساغو پاکەوبێ نەنگە لەسەر جەم ناوو سیفاتی ناتەواوو ناشایستە ، بەوە جیا دەبێتەوە لەهەموو بوونەوەرەکانی تر .**

**ئەهلی سوننە و جەماعە : خوای خۆیان بەو سیفەتانە دەناسن کەلەقورئان و سوننەدا هاتوون ، بەو شێوەیەی مەدح و پێناسەی خوا دەکەن ، کەخوای گەورە خۆی پێناسەی خۆی کردوە ، بەو شێوەیەی کەپێغەمبەر(ﷺ) پێناسەی خوای گەورەی کردوە ، قسە لەجێ گای خۆدا ناگۆڕن ، وەبێ باوەڕنین بەرانبەر بەناو و نیشانە و بەڵگەکانی خوای گەورە ، وە کاربەوە دەکەن و ئەوە دەسەلمێنن کە خوای گەورە بۆ خۆی سەلماندویەتیوبڕیاری داوەو پێی رازیە ، بەبێ شێواندن و هاوشێوە کردن (تمثیل) و چۆنیەتی بۆ بڕیار دان (تکییف)و دەستە پاچە و لەکار خستن و (تعطیل) و لادان و گۆڕین (تحریف) تێداکردن، وەدەربارەی هەموو ئەو شتانە تاکە پێوەرو قرێسایان ئەو ئایەتە یە کەخوای گەورە دەفەرموێ :**

**لَيْس كَمثْله شَيْءٌ وَهُو السَّمِيعُ البَصِيرُ** {الشورى/١١} .

**واتە : هیچ کەسو شتێك لەهیچ شتێك هاوشێوەی (وەکو) خوای بێ هاوتا نیە و، وە خوای گەورە ناچێ ، ئەو خوایە بینەر و بیسەرە**

وەدەفـەرموێ : **وَلِلّهِ الأَسْمَاء الْحُسْنَى فَادْعُوهُ بِهَا وَذَرُواْ الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَآئِهِ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ** {الأعراف/١٨٠} [١٤]

**واتە : خوای تاكو پاك و بێ خەوش چەندان ناوی جوان و پیرۆزی هەیە ، دەبـە هـۆی ئەو ناوانەلێی بپاڕێنەوەو هاناو هاواری بۆ ببەنو داوای دادوكۆمـەكیوهاوكاری لـێ بكەنو، واز بێنن لەو كەسانەی كەناوەجوانەكانی خوا دەشێوێنن و بڕوایان پێ ناكـەن ، ئەوانە لە ئایندەدا پاداشتی كارو كردەوەكانیان وەردگرنەوە كە كردویانن .**

---

[١٤] مسقۆف و بێ باوەڕی (الالحاد) : واتە گۆڕان و لادان لەحەق و شەرع ، ئەوانەش دەگریتەوە

❖ (تعطیل) لەكار خستنو دەستەپاچەكردنو پەكخستن : واتە: نەسەلماندنی سـیفەتەكانی خـوا یاهەندێ لە سیفەتەكانی و بڕوا پێ نەبوونیان .

❖ تحریف . واتە گۆڕینو لادان : واتە گۆڕینی دەق ،چ لەرووی گوتە وەبێ یا لەرووی واتاوە ، بۆیە هەمور (تعطیل) ێك ( تحریف) نیە .

❖ تكییف (چۆنیەتی بۆ بڕیاردان) : بریتییە لە چۆنیەتی بڕیاڕ دان بۆ خوای گەورە ، واتا ئینسان بڕیاڕ بدا كە خوای گەورە لەڕوی شكلو شێوە چۆنە.

❖ تمثیل : واتا سەلماندنو بڕیار دانی نمونە و هاو شێوە بۆخوای گەورە . واتە خوای گەورە بكەیتە نمونەی شتێك یا شتێك بكەیتە نمونەی خوای گەورە

❖ تشبیە : واتە: وێچواندن واتە : شتێك وە خوای گەورە بچـوێنی یـا خـوای گـەورە وە شـتێك بچوێنیت

وە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ : ( إن لله تسعة وتسعين إسما مائة إلا واحدا ، من أحصاها دخل الجنة ) بخاری /ج/٦ ،ص٢٦٩١،رقم/٦٩٥٧ +مسلم/ج٤،ص٢٠٦٢،رقم/٢٦٧٧.

واتە : خوای گەورە نۆهەدو نۆ ناوی هەیە ، هەركەسێ لەبەریان بكاو بڕوای پێیان هەبێو كاریان پێ بكا دەچێتە بەهەشت . وەرگێڕ.

# ئەهلی سوننە و جەماعە

چۆنیەتی سیفەتەکانی خوای باڵآ و شکۆدار بڕیارنادەن ، چونکە خوای گەورە بۆخـۆی باسی چۆنیەتی (کیفیە) ی نەکردوە ، وەهیچ کەسێکیش نازانێ کەخوای گەورە چۆنە ، تاپێناسەی خودی خوای گەورە بکا بەدەر لەوەی کەخۆی باسی خۆی کردوە، هەروەك خۆی دەفەرموێ : ﴿أَأَنتُمْ أَعْلَمُ أَمِ اللَّهُ﴾ {البقرة/١٤٠}

واتـە ئەی محمد پێان بڵێ ئایا ئێوە زاناترن یاخوای گەورە، بێگومـان خـوای گـەورە چونکە ئەو هەموشتەکانی دروستکردووە[١٥] وەدەزانێ

وە دەفەرمووێ : ﴿فَلاَ تَضْرِبُواْ لِلّهِ الأَمْثَالَ إِنَّ اللّهَ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾ {النحل/٧٤}

واتە نمونە و بڕو بیانو بۆ خوای گەورە مەیەننەوە ، خوای گەورە دەزانێ ، ئێـوە نـای زانن

---

[١٥] خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا باسی هەندێ سیفاتی خۆی دەکا ، بۆ وێنە دەفەرموێ : قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ {الإخلاص/١}. واتە : ئەی موحەممەد بلێ خوای گەورە تاكو تەنیایە وەدەفەرموێ : الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَلَهُ الْحَمْدُ فِي الْآخِرَةِ وَهُوَ الْحَكِيمُ الْخَبِيرُ {١} يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي الْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ السَّمَاء وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا وَهُوَ الرَّحِيمُ الْغَفُورُ {سبأ/٢}.

**واتە :** سوپاسو ستایش بۆ ئەو خوایەی کە خاوەنی هەموو ئەو شتانەیە کە لـە نێـو ئاسمانـەکانو زەوییە ، لە کۆتاییشدا سوپاس و ستایش بۆ ئەو ، ئەوخوایە کارزانو شارەزایە، ئـەوەی لـەزەوی دابێو ئەوەی بچێتە ناو زەویو ئەوەی لەزەوی دەربێ و ، ئەوەی لە ئاسمان دەبارێ و دادەبەزێ و ، ئەوەی لە ئاسمان سەردەکەوێت ، هەمووی دەزانێت ئەوخوایە بەخشندەو میهرەبانە . وەرگێر

لەپاش پێغەمبەر ی خوای گەورە (ﷺ) هیچ کەسێك زانا و ئاگادار تـر نیـە بـەخواو بەهەموو هەق و شتەکانی ، بەبەلگەی ئەوەی دەفەرموێ :

**وما يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى {٣} إِنْ هُو إِلَّا وحْيٌ يُوحَى {النجم/٤}**

واتـە : پێغەمبەری خوای گەورە هیچ شتێك لەخۆیەوە ، لە هەواو ئـارەزووی خۆیـەوە نالێ ، بەڵکو ئەوەی دەیلێ هەر هـەمووی سـروش ( وحـی ) یـە کەلەلایـەن خـوای خۆیەوە بۆی هاتەوەو پێی گوتراوە

ئەهلی سوننەو جەماعە : بروایان وایە کە خوای گەورە لەبووندا هـەر هـەبوەو هـەر دەبێ ، یەکەم و جاویدانی (أول و أزلي) ە و هیچ شتێك بەر لەو نەبوە و خـۆی هـەموو بوونەوەری بەدی هێناوە ، وەکۆتاو هەمیشەیی ( آخر و أبدئ ) یە ، هەمیشە هـەر دەمێنێ و هیچ شتێك لەپاش ئەو نی یەو نابێ ، واتا هـەموو شـتێك لـەنێو دەچـێ تەنها ئەو دەمێنێتەوە ، وەئاشکرا و دیار(**ظاهر**) ە ، هیچ شتێك لەسەروی ئەو نی یـە ، وەنادیار ( **باطن** ) ە ، و هیچ شتێك لەخوار ئەو نیە کە بزر ونادیار بـێ ، هـەروەك خۆی دەفەرموێ

**هُو الْأَوَّلُ وَالْآخِرُ وَالظَّاهِرُ وَالْبَاطِنُ وَهُو بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ {الحديد/٣}**

واتە خوای گەورە سەرەتا و کۆتای هەمو شتێکی ژیان وبونەوەرە ، ئاشـکراو بـزر و نادیارە، بەهەموو شتێکیش زانا و داناوئاگادارە.

وە خود ( **ذات** ) ی خوای گـەورە وە خـودی هـیچ کـەس و شـتێکی تـر ناچـێت ، وە سیفەتەکانی وەسیفاتی هیچ کـەس و شـتێکی تـر ناچـێت ، چـونکە خـوا نموونـەی هاوبەش و هاو وێنە و هاوشێوەی نی یە ، لەگەڵ دروستکراوەکانی دا هەرگیزبەراورد و پێوانە ناکرێ . ئەهلی سوننە و جەماعە ئەوە بۆ خوا دەسەلمێنن و بریارِ دەدەن بەبێ ( **تمثیل** ) کە خوای گەورە بۆ خۆی برِیاری داوە، وە بە پاك و بـێ گـەردی دەگـرن و،

بڕوایان بە هەموو ناوو سیفەت‌وفرمانەکانی هەیە بەبێ ئەوەی هیچ یان پەراوێز و لە کار بخەن کە خوای گەورە پێناسەی خۆی پێ کردووە.

وە بڕوایان وایە کە خوای گەورە لەسەرەوەی حەوت ئاسمانەکانەو ، لەسەر تەخت و بارەگـا (عـرش) وەسـتاوە[16] و ، بـەهۆی زانیـاری و ئاگـای خـۆی دەوری هـەموو دروستکراوەکانی بوونەوەرەکـەی داوەوپێیـان ئاگـادارە ، هـەروەك لەحـەوت ئایـەتی پیرۆزدا لەو بارەیەوە باسی خۆی کردوە [17]

---

[16] بۆیە پێغەمبەریش (ﷺ) کەباسی عەرش دەکا دەفەرموێ :

( و العرش فوق الما ، الله فوق عرش ، وهو يعلم ماأنتم عليه) ابوداود.

راڤەی روالەت و زمانەوانی ئەم فەرمودەیە واتە : عەرشی خوای گەورە لەسەر ئاوە ، خوای گەورەش لەسەر عەرشە ، خوای گەورە دەزانێ کە ئێوە لەسەر چین و بڕواتان بەچیە . وەرگێر.

[17] خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا لەحەوت جێ باسی ئیستیوا دەکات ، هەروەك دفەرمووێ :

الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى {طه/٥}

واتـە : خـوای گـەورە ومهرەبـان لەسـەر تـەخت و بارەگـای فـەرمانڕەوایی خـۆی وەسـتاوە و بەدیهێنراوەکانی بەڕێوە دەبا.

وە دەفەرمووێ : إِنَّ رَبَّكُمُ اللّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ أَلاَ لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ تَبَارَكَ اللّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ {الأعراف/٥٤}

واتە : پەروەردگارتان ئەو خوایەیە کە ئاسمانەکان و زەوی لەشـەش شـەو و رۆژدا دروسـتکردووە ، پاشان لەسەر تەخت و بارەگای حوکمرانی خۆی وەستاوە ، بەتاریکی شەو روناکی رۆژ دادەپۆشێ لە کاتێکدا بە ئەسپایی بەدوایدا دەگـەڕێ و عەودالیـەتی ، رۆژو مـانگ و ئەسـتێرەکان هـەموویان بەفرمانی خوای گەورە لە گەڕان و سوڕانو خولانەوە دان و لە فرمـانی ئـەو دەرناچـن و رام و ژێـر دەستەن ، ئاگادار بە دروستکردن و بوونەوەر هەر هەمووی هی خوای گەورەیە و لەبەر دەستی خوای گەورەیە ، خوای پەروەردگاری جیهانیان زۆر پاك و پیرۆزو گەوەو میهرەبانە . وەرگێڕ

وە دەفەرمووێ : إِنَّ رَبَّكُمُ اللّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يُدَبِّرُ الأَمْرَ مَا مِن شَفِيعٍ إِلاَّ مِن بَعْدِ إِذْنِهِ ذَلِكُمُ اللّهُ رَبُّكُمْ فَاعْبُدُوهُ أَفَلاَ تَذَكَّرُونَ {یونس/٣}

**واتە** : پەروەردگارتان ئەو خوایەیە کە ئاسمانەکان و زەوی لەشـەش شـەو و ڕۆژدا دروسـتکردووە ، پاشان لەسەر تەخت و بارەگای حوکمرانی خۆی وەستاوە ، کاروباری ژیان و بوونەوەر بەڕێوە دەبات ، لەرۆژی دواییدا هیچ تکاکارێك نیە بە بێ روخسەتی خوای گەورە داوای لێخۆشبوون بۆ هیچ کەسێك بکات ، ئائەوە خوای پەروەردگارتانە ، بیپەرستنن ، ئایا وشیار نابنەوە و پەنـدو ئامۆژگـاری وەر ناگرن وەرگێڕ

وە دەفەرمووێ : اللّهُ الَّذِي رَفَعَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي لأَجَلٍ مُّسَمًّى يُدَبِّرُ الأَمْرَ يُفَصِّلُ الآيَاتِ لَعَلَّكُم بِلِقَاء رَبِّكُمْ تُوقِنُونَ {الرعد/٢}

**واتە** : خوای گەورە ئەو خوایەیە کە ئاسمانەکانی بەرزکردۆتەوە و ڕاگرتووە بەبێ کۆڵەگە کە دەیبینن ، پاشان لەسەر تەخت و بارەگای حوکمرانی خۆی وەستاوە ، رۆژو مانگی رام و ژێردەستە کردووەو هەموویان لە خولانەوەو گەڕاندان تا کاتێکی دیاری کراو کۆتاییان دێت ، کاروباری ژیان و بوونەوەر بەڕێوە دەبات ، بەڵگەو نیشانەکان لێك جیا دەکاتەوە ، بەڵکو بەهۆی لە خواترسان و خواپەرستیتان بە خوای گەورە و میهرەبان بگەن وەرگێڕ

وە دەفەرمووێ : الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ الرَّحْمَنُ فَاسْأَلْ بِهِ خَبِيرًا {الفرقان/٥٩}.

**واتە** : خوای گەورە ئەو خوایەیە کە ئاسمانەکان و زەوی‌و ئەوەی لە نێوانیاندایە لەشەش شەو و رۆژدا دروستیکردووە ، پاشان لەسەر تەخت و بارەگای حوکمرانی خۆی وەستاوە ، خوای گەورە بەبەزەییە ، بۆ تێگەیشتن لەبوونەوەرو نهێنی و وردەکاریەکانی لە خوای گەورە و میهرەبان بپرسە کە زۆر زاناو شارەزایە . وەرگێڕ

وە دەفەرمووێ : اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ مَا لَكُم مِّن دُونِهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا شَفِيعٍ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ {السجدة/٤}

**واتە** : خوای گەورە ومیهرەبان ئەو خوایەیە کە ئاسمانەکان و زەوی‌و ئەوەی لە نێوانیاندایە لەشەش شەو و رۆژدا دروستکردووە ، پاشان لەسەر تەخت و بارەگای حوکمرانی وەستاوە ، کاروباری ژیان و

وەك خوای گەورە دەفەرمووێ :

أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ {الملك/١٤}

واتە : ئایا ئەو خوایەی کە خەلك و بونەوەری دروست کردوە نازانێ و ئاگای لە ئێـوە ولە بونەوەر نیە ، بێگومان ئەو خوایـە هـەمو شـتێك دەزانـێ و ئاگـای لـە هـەمو شتێکە لە بونەوەر ، ئەو خوایە وردبین وشارەزاو ئاگادارە . وە دەفەرمووێ :

إِنَّ اللَّهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ {الذاريات/٥٨}.

واتە : بێگومان خوای گەورە خۆی خاوەن ڕزق و ڕۆزی و هێـز و تونـا و دەسـەلاتێکی زۆر فراوانو بەهێزو بە گوڕو تینە.

---

بوونەوەر بەڕێوە دەبات ، لەڕۆژی دواییدا جگە لە خوای گەورە و میهرەبان هیچ پشتیوانو تکاکارێك نیە بە بێ روخسەتی خوای گەورە داوای لێخۆشبوون بۆ هیچ کەسێك بکات یـا لـە دۆزەخ قوتـاری بکات ، ئایا وشیار نابنەوە و پەندو ئامۆژگاری وەر ناگرن . وەرگێڕ

وە دەفەرمووێ : هُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي الْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ السَّمَاءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ {الحديد/٤} . وەرگێڕ

واتە : خـوای گـەورە ومهرەبـان ئـەو خوایەیـە کـە ئاسمانـەکان و زەوی لەشـەش شـەو و ڕۆژدا دروستکردووە ، پاشان لەسەر تەخت و بارەگای حوکمرانی خۆی وەستاوە ، کاروباری ژیان و بوونەوەر بەڕێوە دەبات ، ئەوەی دەچێتە ناو زەوی و ئەوەی لێشی دەردێ و دەڕوێ ، وە ئەوەی لە ئاسمانـەوە دادەبەزێ و ئەوەی کە لەئاسماندا سەردەکەوێ و بەرز دەبێتەوە ، هەرهەمووی خوای گەورە دەیزانێ و پێی ئاگادارە ، خوای گەورە لەگەڵتانەو چاوی لێتانەو پێتان ئاگادارە لەهەر کوێ یەك بن ، خوای گەورە بیناو ئاگادارە بەرانبەر بە هەموو ئەوشتانەی کە دەیکەن . وەرگێڕ

بۆ وێنە دەفەرمووێ **الرَّحْمنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى {طه/٥}**

**واتە خوای گەورە ومهرەبان لەسەر تەخت و بارەگای فەرمانڕەوایی خـۆی وەسـتاوە و بەدیهێنراوەکانی بەڕێوە دەبا [١٨] . وەدەفەرمووێ :**

**ثُمَّ اسْتَوى عَلَى الْعَرْشِ** {الأعراف/٥٤} + الحديد /٤

**واتـە : دوای ئەوەی خوای گەورە ومهرەبان ئەرزو ئاسمانەکانی دروست کردن ، لەسـەر تەخت و بارەگای فەرمانڕەوایی خۆی وەستاوە و بەدیهێنراوەکانی خۆی بەڕێوە دەبا**

وە دەفەرمووێ

**ءَأَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاء أَن يَخْسِفَ بِكُمُ الأَرْضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ {١٦} أَمْ أَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاء أَن يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا فَسَتَعْلَمُونَ كَيْفَ نَذِيرِ {الملك/١٧}**

**واتـە ئایە ئێوە لەو خوایە دلنیان کە لە ئاسمانەوەیە ، بـەناخی زەویـدا ڕوتـان ببـا لەکاتێکا زەوی وەك دەریا شەپۆل وگێژ بخوا و بخولێتەوە ، ئایە ئێوە لەو خوایە دلنیان**

---

**کە ئێمە چۆنیەتیەکەی نازانین، وەلێ ماتو بۆ خۆی باسی ئەوە دەکا بڕوامان پێ یەتی، وەرگێڕ.**

**٢ وەستان و جێگیر بوون (إستواء) لەسەر تەخت و بارەگا و بەرزی (علو) خوای گەورە دوو سیفەتن کە بڕوامان پێ یانە و بەو شێوەیە دەیان سەلمێنین کە شایستەی خوای گەورەن و باسی کردوون، وە ڕاڤە و پێناسەی وشەی ( إستواء ) لەلایەن سەلەف، واتا: (بەرز بۆوە، جێگیر بوو) وە سەلەف تەنها بەو وشانەی باسکران پێناسەی (إستواء) دەکەن و هیچی لێ زیاد و کەم ناکەن و لەو چوارچێوەو سنورە دەرناچن ، بەمانای (توانادار و پاشا و والی و هتد) وشەی (إستواء ) لێك نادەنەوە.**

*** إستواء : لە زمانی عەرەبی دا زانراوە و دیارە، بە مانای بەرزی و بلندی (علو ، إرتفاع) دێت .**

*** وە (کیفة) ە تەکەی نادیارە و خوا نەبێ کەس نای زانێ کە چۆنە.**

کە لە ئاسمانەوەیە ، کە بای توندی پڕ زیخە بەردتان بنێرێتە سەر ، ئەوسـا تێدەگـەن کە هەڕەشە و ئاگادارکردنەوە و ترساندنی خوای گەورە چۆنە

وەك خوای گەورە دەفەرموێ: **إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ وَالْعَمَلُ الصَّالِحُ يَرْفَعُهُ** {**فاطر/١٠**}.

واتە : کرداروگوفتاروقسەی چاك و جـوان وبـەجێو شەرعیوشایستە بـۆلای خـوای گەورە بەرز دەبێتەوەو سەردەکەوێو گیرایە، هەر ئەویش کـارو کـردەوەی چـاك بـۆلای خۆی بەرز دەکاتەوەو دەرزوتۆماریان دەکا بـۆ دوارۆژو سـەرەنجامو دوارۆژی ئـادەمیزاد دیاری دەکات.

واتـە: خـوای گـەروە کرداروگوفتـاری چـاك وبـەجێ وەردەگرێوبـۆلای خـۆی بـەرزی دەکاتەوەوە دەفەرمووێ : **يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوْقِهِمْ** {النحل/٥٠}

واتە: لە خوای پەروەردگاریان دەترسن کە لە سەروی خۆیانەوە یە

وەپێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی

(**الا تأمنوني وانا امين من في السماء** ) **بخاری و مسلم** .(٢).

واتە: ئەی خەلکینە ئایە ئێوە لـەمن دلنیاوئـەمین نـین و، بـە ئەمینـداری خۆتـانم نازانن؟ ، کەچی من لەو خوایە دلنیام کە لە ئاسمانە کە خواو پەروەردگاری بوونەوەر و ژیانو جیهانە و، ئەمینداری ئەو خوایە پایەبەرزەم کە لەئاسمانەوەیە .

ئەهلی سوننە و جەماعە : بڕوایان بەوە هەیە کە تەخت و کورسی خوای گەورە هـەن و هەقن، بەبەلگەی ئایەتی :

وسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْض وَلاَ يَـؤُودُهُ حِفْظُهُمَا وَهُـو الْعَلِـيُّ الْعَظِـيمُ {البقرة/٢٥٥}

واتـە : دەسەلات و کورسیو زانسـتی خـوای گـەورە زۆر گـەورەو فراوانـە و هـەموو ئاسمانەکان و و زەوی گرتۆتەوەو، پاراستنیان بەلای خواوە هیچ گران و زەحمەت نی یە، ئەو خوایە بەرز و بڵند و گەورە و شکۆ و پایەدارە.

ئەندازە و سنورەکەی بە کەس ناخەملێندریو دەورە نادرێ ، تەنها بـە خـوای گـەورە خۆی نەبێ، وە کورسی لەناو عەرشدایە، وەك ئەوەیە کە ئالقەیەکی بچووك لە ساراو چۆلاییەك بێ، چەند دیارە و بارستە و قەبارەی چەندە، ئاواش تەخت وبارەگای خـوای گەورە تەواوی ئاسمانەکان و زەوی داپۆشیوە ، ( وە کە دەگوترێ خوا لە سەرتەخت و کورسی وەستاوە) خوای گەورە بێ نیاز و دەولەمەندە لـەو تـەخت و کورسـیە، بـۆیَ ئەسەر تەخت نەوەستاوە تا پێویستی پێ بێ، بەڵکو لەبەر حیکمەت و نهێنی یـەکی بەرزو پایەدارە، کە تەنها خوای گەورە خۆی دەزانێ چیەوچۆنە ، چونکە خوا لەوە پاك و گەورە ترە کە پێویستی بە تەخت و هەرشێکی تر هـەبێت ، بـەڵکو پلـە و پایـەی خوای گەورە زۆر لەوە بەرزو گەورەترە، بەڵکو ( تەخت و کورسی ) یـش بـە توانـا و دەسـەلاتی خوای گەورە هەڵگیراون و ڕاوەستاونو دەورە دراونو پارێزراون .

خوای گەورە بە دەستەکانی خۆی پێغەمـبەر ئادەم (علیه السلام) ی لە خۆڵ دروسـت کردوە، ئەو دەستانەش درێـژ و ڕاکێشـرو و والآن ، پـێ یـان دەدا و دەبەخشـێ چـۆن بیەوێ، هەروەك خۆی پێناسەی خۆی دەکاو لەو بارەیەوە دەفەرموێ :

قَالَ يَا إِبْلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ {ص/٧٥}

واتـە : ئەی شەیتانی نەگریس چ شتێك وای لە تۆ کـرد کـە سـوژدەبۆ ئـەو ئادەمـە نەبەیت کە من بە دەستی خۆم لە خۆڵ دروستم کردووە وە دەفەرمووی

**وَقَالَتِ الْيَهُـودُ يَـدُ اللّـه مَغْلُولَـةٌ غُلَّـتْ أَيْـدِيهِمْ وَلُعِنُـواْ بِمَـا قَـالُواْ بَـلْ يَـدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيْفَ يَشَاء {المائدة/٦٤}**

واتـە: جوولەکەکان گووتیـان دەسـتی خـوا بەسـتراووگرێدراوە، بـەڵکو خـوا دەسـتی ئەوانی گرێ داوە، لەبەر ئەوە نەفرەتی خوای گەورەیان لێ بـێ و لـە ڕەحمـەتی خـوای گەورە دووربکەونەوە، وانیە هەردوو دەستی خوای گەورە کراوە و والآن، چۆن بیەوێ ئاوا دەبەخشێ و ئاوا دەکات .

**ئەهلی سوننە و جەماعە** : بڕوایان وایەو دان بەوەدا دەنێن کە خوای بێ هاوتا ( چـاو و گوێ و توانا و زانست و هێز و عزەت و دەسەلات و ژیان و قسە و کردار و گوفتـار و دەسەلات و لاق ودەستو ....هتد) جگە لەو سیفەتانەشـی هـەن کـە لـە قورئـانی پیرۆز و لە سوننەی بە پێزی پێغەمبەر ( ﷺ ) دا باسکراون ، بە شێوەیەك کە تـەنها خۆی دەزانێ کە ئەو شتانەی چۆنن، چـونکە خـوا باسـی چـۆنیەتیەکەی نـەکردوون، بەڵکوتەنها باسی هەبوونی کردوونو، بەو شێوەیەن کە شایستەی خۆینی

بۆ وێنە سەبارەت بە هەندی سیفەتو شتەکانی خۆی دەفەرمووێ

**إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَى {طه/٤٦}**

واتە: بێگومـان من لەگەڵ ئێوەم و ئاگام لێتانە لەهەر کوێ یەك بن، وەمـن هـەموو شتێك دەبیستمو دەبینم.

وە دەفەرمووێ : **وَهُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ** {التحريم/٢}

واتە: خوای گەورە زۆر زاناو شارەزاو دادوەرو کاربە جێ یە .

وە دەفەرمووێ : وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تَكْلِيمًا {النساء/١٦٤}.

واتە: خوای گەورە بەقسە قسەی لەگەڵ موسادا کرد.

وە دەفەرمووێ : وَيَبْقَى وجْهُ رَبِّك ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ {الرحمن/٢٧}

واتە: لەم بوونەوەرە هەموو شت و هەموو کـەس دەمـرێ ، تـەنها خـوای شـکۆدارو بەرێز دەمێنێتەوە

وە دەفەرمووێ : رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ ورضُواْ عَنْهُ المائدة /١١٩ + {التوبة/١٠٠}

واتە : ئەوانەی کە بەدوای خێرو چاکەو ئیسلام کەوتوون و دەچنە بەهەشتەوە ، خوای گەورە لەهەر هەموویان رازیە ، ئەوانیش لەخوای گەورە رازین ، بۆیـە خـوای گـەورە بەهەشتێکی بۆ ساز و ئامادەکردوون کە جۆرو ڕوباری بەژێر دادێ

وە دەفەرمووێ : يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ {المائدة/٥٤}

واتـە ئەوانەی کە بەدوای خێرو چاکەو ئیسلام کەوتوون ، خوای گەورە خۆشی دەوێن ، ئەوانیش خواو پێغەمبەریان خۆش دەوێ (ﷺ)

یا فەرموویەتی فَلَمَّا آسَفُونَا انتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَاهُمْ أَجْمَعِينَ {الزخرف/٥٥}

واتە: کاتێ کە ئێمە یان هەراسان و قـەلس کـرد ، تۆڵـەمان لێ سـەندنەوە و ، هـەر هەموومان بە تێکڕای نغرۆ و نقوم کردن.

وە فەرموویەتی : قَوْمًا غَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ {الممتحنة/١٣}

واتە: خوای گەورە ڕق و خەشمی خۆی لێگرتوون ، لە ئینسانی خراپ و خوانەناس .

وە فەرمورویەتی : يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ وَيُدْعَوْنَ إِلَى السُّجُودِ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ {القلم/٤٢} واتــە: ئـەو رۆژەی (واتــە ڕۆژی بــەرێ) کـە پـەردە لەســەر لاقــەکان هەڵدەماڵدرێن، واتە بەهۆی لێپرسینەوەی خـوای گـەورە لەبەنـدەکانی هـەموو ڕزاو نهێنی یەکان ئاشکرا دەکرێن ، وە داوا لەو کەسانە دەکرێ کڕنۆش بـۆ خـوای گـەورە ببەن، کە لە دونیادا سوژدەیان نەبردوە، بۆیە ناتوانن سوژدە ببەن، چونکە پێشتر لـە دونیادا نەیان بردوە[19]

اللَّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ هُو الْحَيُّ الْقَيُّومُ {آل عمران/٢}

واتە: ئەو خوایە خوایەکە ، هیچ خوایەکی تری جگە لەو نیە، ئەو خوایــە هەمیشــە زیندوو بەهێز و دەسەڵاتدارە بەسەرهەموو بوونەوەردا.

وە چەندان ئایەتی تر لەو بارەیەو لەسەر سیفاتەکانی خوای گەورە هاتوون.

ئەهلی سوننە و جەماعە: بڕوایان وایە کە لـە ڕۆژی دوایـی دا بـڕواداران بــە چــاوی خۆیان خوای بینەر دەبیـنن، وە دیدەنی دەکەن و قسە و گفتوگـۆی لەگەڵـدا دەکـەن، هەروەك دەفەرموێ: وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ {القيامة/٢٢}

---

* بڕوا پێ بوونیشی واجبە، چونکە بەلگەی قورئان و سوننەی لەسەر هاتووە.
* پرسیار لێ کردنیشی نا پەسندە، چونکە خوای گەورە نەبێ کەس نازانێ کە چۆنە.

[19] وە خوای گەورە دەفەرموێ : يَوْمَ تُبْلَى السَّرَائِرُ {الطارق/٩}

واتە : لە ڕۆژی بەرێ پەردە لەسەر نهێنیەکان لادەدرێ و هەڵدەماڵدرێت ، رازو نیسازو نهێنیـەکان ئاشکرا دەکرێن لە لایەن خوای گەورەو دادگەر وەرگێر.

واتە: لە ڕۆژی دواییدا چەند دەموو چاوانێك هەن کە سەیری خوای گەورە دەکەن

وە پێغەمبەر یش (ﷺ) دەفەرمووێ:

(إنكم سترون ربكم كَما ترون القَمر ليلة البدر، لا تضامون في رؤيته...) متفق عليه.

واتە: لەمـەودوا (لـە ڕۆژی دوایـی دا) ئێـوەی بـڕواداران خـوای خۆتـان دەبیـنن هـەروەك مانگی شەوی چواردە دەبینن، وە دیتنەکەتان لـێ گـوم نابـێ و لـە دیـتنی هـەرگیز تێـر نابن[20]

وە فەرموویەتی: ( ينزل ربنا الى السماء الدنيا كل ليلة حين يبقي ثلث الليـل الآخر، فيقول: من يدعوني فأستجيب له؟ من يسألني فأعطيه؟ من يستغفر فأغفر لـه؟) متفـق عليه

واتە: پەروەردگارمان لە سێیەکی هەموو شەوێکدا دادبەزێتە ئاسمانی دونیا و دەڵـێ: کـێ داوایەکم لێ دەکا، تا داواکەی گیرا بکەم و وەڵامـی بدەمـەوە؟ وەکـێ داوای شـتێکم لـێ دەکا تا پێی بدەم؟ وە کێ داوای لێخۆش بوونم لێ دەکا تا لێی ببورم؟

ئەم جۆرە دابەزینە هەق و ڕاستە، بەڵام بە جۆرێ کە لە خـۆی دەوەشـێتەوەودەیزانێ ، وە ئەهلی سوننە بڕوایان وایە کە خوای گەورە لە ڕۆژی دوایی دێ بۆ ڕۆژی لێپرسـینەوە، بـۆ

[20] وە پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرمووێ :

( ما منكم من احد إلا سيكلمه ربهُ، ليس بينه وبينه ترجمان) جامع الصـغير/٥٧٩٨ و بخـاري/ ج٦٠، ص٢٧٢٩، رقم/ ٧٩٧٤.

واتە: لەڕۆژی دوایی هەریەکێك لە بڕوادارە بەهەشتیەکان خوای گەورە قسـەی لەگەڵدا دەکـا بـەبێ ئەوە کە لە نێوان ئەو و خوای گەورە دا پەردە و وەرگێر هەبێ تا لێکیان تێ بگێنێ وەرگێر.

ئەوەی جودابونەوە لە نێوان بەندە پاك و پیسـەکانی خۆیدا بکـا، بـەڵام بـە هاتنێـك کـە تەنها لە خۆی دەوەشێتەوە، وە خوای گەورە دەفەرموێ :

وَجَاء رَبُّك وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا {الفجر/٢٢}

واتە: نەخێر وەها نیە وەك ئێوە بیری لێ دەکەنەوە، بەڵکو کاتێ کـە زەوی بەلـەت بـوون لەت دەبێ، وە فەرمانی پەروەردگارت دەگا و جێ بەجێ دەبێ و، کاتێ فریشتەکان بەڕێز لە خزمەت فەرمانی خوای گەورە ڕادەوەستن، ئەوسا بێدار دەبنەوەو تێ دەگەن

وە دەفەرمووێ : هَلْ يَنظُرُونَ إِلاَّ أَن يَأْتِيَهُمُ اللّهُ فِي ظُلَلٍ مِّنَ الْغَمَامِ وَالْمَلآئِكَةُ وَقُضِيَ الأَمْرُ وَإِلَى اللّه تُرْجَعُ الامور {البقرة/٢١٠}

واتە: ئایە ئەوانە چاوەڕوانن کە لە ناو پاچە هەورەکان خوای گەورەو فریشتەکانیان بۆ بێ و، کارەکە کۆتایی پێ بێ ، ئاگاداربن هەموو کارێك هەربۆلای خوای گەروە دەگەڕێتـەوە و کۆتایی پێ دێت

بەرنامە و ڕێبازی ئەهلی سوننە و جەماعە لە هەموو ئەو بوارانە تەنها خۆبەدەستەوەدان و گوێڕایەلی یە بۆ فەرمان و دەقەکانی خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی(ﷺ).

هەروەك ئیمامی زوهری دەڵێ: لەلایەن خواوە تەنها پەیام ناردنە، وە ڕاگەیاندنیش لەسەر پێغەمبەرە (ﷺ)، وە لەسـەر ئێمـەش تـەنها جـێ بـەجێ کـردن و خۆبەدەسـتەوەدانو پەیڕەوی لێکردنە.

وە پێشەوا سوفیانی کوڕی عویەینە دەڵـێ: هـەموو شـتێك لـە قورئـانی پیـرۆزدا بـەپێی ئەوەیە کە خـوای گـەورە خـۆی پێناسـەی کـردوە و لەسـەر ئێمـەش تـەنها خوێندنـەوە و

لێکدانەوە و کار پێ کردنیەتی، ئەگینا زۆر شت (ئێمە) نایزانین کە چۆنە و، نموونەی ئـەو قورئانەش نی یە

وە ئیمامی شافیعی ( ڕەزای خوای لێ بێ ) دەفەرمووێ : بڕوای تەواوم هەیـە بـە خـوای گەورە و هەر شتێ کە لەوەوە هاتوە بەپێی مانا و ویستی خـوای گـەورە، وە بڕواشـم بـە پێغەمبەر (ﷺ) ی خوا و بـە هـەر شـتێك هەیـە کـە لـەوەوە هـاتووە بـە پێـی مانـا و مەبەستی ئەو.

وە وە لیدی کوڕی موسلەم دەڵێ: پرسـیارم لـە ئیمـامی (سـوفیان و ئـەوزاعی و مـالکی کوڕی ئەنەس) کرد لەو فەرموودانە دەربارەی سیفەتەکان و دیتنی خـوای بەدیهێنـەر لـە وەڵامدا گووتیان: بڕوات پێ هەبن وکاریان پێ بکە وەك هاتوون، بەبێ چۆنیەتی (کیفیـة) ە کەی

وە ئیمامی مالکی کـوڕی ئەنـەس دەفـەرموێ: ئاگاتـان لـە خۆتـان بـێ و لـە بیدعـەکان دوربکەنەوە، یەکێك گووتی بیدعەکان کامانەن؟ مالیك فەرمووی: ئەهلی بیدعە ئەوانەن کە قسە لە بارەی (ناو و سیفات و قسە و توانا و زانست و ئەندام...)ەکانی خوای گەورە دەکەن و، بێ دەنگ نابن لەسەر ئەوەی کە سەحابە و تابیعینەکان بـێ دەنگییـان لەسـەر کردوە.

یەکێك لە بارەی ئایەتی الرَّحْمَن عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى {طـه/٥} پرسـیاری لـە ئیمـامی مالیك کرد و گووتی: خوا چۆن لەسـەر عـەرش وەسـتاوە، ئیمـام لـە وەڵامیـدا گـووتی: (الإستواء غير مجهول، وكيف غير معقول، والإيمان به واجب، والسـؤال عنـه بدعـة، ومـا أراك إلاّ ضالاً).

واتە : وەستانو جێگیر بوونی خوای گەورە لەسەر تەختو بارەگـای بـەرزو بلـنـد شـتێکی زانراوە، چۆنیەتیەکەی نادیـارو نـەزانراوەو بەرئـەقل و زانسـت ناکـەوێت، کەچـی بڕواپـێ بوونیشی واجبێکی شەرعییە، پرسیار لێکردنیشی بیدعەیە ، ئەگەر وابکرێ مرۆڤـی پـێ گومڕا دەبێ   ئەوسا ئیمام فەرمانی بە پیاوە پرسیارکەرەکە کـرد لـەو کـۆڕ و مەجلیسـە بچێتە دەرێ و ئەوێ جێ بهێلێتو لەسەر ئەوە سورنەبێت

وەرگێر : وشەی إستواء (١٢) جار لە قورئانی پیرۆز دا هاتووە

وەئیمامی ئەبوحەنیفە رەزاورەحمەتی خوای گەورەی لێ بێ دەفەرمووێ :

**لاينبغي لأحد ، أن ينطق في ذات الله بشئ ، بل يصفه بما وصف به نفسه ، ولايقول فيه برأيه شيأ تبارك الله رب العالمين . شرح العقيدة الطحاوية .**

واتە : بۆهیچ کەسێ نی یە کەبەهیچ شێوە و شتێك قسە لەخودی خوای گەورە بکا ، بەلکو دەبێ تەنها بەو شێوەیە باس وپێناسە ( وصف ) ی خوا ی گەورە بکا کە بۆخۆی باسی خۆی کردوە و   بریاری داوە، وە نابێ بە رەیی خۆی هیچ شتێك بلێ چونکە خوای گەورە هەمیشە بەرزو بلندوبێ خەوشو پایەدارە و پەروەردگاری هەموو خەلك وجیهانو بوونەوەرە

وە ئیمامی ئەبوحەنیفە رەزاورەحمەتی خوای گەورەی لێ بێ لە فەرموودەیەکی تریدا دەفەرمووێ :

**من أنكر أن الله ( عز وجل ) في السماء فقد كفر . إمام ذهبي لة كتيَبى (العلو للعلي الغفار) باسى كردوه**

**واتە** : هەرکەسێك بەرهەلستی ئەوە بکا کە خوای گەورەو میهرەبان لە ئاسمانە ، کـوفری کردوە

وەکاتێ کەلەبارەی دابەزینی خوای گەورە بۆ ئاسمانی دونیا پرسـیاری لێ کـرا، لەوەلاّمـدا گووتی : خوای بێ وێنە (دادەبەزێ ، بەلاّم بەبێ زانینی چۆنیەتی دابەزینی

وە ئیمامی حافز فەرموویەتی : **من شبه الله بخلقه فقد كفر ، ومن أنكر ما وصف به نفسه فقد كفر ، وليس فيما وصف به نفسه ولا رسوله تشبيها إمام ذهبي لة كتێبی (العلو للعلي الغفار) باسی کردوە**

واتە : هەر کەسێك خوای گەورە وە دروستکراوەکانی خۆی بچوێنێ کوفری کـردووە ، وە هەر کەسێك بەرهەلستی ئەوە بکا کە خوای گەورە پێناسەی خـۆی پـێ کـردووە کـوفری کـردووە ، چـونکە وێچـوندان لـە وە دانیــە کــە خــوای گــەورە و پێغەمبەرەکـەی ( ﷺ) پێناسەی خوای گەورە دەکەن

وەهەندێ لەپێشینەکان سەبارەت بە بڕوابون بەخوای گەورە گوتویانە

( قدم الإسلام لا تثبت إلا على قنطرة التسليم )

**واتە** : پێ و پایەکانی ئیسلامەتی ئینسـان راگـیرو جـێگیر نابێـتو دانامــەزرێت تــەنها لەسەرشێوەو پردی خۆ بەدەستەوەدان نەبێ[21]

واتە : دەبێ ئینسان بڕوای تەواوی بەوە بێ کە خوای گـەورەو پێغەمەرەکـەی دەفـەرموون دەنا ئیمانی تەواو نابێو دانامەزرێت.

---

[21] واتە : نابێ هەرگیز ئادەمیزاد ڕەیی خۆی تێکەڵ بەدەق و بنچینەکانی ئیسلام بکاو نکۆلی و لامل یان لێ بکا ، بیان زانێ یان ن ئاء ، نابێ دودڵیوگومانیـان لێ بکـا ، بـڕوای تـەواو نابـێ تـا خـۆی تەسلیمی ئیسلام نەکا. وەرگێر

بۆیە : هەر کەسێ کە بەرنامە و ڕێبازگەی سەلەف دەگرێتە بەر لەرووی خواناسیو نـاو و سیفەتەکانیەوە ، ئەوە ئەو کەسە پابەندە بە بەرنامە و ڕێبازی قورئانی پـیرۆزو سـوننەتی بەپیزەوە با ئەو کەسە لەسەردەمی پێشینە بێ یالەسەردەمەکانی دادێ ، بەتەنیابێ یـا لەگەڵ کۆمەڵی موسلمانان.

وەبەپێچەوانەوە هەر کەسێ کە بـە پێچـەوانەی بەرنامە و ڕێبـازی سـەلەف بـێ لـەرووی کرداروپەیڕەوو بەرنامەیانەوە ، ئەو کەسە پەیوەست نی یـە بەبەرنامـەی پـاکی قورئـانو سوننە ، بالەسەردەمی (سەلەف) و ( هاوەڵ و تابعین ) ەکانیش بێت

# پایەی دووەم : بڕوا بوون بەفریشتەکانی خوای گەورە

## ( الركن الثاني : الإيمان بالملائكة )

**بریتییە لە :** بڕوابـوون بـە هـەبوونی فریشـتە بەبڕوایـەکی تێـرو تـەواو کـە هـیچ شـەك و گومانی تێدانەبێ ، بۆیە هەر کەسێ بڕوای تەواوی بـەبوونی فریشـتە نـەبێ ، پێـی کـافر دەبێ ، لەبەر ئەوەی خوای گەورە دەفەرموێ :

آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ من رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَـنَ بِاللّـه وَمَلآئِكَتـه وَكُتُبِـه وَرُسُـله لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ من رُّسُله {البقرة/٢٨٥}

واتە : پێغەمبەری خوای گەورە و ئیماندارانیش هەمویان بە تێکرا ئیمانیـان بـەوە هەیـە کـە لـە لای خـوای گـەورە بـۆ لای پێغەمبـەر دابـەزیووە ، هـەموویان بـڕوای تـەواو و نەگۆڕیان بە خوای گەورە و بە فریشـتەکانی و بـە هـەموو پـەر توکـەکانی و بـە هـەموو پێغەمبەرەکانی هەیە و، لە رووی بڕوا پێ بوونیانەوە جیاوازی لە نێوان هـیچ یـەکێك لـە پێغەمبەرەکانی دا ناکەین وە دەفەرمووێ :

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ آمِنُواْ بِاللّهِ ورسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي نَـزَّلَ عَلَـى رسـولِهِ وَالْكِتَـابِ الَّـذِي أَنزَلَ مِن قَبْلُ وَمَن يَكْفُرْ بِاللّهِ وَمَلاَئِكَته وكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلاَلاً بعِيـداً {النساء/١٣٦}

واتە : ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە بڕوا بێنن بە خوای گەورەوبـە پێغەمبەرەکـەی و بەو پەرتوکەی کەبۆ پێغەمبەرەکەی دابەزیووەو بەوپەرتووکەی لـە پێشـتریش دابـەزیووە،

هەرکەسێ بەرانبەر بـە (خـوای هـەر هـەبوو) و فریشـتە و پـەرتووك و پەیامبـەرەکانی و ڕۆژی دوایی بێ باوەڕ بێ ، ئەو کەسە زۆر گومڕا بوە و دورکەوتۆتەوە لەدین

**ئەهلی سوننەو جەماعە :** بڕوایان بەبوونی فریشیتە هەیە ، بەچـەند کەسـێکی هەسـت پێکـراوی نابەرجەسـتەیان لەقەڵـەم دەدەن، نـەك تـەنها بەشـتێکی مانـەوی و نـەزانراو ، بەڵکو ئەوانیش دروستکراوێکن لەدروستکراوەکانی خوای کردگار کەلـە رونـاهی ( نـور ) دروستی کردوون ، وەلەئاسمان جێگیر و نیشتەجێن ، هەندێکیان بۆکاری پێویسـتی خـوای گەورە دادەبەزنە سەر زەوی و کاروبارەکانی خوای گەورە جێ بەجێ دەکەن.

**فریشتەکان :** دروستکراوێکی گرنگ و گەورەی خوان ، باڵیان هەیە کە پێی دەڕۆنودەفڕن ، ئی وایان هەیە دووباڵ یا سێ باڵ یان چوار باڵی هەیە ، ئی واشیان هەیە زیاتری هەیـە پێیان دەفڕن

**فریشتەکان :** سەربازێکن لەسەر بازەکانی خوای پەروەردگار [22]، بەفەرمانی خوای گـەورە توانایان هەیە کە خۆیان وەك شت و کەسێکی دونیا هاو شێوە بکەن و بەشێوەی لاشـەیی (جسمی) خۆیان ببەنە سەرشێوەو روخساری خەڵکی دونیا بـەپێی ئـەو بارودۆخـەی کـەوا دەخوازێ و خوای گەورە پێیان دەسپێرێ و روخسەتی داون

---

[22] خوای گەورەش سەبارەت بە سەربازەکانی خۆی دەفەرموێ

وَمَا يَعْلَمُ جنودَ رَبِّك إِلَّا هو وَمَا هِيَ إِلَّا ذِكْرَى لِلْبَشَرِ {المدثر/٣١}

واتە : ئەی موحەممەد کەس ژمارەی سەربازانی خوای گـەورە نـازانێ چـەندن ، تـەنها خـۆی نـە بـێ، هێندە زۆرن

**فریشتەکان :** لەخوای گەورە زۆر نزیکو ڕێزگیراون ، نەبەنێر نەبـە مـێ پێناسـە نـاکرێن ، زاوزێ و ژن و ژنخوازی ناکەن ، ناخۆن و ناخۆنەوە ، بەڵکو خۆراکی ئەوان تـەنها تاکانـەو پاکانـە (تسـبیحات) کردنـی خـوای گەورەیـە ، ئـارەزوو بۆشـتی خراپودونیـا ناکـەن ، گوناهوتاوانو درۆو بوهتـان ناکـەن ، مانـدو نـابن و ناخـەون ، سەرپێچـی خـوای گـەورە ناکەن، بەڵکو بەپێچەوانەوە تەنها بە ( چاکە و شەرم و حەیا و جـوانی و ڕێـك و پێکـیو بەئاگایی هتد ) پێناسە دەکرێنوگوێرائیەلی خوای گەورە دەکەن

**فریشتەکان :** لەگەڵ ئادەمیزاد جیان ، لەلایـەن خـوای گـەورە لەسـەرگوێرایەڵی و گونـاه نەکردن و پەیوەست بوونەوە دروستکراون ، خوای گەورە لەپێناو پەرستنی خۆی و بۆ جـێ بە جێ کردنی کارو فرمانەکانی خـۆی دروسـتی کـردونو بـەکاریان دێنێـت وەك خـوای گەورە دەفەرمووێ :

وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَن وَلَدًا سُبْحَانَهُ بَلْ عِبادٌ مُّكْرَمُونَ { ٢٦} لَا يسْبِقُونَهُ بِالْقَوْلِ وَهُم بِأَمْرِهِ يَعْمَلُونَ { ٢٧} يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ارْتَضَى وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِ مشْفِقُونَ {الأنبياء/٢٨}

**واتە : بێباوەڕان گوتیان خوای گەورە فریشتەکانی کردووە بە کوڕی خۆی ، خوای گەورە لەوە پاکە ، فریشتەکان کوڕی خوای گەورە نین ، بەڵکو بەندەی ڕێز لـێگیراو و فرمـان پێکراوی خوای گەورەن ، سەر پێچی و بێ فرمانی خوای گەورە ناکەن ، بە هیچ شێوەو قسەیەك وە پـێش خـوای گـەورە ناکـەون ، بـەلکو بـە فرمـان و بڕیـاری خـوای گـەورە کاردەکەن ، خوای گەورە ئەوەی لە نێوان و لەبەر دەستی فریشتەکاندایە لە دونیاو ئەوەی لە پشتەوە و لە دواوەیا لە دوارۆژدادەیزانێت ، فریشتەکان تکای لێخۆشبوون بـۆ هـیچ**

کەس ناکەن ، تەنهابۆ کەسێك نەبێ کە خوای گەورە لێ ی ڕازی یە ، فریشـتەکان لـە ترس و خەشم و هەیبەتی خوای گەورە دا نغرۆ بوونەوەو زۆر دەترسن .

وە دەفەرمووێ : قَالُواْ سُبْحَانَكَ لاَ عِلْمَ لَنَا إِلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ {البقرة/٣٢}

واتە : کاتێ کە خوای گەورە حەزرەتی ئادەمی دروستکرد ، فرمانی بە فریشتەکان کرد کڕنۆشی ڕێزی بۆ ببەن ، .. دواتر فریشتەکان گوتیان : پاك و بـێ گـەردی بـۆ تـۆ ئـەی پەروەردگارە ، ئێمە هیچ زانست و زانیاریەکمان نیە تـەنها ئـەوە نـەبێ کـە تـۆ فێـرت کردووین ، بەڕاستی تۆ زۆر زاناو دانایت .

وە پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرمووێ :

لا تدخل الملائكة بيتا فيه كلب ولا صورة .متفق عليه .

واتە : فریشتەکانی خوای گەروە ناچنە ماڵێك کە سەگ و وێنەی تێدا بێت .

وە پێغەمبە (ﷺ) دەفەرمووێ :

لا تصحب الملائكة رفقة فيها كلب ، ولا جرس . مسلم .

واتە : فریشتەکانی خوای گەروە شوێنێك ناکەنە هاوڕێ ی خۆیان کـە سـەگ و زەنگـی تێدا بێت .

ئەهلی سوننە و جەماعە : بڕوایان وایە کە خوای گەورە و میهرەبان فریشتەکانی لە ئێمە گومکردووە و، لەسەر ئەو شێوەیە نایان بینین کە خوای گەورەە دروستیکردوون ، بەڵکو تەنها بـۆ هەنـدێ لـە بەنـدەکانی خـۆی ئاشـکرای کـردوون ، هـەروەك دوو جـار

**پێغەمبەر (ﷺ) حەزرەتی جبریلی لەسەر شێوەی خۆی دیت کـە خـوای گـەورە لەسـەر دروستکردووە . وەك خوای گەورە دەفەرمووی :**

وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى {١٣} عِندَ سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى {النجم/١٤}

**واتە : ئەی خەڵکینە ئاگادار بن ، ، سوێند بەخوا جارێکی تر پێغەمبەر (ﷺ) حەزرەتی جبریلی فریشتەی سروش هێنی لە لای درەختی سیدرەت و لموتتەها لە ئاسمان بینیوە .**

وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجْنُونٍ {٢٢} وَلَقَدْ رَآهُ بِالْأُفُقِ الْمُبِينِ {التكوير/٢٣}

**واتە : ئەی خەڵکینە ئاگادار بن ، هاوڕێکـەتان کـە پێغەمبـەرە شـێت نیـە وەك ئێـوە دەڵێن، سوێند بەخوا حەزرەتی جبریلی فریشتەی سروش هێنی لە ئاسۆیەکی بەرزی روون دا بینیوە .**

**فریشتەکان :** بەشەوو بەرۆژ تاکانەو پاکانە ( تسبیحات ) ی خـوای پـاك و بـێ خـەوش دەکەن و لەئاسماندا بەدەوری ماڵی ئاوا ( بیت المعمور ) دا دەخولێنەوە ، وەزۆر لە خـوای گەورە دەترسن، هەرگیز لاملیو سەرە خەریو سەرپێچی خوای گەورە ناکەن

ئەهلی سوننە و جەماعە : بـەو شـێوەیە بـڕوای تـەواوو نـەگۆڕیان بەهەموونـەو شـتانەی فریشتەکان هەیە کە دەقو بەلگەی راستو دروستیان لەسـەرە، وە بەهەنـدێ لەوانـەیش کەخواو پێغەمبەرەکەی ناویان بردون بەم شێوەیە کە

جبریلْ فەرمانبەر و کارپێ سپاردراو (موکل) ە بەهێنانی سروش لەلایەن خواوە [٢٣]

---

[٢٣] وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ ۞ عَلَى قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ الْمُنذِرِينَ {الشعراء/١٩٤}

وە میکائل کارو باری بارانی پێ سپاردراوە[24]، وە ئیسرافیل کـاری فـوکردنی بەکەڕانـەدا ( الـنفخ فی الصـور) ی پـێ سـپاردراوە[25]، وە مەلەکولـەوت ئـەرکی گیـان کێشـانەکان ( قــبض الأرواح ) ی پـێ سـپێردراوە[26]، وەمالیــك دەرگــەوانی دۆزەخــە[27] وە رەزوان

واتــە : ئـەی پێغەمبـەر (ﷺ) فریشـتە جبریـل ( سـەلامی خـوای لـێ بـێ ) بـە قورئـانی پـیرۆزەوە دابەزیتەسەر دلی تۆ ، بۆ ئەوەی ئاگادارت بکاتەوە لەمەبەستەکانی خوای گەورە وەرگێڕ.

[24] ناوی میکائیل لەقورئاندا هاتوە ، وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

من كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ وَمَلآئِكَتِهِ وَرُسُلِهِ وجِبْرِيلَ ومِيكَالَ فَإِنَّ اللّهَ عَدُوٌّ لِّلْكَافِرِينَ {البقرة/٩٨}

واتە : هـەر کەسێك دوژمنـی خـوای گـەورەو فریشـتەکانیو پێغەمبـەرەکانیو فریشـتە جبریـلو میکایل بێ ، خوای گەورەش دوژمنی ئەوان و بێ باوەڕەکانە . وەرگێڕ

[25] وەك پێغەمبەر (ﷺ) لەمیانەی ناوی فریشتە جبریل و میکایل ناوی فریشتە ئیسرافیلیش دەبـا و دەفەرموێ :

( اللهم رب جبريل و ميكال و إسرافيل فاطر السموات والأرض عالم الغيب و الشهادة أنت تحكم بـين عبادك فيما كانوا فيه يختلفون ...) مسند ئیمام احمد / ج٦ ، ص ١٥٦ ، رقم / ٢٥٢٦٦

واتــە: ئەی پەروەردگاری فریشتە جبریل و میکایل و ئیسرافیل و دروستکەری ئاسمانـەکان و زەویو، زاناو پەیدارو ئاگاداری جیهانی دیارو نادیار ، تۆ فـەرمانرەواو دادوەری لـەنێوان بەنـدەکانی خۆتـدا دەکەی سەبارەت بەو شتانەی تێدا دەکەونە کێشە و گیرو گرفتو ناکۆکی وەرگێڕ

[26] ئەو فریشتیە لە کوردەواری پێی دەوترێ (عزرائیل) بەڵام بەوە ناوی لەقورئان و سوننەدا نەهاتووە وەرگێڕ.

[27] ئەم فریشتیە (مالیك) ناوی لەقورئاندا هاتوە ، وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

( وَنَادَوْا يَا مَالِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ قَالَ إِنَّكُم مَّاكِثُونَ ﴿الزخرف : ٧٧﴾

دەرگەوانی بەهەشتە [28]، وە فریشتەکانی لێپرسینەوەی مردو لەناو گۆڕدا نـاوی ( نکـیر و منکر) ن [29] سەلامی خوای گەورەیان لێبێت

---

واتە  کاتێ دۆزەخیەکان لە نێو دۆزەخدا تەنگاوو هەراسان دەبن ، بـە مـالیکی دەرگـەوان دەلـێن : ئەی مالیك دە داوامان بۆ لە خوای گەورە بکە با بڕیارێکمان بۆ بداو لەم بارو دۆخەم رزگارمان بکا ، ئەویش لە وەلامو دەرەنجامدا پێیان دەلێ : ئێوە چارەنوستان لێرە دەمێننەوە  وەرگێر.

[28] رەزوان لەهەندێ فەرمودەدا ئاماژەی پێکراوە ، وەك لەکتێبی بیدایە لەبەرگی یەك لاپەرەی (٥٣) باس دەکات  وەرگێر.

[29] ئەم دوو فریشتەیەش لەبارەی پرسیار لێکردنی ناو گۆڕ ناویان لەفەرموودەدا هاتووە  وەرگێر

٧ وەك خوای گەورە دەفەرموێ : وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَانِيَةٌ {الحاقة/١٧}

واتە : لەو رۆژەدا هەشت فریشتەی رێزدارو بەتوانا تەختو بارەگای خـوای گـەورە لەسـەروی ئـەوان هەلدەگرن  وەرگێر.

ئەو دوو فریشتەیەش بەفەرمانی خوای گەورە هەمیشە لەگەل ئینسان دان بۆ تۆمـارکردنی کاروبـارو کردوەکانی ، وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

إِذْ يَتَلَقَّى الْمُتَلَقِّيَانِ عَنِ الْيَمِينِ وَعَنِ الشِّمَالِ قَعِيدٌ ۞ مَا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ {ق/١٨}

واتـە : دوو فریشتە بەناوی رەقیب و عەتید لە سـەر شـانی ئینسـان لـە لای راسـت و لـەلای چـەپی دانیشتوون ، هەر شتێك ئینسان بیکـاو بیلـێ ، بـە فرمـانی خـوای گـەورە کـەموکوری و دواکـەوتن دەینوسن .و وەرگێر

## فریشتەکان زۆر جۆریان هەن :

**بۆ وێنە :** هەندێ لەوانە هەڵگری تەخت و بارەگا (عـەرش) ی خوای گەورەن[٣٠] ، وەهەنـدێ تایبەتن بەنگاوسروش ( وحـی ) هێنـان بـۆ پێغەمبـەران ( علـیهم السـلام ) ، وەهەنـدێ تایبــەتن بــەکار و بــاری چــیاکان ، وە هەنــدێ دەرگــەوان و پاســەوانی دۆزەخ و هەنــدێ دەرگەوانی بەهەشتن ، وەهەنـدێ کـارو کـردوەی بەنـدەکانی خـوای گـەورە دەرز و تۆمـار دەکەنو دەیان پارێزن[٣١] ، وەهەندێ تایبەتن بەگیان کێشانی بروادااران ، وەهەندێ تایبــەتن

---

[٨] هەروەك فریشتەکان سەلامی خوای گەورەیان لەسەر بێت ، پێغەمبەر ئادەم (علیه السلام) یان شت و بن خاکیان کرد ، و پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ :

( لما توفي أدم غسلته الملائكة بالماء الوتر و الحدوا له قالوا : هذه سنة ادم في ولده ) صحيح الجامع .

**واتە :** کاتێ کە حەزرەتی ئادەم سەلامی خوای گەورەی لەسەر بێت وەفاتی کرد، فریشتەکان بـەئاوی وەتر شتیان ، وە لەژێرگۆڕدا شاردیانەوە و ژێر خاکیانکرد و، گوتیان : ئائەمــە ســوننەت و سروشــتی حەزرەتی ئادەمە لە نێو وەچەو رۆلەکانیدا

وە فریشتەکان سـەحابە حەنزەلە یان شت وەك پێغەمبـەر ( ﷺ) دەفەرموێ :

( **إن صاحبكم تغسله الملائكة** ) واتە : هاورێکەتان حەنزەلە فریشتەکان دە یشۆن . وەرگێر.

[٩] وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ :

( إن لله ملائكة يطوفون في الطرق يلتمسون أهل الذكر فإذا وجدوا قوما يذكورن الله تعالى ، تنادوا هلموا إلى حاجتكم، قال فيخفونهم بأجنحتهم إلى السماء الدنيا) بخاری / ج ٥ ، ص ٢٣٥٣، رقـم/ ٦٠٤٥

**واتە :** خوای گەورە چەند فریشتەیەکی هەن کـە لەسـەر ڕێگـە و بانـەکان دەخولێنـەوەو ، بەخـەلکی زیکرکەر دەگەن ، لە کۆروکۆبوونەوەی ئەوکەسانە دادەنیشن کە زیکرو یادی خـوای گـەورە دەکـەن ،

بەدەرهێنانی گیانی بێ باوەڕان ، وەهەندێ لەنێو گۆڕدا پرسار لەبەندە مردوەکان دەکەن، وەهەندێ داوای لێخۆشبوون لەخوای گەورە بۆ بڕواداران دەکەن و خۆشیان دەوێن و نوێژیان لەسەر دەکەن[32] ، وەهەندێ لە کۆڕوکۆبوونەوەی زانست و ئەلقەکانی زیکردن دادەنیشن و لەلایەن خوای گەورەوە گەواهی بۆ بکەرەکان یان دەدەن [33] وەهەندێ باڵەکانیان بۆ ئیمانداران رادەکێشن و بەیارمەتی خوای گەورە لەکاتی تەنگانە بەهانا و هاواریان دەچن ، وە هەندێ هاوەڵ ( قرین ) ن بۆمرۆڤەکان و لێیان جیانابنەوە و

---

کاتێ کە خەڵکێك دەدۆزنەوە کە زیکرویادی خوای گەورە دەکەن ، بانگ دەکەن و دەڵێن : وەرنە لای پێداویستیتان کە زیکرکردنە ، دەڵێ : لەئاسمانی دونیا باڵی خۆیان بەسەر دادێنن و بە باڵی خۆیان دایان دەپۆشن

یا دەفەرمووێ: ( وما اجتمع قوم فی بیت من بیوت الله یتلون کتا ب الله ویتدارسونه بینهم إلا نزلت علیهم السکینة وغشیتهم الرحمة. وحفتهم الملائکة، وذکرهم الله فمن عنده)

**واتە** هەر خەڵکێك لە ماڵێك لە ماڵەکانی خوای گەورە کۆ ببێتەوە ، پەرتووکی خوای گەورە بخوێنن و ، لە نێوانخۆیاندا شیبکەنەوە ، هۆگری و دڵ نەواییان دادەبەزێتە سەر و ، سۆز و بەزەیی دایان دەپۆشێت ، فریشتەکانی خوای گەورە دەورەیان دەدەن ، خوای گەورە لای خۆی باس و یادیان دەکات .

وە دەفەرمووێ: ( إن الملائکة لتضع أجنحتها لطالب العلم رضا بما یطلب) سنن الصغری، ج١/ ص ١٠٣، رقم / ١٣٠

**واتە** : فریشتەکانی خوای گەورە شاباڵی خۆیان بۆ فێرخوازانی زانست و زانیاری شەرعی و ڕەوا رادەخەن ، لەبەر رەوایی و ڕازیبوونیان بە و زانست و زانیارییەی کە داوای دەکەن و فێری دەبن

وە چەندان فەرموودەی تر لەم بارەیەوە هەن. وەرگێڕ.

هەمیشە لەگـەڵیان دان [٢٤] وەهەنـدێ بـانگی بەنـدەكان دەكـەن بـۆ چـاكەكردن و ڕێنمـایی كردن، وەهەنـدێ لەگـەڵ مـردووی چـاكەكاردا دەڕۆن بـۆ سـەر گۆرسـتان و هەڵوەسـتەیان لەسـەر دەكـەن [٢٥]، وەهەنـدێ لەگـەڵ مـردووی خراپـەكاردا دەڕۆن بـۆ سـەر گۆرسـتان ، وەهەندێ لەگەڵ ئیمانداران دەجەنگن و هاوكاریان دەكەن لەدژی دوژمنانی خوای نەمر وەهەنـدێ لەوانـە تایبـەتن بـەپارێزیاری كردنـی پیاوچـاكان و خـەم لەسـەر لابردیـان ، وەهەندێك یان نەفرەت لە بێ باوەران دەكەن و سزا و عەزاب دادەبزێننە سەریان

**فریشتەكان :** ناچنە ماڵێك كە ( پەیكەر یا وێنە یا سەگ یا زەنگ ( جرس ) ی لێ بێت ، وەئازار دەخۆن بەوەی كە هەندێ ئادەمیزاد ئازاری پێ دەخۆن

---

[٢٤] وەك پێغەمبەری خوای گەورە (ﷺ) دەفەرموێ :

( مامنكم من أحد إلا وقد وكّل به قرينة من الجن و قرينة من الملائكة ...) مسلم

**واته :** هەریەكێك لە ئێوە هاوەڵو هاوبەشێكی لە جینو لە فریشتە لەگەڵە. وەرگێر.

[٢٥] وەك پێغەمبەر (ﷺ) جاری واهەبوو لەگەڵ جەنازەی سەحابەیەك كەدەچوو ە سەر گۆرسـتان خـۆی دەپاراست لەفریشتەكان تا ئەزیەتیان نـەدا لەوانـەی كـە لەگـەڵ ئـەو جەنازەیـە دەڕۆیشـتن ، بۆوێنـە پێغەمبەر (ﷺ) سەبارەت بەمردنی سـەعد دەفەرموێ :

(هذا الذي تحرك له العرش و فتحت له ابواب السماء و شهده سبعون ألفاً من الملائكة لقد ضم ضـمة ثم فرج عنه) صحيح الجامع/٦/٧٢.

**واتـه :** ئا ئەوە ئەو كەسەیە كە تەختو بارەگای بۆ لەرزا كاتـێ مـرد ، وە دەرگـای ئاسمانـەكانی بـۆ كرایەوە بۆ پێشوازی لێكردنی ، وە حەفتا فریشتە لەسەر تەرمو لە ناشتنی ئامادە بوون وەرگێر

**فریشـتەکان :** ژمارەیـان ئێجگـار زۆرە و ، کەسـیش ژمارەیـان نازانـێ جگـە لـەخوای شکۆدار[٣٦]

خوای گەورە فریشـتەکانی لـە ئێمـەمانان نادیـار و پـەردە پـۆش کـردون ، بۆیـە هـەرگیز لەسەر ئەو شێوەیە زانایان نایان بینن کـە خـوای گـەورە دروسـتی کـردون ، بـەڵام خـوای گەورە جار جارە بۆهەندێ لەبەندەکانی خۆی دەریان دەخـات ، هـەروەك پێغەمبـەر (ﷺ) دووجـار (جبریـل) ی دیتـوە لەسـەر ئـەو شـێوەی کـە خـوای گـەورە دروسـتی کـردووە ، بەبەلگەی ئەوەی کەخوای گەورە دەفەرموێ: وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجْنُونٍ {التكوير/٢٢}

واتــە : ئــەی خەلکینــە موحەممــەدی پێغەمبــەری هاورێتــان کەباســی خــوای گــەورەو بەرنامەکەی دەکا لەگەلتان ، راست دەکاو شێت نیە ، سوێند بەخوا موحەممەد نێردراوی خوای گەورەیەو فریشتە جبریلی لە ئاسۆیەکی ڕونو گەشدا بینیووە

---

[٣٦] پێغەمبەر (ﷺ) سەبارەت بەشمارەی فریشتەکان دەفەرموێ :

(فإذا هو يدخله في كل يوم سبعون ألف ملك لايعدون إليه أخر ما عليهم ) بخاري و مسلم .

**واتە** هەموو رۆژێك حەفتا هەزار فریشتە لە ئاسمان دەچنە نێـو مـالی ئـاوا( بيـت المعمـور) ، کـە هیچیان جارێکی تر ناگەرێنەوەو دوبارە نابنەوە واتە حەفتا هەزاری تری تازەو نـوێ دێنـە نێـوی ، هێشتا کۆتاییان پێ نایێ.

وە دەفەرموێ : يؤتي بجهنم يومئذ لها سبعون ألف زمام مع كل زمامٍ سبعون ألـف ملـك يجرونهـا بخاري /ج١،ص٢٧ ، رقم/٥٠+مسلم ، ج٤/ص٢١٨٤، رقم/٢٨٤٢.

**واتە** : لە رۆژی بەرێ فریشـتەکانی خـوای گـەورە دۆزەخ دەهێـنن کـە هـەفتا هـەزار زارو هەوسـاری هەیـە، هـەر زارو هەوسـارێکی دۆزەخ حـەفتا هـەزار فریشـتەی لەگەلـە ڕای دەکێشـن کەواتـە فریشتەکانی خوای گەورە فرەو بێ شومارن وەرگێر

# پایەی سێیەم ( الركن الثالث )

# بڕوابوون بە پەرتووکەکان ( الإيمان بالكتب )

**ئەهلی سوننە وجەماعە** : بڕوای تەواوو نەگۆڕیان وایە کە خوای گەورە چـەندان پـەرتووك وپەڕاوی بۆپێغەمبەرەکانی ناردووە (عليهم السـلام)، کـە ئـەمرو نـەهیو وەعـد وبـەڵێن وهەموو ئـەو شـتانە یـان تیـا بـووە کـەخوای گـەورە لەدروسـتکراوەکانی خـۆی ویسـتون بیکەن، وەڕێ پیشاندەر وڕوناهی (نور و هدی) ی تیابووە، وەبڕوایان وایە کە خوای گـەورە ئەو پەرتووکانەی بۆ پێغەمبەران دابەزاندوە بـۆ ڕێنمـایی وراسـتە ڕێ کردنـی مرۆڤایـەتی ..، وەك خوای گەورە سەبارەت بەوە دەفەرموێ :

آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ من رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَـنَ بِاللّـه وَمَلآئكَتـه وَكُتُبِـه وَرُسُـله لاَ نُفَـرِّقُ بَـيْنَ أَحَـدٍ مِـن رُّسُـله وَقَـالُواْ سـمِعْنَا وَأَطَعْنَـا غُفْرَانَـك رَبَّنَـا وَإِلَيْـك الْمَصِـير {البقرة/٢٨٥}

**واتــە:** پێغەمبــەری خــوای گــەورە بــڕوای تــەواوو نــەگۆڕی بــەوە هەیــە کەلەلایــەن پەروەردگاریەوە بۆی دابەزیوە کـە قورئـانی پـیرۆزە، هـەروەها ئیمنـدارانیش، هـەموویان بڕوای تەواویان بەخوای گەورەو بە فریشتەو بەسەرجەم پەیامبەرانو پەرتووکەکانی ئاسمان هەیە ، لەبڕوا پێبووندا جیاوازی لە نێوان پەرتووکەکانو پێغەمبەراندا ناکەن [1]

وە دەفەرموێ : كتَابٌ أَنزَلْنَاهُ إِلَيْك لِتُخْرِجَ النَّاس مِنَ الظُّلُمَات إِلَى النُّورِ بِإِذْنِ رَبِّهِـمْ إِلَـى صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ {إبراهيم/١}

**واتە :** ئەی موحەمەد (ﷺ) ئەم قورئانە پەرتوکێکە بۆ تۆمـان دابەزانـدووە ، بـۆ ئـەوەی بـە پشـتیوان و روخسـەتی خـوای گـەورە بـە هـۆی ئـەم قورئانـە خـەلك لـە تاریکـایی و سەرگەردانی دەربێ بەرەو روناکایی ئیسلام ، رێگای خوای زال و سوپاسکراو

کاتێ کە خوای گـەورە کتێبـەکانی تـری جگـە لـەقورئانی پـیرۆزی دابەزانـدووە، بۆخـۆی دەسـتەبەری (کفالـة) ی پاراسـتنی نـەکردون، بـەڵکو خـەڵکێك (گـەلێك) پارێزگـاری لێ کردون، ئەوانیش وەك پێویست نەیان توانیـوە چـاودێری و پارێزگاریـان لێ بکـەن ، بۆیـە نەپارێزراون ، بەڵکو گۆڕانکاری یان تیادا کراوە[37]

**قورئانی پیرۆز:** قسە و وشەو گوفتاری خوای پەروەردگاری بوونەوەرە ، کتێبێکی گـەش و ڕوون و ڕەوانی ئاشکرای خوایە ، بەرنامە و یاساو ڕێسای توندو تەواوی خوای گەورەیە ، خوا گەورە بۆ سەر پێغەمبەری خۆی (محمدی کوڕی عەبـدالله) ی دابەزانـدوە (ﷺ) تـا بـۆ ئۆمـەت ببێتـە یاسـا و دەسـتوور وبەرنامـەو پـەیرەوی ژیـان و گـوزەران ، وەخـەڵکی

---

١ ئەو پەرتووکانەش ئەمانەن : (قورئـان، تـەورات، ئینجیـل، زەبـور، صـحوفی حـەزرەتی ئیـبراهیم وموسا) لەهەموانیش گەورەتر ئەمانەن (تەورات وئینجیل وقورئان)، هەڵوەشێنەرەوە (نەسخکەرەوە) ی ئەو گەورانەش تەنها قورئانی پیرۆزە ، واتا بەهاتنی قورئان کتێبەکانی تر هەلوەشاینەوە ، لەڕوی شەرعی یەوە حوکمیان پێ ناکرێ وەرگێڕ

کەچی تا ئەمرۆش ئەم ئایینانە، (جولەکـە و گاورەکـان) چـەندان جـار ئـەو پەرتوکانـەیان گۆڕیـوەو شێواندوەو ، بەئارەزووی خۆیان چەند یاسا و بەرنامەو پەرتووكو سیستەمی دەسکردیان بـۆ خۆیـان بریارِ داوە ، کە دژی ئینجیل و تەورات و قورئانە کەچی بەناوی دین یان دونیا دەخـۆن و ئـەحزابی عەلمانی‌و دور لەدین یان دروست کردوون وەگێر.

لەگومرایی و تاریکاییەکان قوتار بکا بۆ ڕێ ی ڕاست و روناکی خۆری ئیسلام ، وەڕێنما و سەر ڕاستیان بکا بۆ ڕاستە شەقامی خوای گەورە

وەخـوای گـەورە لـەو قورئانـەدا سـەر گوزشـتە و و هـەواڵی پێشـینە و پاشـینەکانی رونکردۆتەوە ، وەچۆنیەتی دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی دەرخستووە ، وەتیایـدا ڕەواو ناڕەوا ، دەشێ و ناشێ (حەلال و حەرام) ی لێك جوێ کردۆتەوە ، وە تیایدا بنچـینەکانی ئەحکام و ئـاداب و ئاکـارو ئـەخلاق و مامەڵـە و خواپەرسـتی کـردن و ژیـان و سـەرگوز شتەی پێغەبەران و پیاو چاکان و خێر و پاداشتی شتی دوارۆژی بڕواداران و بـێ بـاوەڕانی ڕونکردۆتەوە ، وەتیایدا بەهەشتی بەشـوێنوخانەی بـڕواداران نـاو بـردوە ، وەدۆزەخیشـی وەك خانە و ماڵی بێ باوەڕان باسکردوە ، ئەو قورئانەی کردۆتە چـاککەر و چارەسـەرکەر بۆ ئەو کێشەونەخۆشیانەی لەنێو دڵ و دەروونەکاندا هەن ، وەرونکەروەی هەموو شتێکە، وەرێ نیشـاندەر و رەحمەتـە بـۆ ئیمانـداران. بەبەڵگـەی ئـەو ئایەتـەی کـە خـوای گـەورە دەفەرمووێ

وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِّكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وبشْرَى لِلْمُسْلِمِينَ {النحل/٨٩}

**واتە** : ئەی محمد (ﷺ)، ئێمە پەرتوکێك مان بۆتـۆ دابەزانـدوە کـە رونکـەرەوەی هـەموو شتێکە لەژیاندا ، وەڕێنمایی کەر و مژدەدەر و رەحمەتە بۆ موسڵمانان

وەلەسەر هەموو مرۆڤ و نەتەوەکان پێویسـت ( واجـب ) ە کـە بـەدوای قورئـانی پـیرۆز و فەرموودەراست ودروستو بـەپێزەکانی پێغەمبەرەکـەی (ﷺ) بکـەون ، کـە بـۆ سـەرجەم کۆمەڵی ئادەمیزادو ئەجینە ی ناردوە ، تائەوەی بـۆی هـاتوە بۆیـان ڕون بکاتـەوە وەك خوای گەورە دەفەرموێ

وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ {النحل/٤٤}

**واتە :** ئەی محمد (ﷺ)، ئێمە قورئانمان بۆ تۆ ناردووە تا ئەوەی کە بـۆ ئـەوان دابـەزیوە ، بۆ خەڵکیشی رون بکەنەوە ، بەڵکو ئەو خەڵکە بەهۆی ئەوەوە بیر بکەنەوە و تێ بگـەن و بڕوا بێنن

**ئەهلی سوننە و جەماعە :** بڕوایان وایە کە ئەو قورئانە قسە و گوتەی خوای گەورەیـە لە رووی هەموو وشەوپیتەکان وواتایەوە لەخواوە هاتووە ، وەبۆ لای ئەویش دەگەڕێتەوە، لـەخواوە هـاتوە و دروسـتکراو نیـە و ، خـوا ی گـەورە بـە هـەق و عەدالـەت دەربـارەی مەسەلەکانی ژیان قسەی پێ دەکا ، وەخوای گەورە فریشتە بەجبریل دا ، وەك وەحـی بـۆ محمدی کوڕی عبداللە رەوانەی کردوە ، تائەویش بەخەڵکی بگێنێ و بۆیان رون بکاتـەوە و لە ژیانی رۆژانەیاندا بیکەنە یاسا ودەستوروبەرنامەو حوکمی پێ بکەن و لێ ی لانـەدەن، بۆ ئەوەی بەهۆی ئەوەوە سەربەرزی دونیا و دوارۆژیان بن وەرگێر

وە خـوای گـەورە دەفـەرموێ : وَإِنَّـهُ لَتَنزِيـلُ رَبِّ الْعَـالَمِينَ {١٩٢} نَـزَلَ بِـهِ الـرُّوحُ الْـأَمِينُ {١٩٣} عَلَـى قَلْبِـكَ لِتَكُـونَ مِـنَ الْمُنـذِرِينَ {١٩٤} بِلِسَـانٍ عَرَبِـيٍّ مُّـبِينٍ {الشعراء/١٩٥}

**واتـە :** ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ، ئەم قورئانە دابەزێنراوی پەروەردگاری جیهانیانـە ، فریشـتە جبریل ( سەلامی خوای لێ بێ ) بە قورئانی پـیرۆزەوە دابەزیتەسـەر دلی تـۆ ، بـۆ ئـەوەی ئاگادارت بکاتەوە لەمەبەستەکانی خوای گەورە ، بەزمانێکی عەرەبی روون و ئاشکرا

**قورئانی پیرۆز:** خـوای زانـا و دانـا و کاربـەجێ بـەزمانێکی عـەرەبی ئاشـکراو روون و رەوان ناردوویەتی ، وەبەشێوەی جیل بۆ جیل ، بەشێوەی تـەواترەوە بەئێمـە گەیشـتوەکە هـیچ گومــان و کەموکوڕیــەکی تێدانیــە ، لەبــەر ئــەوەی خــوای گــەورە هەمیشــە پاراستوویەتی

**قورئانی پیرۆز : لە لەوحلمەحفوزدا نوسراوەتەوەو** ، دڵ و دەروون و سـینەکانی مـرۆڤ دەرخی دەکەن ، زمانەکان دەیلێنەوە ، وە لە پەڕاوەکانیشدا دەنووسرێتەوەوهەڵدەگیرێت.

وەك خوای گەورە دەفەرموێ : إِنَّهُ لَقُرْآنٌ كَرِيمٌ {٧٧} فِي كِتَابٍ مَّكْنُونٍ {٧٨} لَّا يَمَسُّهُ إِلَّا الْمُطَهَّرُونَ {٧٩} تَنزِيلٌ من رَّبِّ الْعَالَمِينَ {الواقعة/٨٠}

**واتــە** : ئەم قورئانە قورئانێکی بەرزو بەڕێزە ، لەپەرتوکێکی شـاراوەدا پـارێزراوە کـە لـە وحلمەحفوزە ، خەلکی پاك و بڕوادار نەبێ نابێ دەستی لێبـدەن ، لەلایـەن خـوای گـەورە دابەزیووە

وە دەفەرموێ : بَلْ هُوَ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ فِي صُدُورِ الَّذِينَ أُوتـوا الْعِلْـم ومـا يجْحَد بِآيَاتنَـا إِلَّـا الظَّالِمُونَ {العنكبوت/٤٩}

**واتە** : ئەم قورئانە چەند بەڵگە ونیشانەیەکی رونو ئاشکران ، لە دل و دەروونی خـەلکی خاوەن زانست و زانیاری دان ، تەنها خەلکی سەرگەردان و گومڕاو ستەمکار بەرانبەر بـە ئایەتەکانی ئێمە گومڕاو بێباوەڕ دەبن

**قورئـانی پـیرۆز** : موعجیزەیــەکی زۆر گــەورەی نــەمرە بــۆ (محمـدی کـوڕی عبـداللە) پێغەمبــەری ئیســلام (ﷺ) هــاتووە ، دوا پــەرتووکی ئاسمــانی یــە ، هــەرگیز هــەڵناوە شێتەوەو ناگۆڕێ و لەنێو ناچێ ، وە خوای گەورە کەفالەتی ئـەوەی کـردوە کـە هەمیشـە دەیپارێزێ لەهەموو جۆرە (هەڵەو کەم و زیاد و شێواندن و گۆڕانو دەستکاری ...) تێـدا

کردنێك تا ئـەو رۆژەی کـە خـوای گـەورە بـۆلای خـۆی بـەرزی دەکاتـەوە، بـەر لـە رۆژی دوایی.

هەروەك خوای خاوەنو پارێزەری قورئان دەفەرموێ :

إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ {الحجر/٩}

**واتە** : بێگومان ئێمە ئەم قورئانەمان ناردۆتە خوارەوە بۆلای ئێوە، هـەر بـۆ خۆشـان لـە هەلەوکەموکوڕیودەستکاری کردنو لە نێوچوون دەی پارێزین   واتە

**ئەهلی سوننە و جەماعە:** هەرکەسێ ئینکاری ( پیت ) یـك لـەو قورئانـە بکـاو ، بلـێ زیادە یا کەم و کوری تێدایە بەکافری دادەنـێن ، لەسـەر ئـەوە ( ئێمـە ) یـش بڕوایـەکی تەواوو نەگۆڕمان بەوە هەیە کەهەموو ئایەتوپیتـەکانی قورئـانی پـیرۆز.لەلایـەن خـوای گەورەوە دابەزیون ، بەڵام لە رێگای پەردەرپەی ( تواتر ) یەکی بڕەو بەئێمە گەیشتونە

**قورئانی پیرۆز:** هەمووی بەیەکجار بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دانەبەزیوە ، بەڵکو بەش بـەش بەپێی ڕوداوو واقیعـەکان ، یـا وەك وەڵام دانـەوەی کێشـە و گیروگرفـتو پرسـیارەکان و بەپێی خواستی بارو دۆخەکان لەماوەی بیست و سێ ساڵدا دابەزیووە

**قورئانی پیرۆز:** (١١٤) سورەتی تێدایە ، لەوانە (٨٦) یـان لەشـاری مەککـە ی پـیرۆز بەر لەکۆچکردنی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ شاری مەدینە دابەزیون ، جـا ئـەو سـوڕەتانەی کەلـە مەککە دابەزیون بە (مکی) ناودەبرێن، وەئەو سـورەتانـەیش کەلـە مەدینـە دابـەزیون بـە (مەدەنی) ناودەبرێن ، وەلەهەموو ئەوانە (٢٩) سوورەتیشـی تێدایـە کـە سـەرەتایان بـە پیتە پچڕ پچڕەکان دەست پـێ دەکـەن ، وەك (الم ، **المرا** ، **عسق** ، **طـه** ، **طسم** ،**حم** ....)

قورئانی پیرۆز لەسەر دەمی پێغەمبەر(ﷺ) نوسراوەتەوە بەچاودێرێتی ئەو ، بەو شێوەی کـە بـۆ نوسـینەوەی سـروش ( وحـي ) باشـترین هـاوەڵ دەیـان نووسـیەوە بەفـەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) هەرشتێ کەلە قورئان دادەبەزی ، پاشان لەسەردەمی ئیمامی ئەبوبەکری صدیق ( ڕەزای خوای گەورەی لێ بێ ) لەدوو توێی پەڕاودا نوسراوەتەوە ، وەلەسەردەمی ئیمامی عوسماندا ( ڕەزای خوای گەورەی لێ بێ ) بەیەك پارچە و شێوە نوسـراوەتەوە ، ڕەزای خوا لەهەموو یان بێت

**ئـەهلی سوننە و جەماعـە :** زۆر گرنگـی بـەفێربوونی قورئـانی پـیرۆز و بەخوێنـدەوە و لەبەرکردن و تەفسیرکەی و کـار پـێ کردنـی دەدەن ، وەخـوا پەرسـتی بـەهۆی قورئانـەوە دەکەن ، وەك خوای گەورە دەفەرمووێ :

كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ إِلَيْكَ مُبَارَكٌ لِّيَدَّبَّرُوا آيَاتِهِ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُوا الْأَلْبَابِ {ص/٢٩}

**واتە :** ئەی موحەمەد (ﷺ) ئەم قورئانە پەرتوکێکە بۆ تۆمان دابەزاندووە ، پـەرتوکێکی بەرزو پیرۆزە ، بۆ ئەوەی بیر لە ئایەتەکانی بکەنەوەو پێی بەڕێوە بچەنو ، خەلکی ئاقـل و ژیر پەندو ئامۆژگاری لێوەر بگرن

وە لەبەرانبـەر خوێنـدنی هـەر پیتێکـی خێـرو چـاکەیەك بـۆ خوێنـەر دەنوسـرێ ، وەك پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی

(من قرأ حرفاً من كتاب الله ، فله به حسنة ، و الحسنة بعشر أمثالها ، ولا أقـول الم حرف ، ولكن ألف حرف ، ولام حرف وميم حرف) صحيح سنن لترمذي / ئەلبانی

**واتە :** هەرکەسێ پیتێـك لـە پـەرتووك (قورئـان) ی خـوای گـەورە بخوێنـێ ، بـەهۆی ئـەوەوە چاکەیەکی بۆ دەنووسرێ ، وەهەرچاکەیەکیشی بەدەچاکەی وەکو خۆیـەتی ، ناشـلێم (ئـەلیف

لام میم) پێکەوە پیتێکە، بەڵکو ئەلیف بەتەنیا پیتێکـە ، وەلام پیتێکـە ، وەمـیم پیتێکـە، دەکاتە سی خێر.

وەلێکدانەوە و راڤە ( تفسیر) ی قورئانیش تەنها بەڕەیی رووتوبێ بەڵگـە دروسـت نیـە، چونکە ئەوە قسە کردنە لە سەرخوا بەبێ هەبوونی زانست و بەڵگە ، بەڵکو بەو شێوەیە دروستە کە سەلمێنراوە لە دەقە هاتوەکانی قورئان و سوننە ( واتا لەو سنورە دەرنەچـێ ) وەك خوای گەورە دەفەرموێ

يَا أَيُّهَا النَّاس كُلُواْ ممَّا فِي الأَرْضِ حَلاَلاً طَيِّباً وَلاَ تَتَّبِعواْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّـبِينٌ {١٦٨} إِنَّمَا يـأْمُرُكُمْ بِالسُّـوءِ وَالْفَحْشَـاء وَأَن تَقُولُـواْ عَلَـى اللّـه مـا لاَ تَعْلَمُـونَ {البقرة/١٦٩}

**واتە** : ئـەی خەلکینـە ، لـەو شتانەی زەوی بخۆن کـە حـەلال و پـاك و رێگـە پێـدراون ، بەدوای هەنگاوەکانی شـەیتان مەکـەون ، بەراسـتی شـەیتان دوژمنێکـی سـەر سـەخت و ئاشکرایە بۆ ئێوە ، هەمیشە فرمانتان بە کاری بەدو خراپ و ناشایستە و تـاوان پێـدەکا ، وەفرمانتان پێدەکا کە بە جۆرێکی خراپ قسەوبوهتان لەسەر خـوای گـەورە بکـەن کـە ئێوە نازانن خراپ و تاوانە

وەلەدوای ئەوە دەبێ بۆ گوتەی هاوەڵە بەرێزەکان و پاشان بۆ ووتەی شوێن کـەوتوە چـاکەکانیان تا ئەمڕۆمان بگەڕێینەوە ، تەفسیر کردنی لەژێر کۆمـەڵی لـە یاسـاو رێسـاورێککارو دیسـپلینە شەرعیەکان و دەرنەچوون لەو رێسایانە دروستە ، چونکە خوای گەورە لێـدوانی لـە بـارەی خـۆی بەبێ زانست و بەڵگە حەرام کردوە ،لەبەر ئەوەی ڕەنگە زۆر جار پیـاو شـتێك لـەو باریـەوە بڵـێ کە هەڵبەستراو بێ ، بەهۆی ئەوەوە گومرا و گوناهبار دەبێت

# پایەی چوارەم ( الرکن الرابع )
# بڕواهەبوون بە پێغەمبەران ( الإیمان با لرسل )

## ( سەلامی خوایان لەسەر بێت )

**ئـــەهلی ســوننە و جەماعــە :** بیروبــاوەڕی تــەواو و نــەگۆڕیان وایــە کــەخوای گــەورە پێغەمبــەران (علــیهم الســلام) ی بــۆلای بەنــدەکانی خــۆی هــەناردوە بــەموژدە دەرو ترسێنەر، تا خـەڵکی بـۆ لای ئـاینی هـەق و ڕەوا بـانگ و ڕاسـتەڕێ بکـەن ، بۆئـەوەی بەهۆی ئەوەوە مرۆڤایەتی راستە رێ بێ و ، لەتاریکیەکانی دونیاو دوارۆژ رزگاریان ببـێ بۆ ڕێ ی راست و روناك

بانگەوازی ئەو پێغەمبەرانە ( علیهم السلام ) هەمیشـە رزگارکـەری نەتـەوەکانیان بـوە لەبت پەرستی و شریك پەیداکردن ، وە پاگژکەرەوەی کۆمـەڵگاکان بـوە لەشـتی خـراپ و تێکدەر ، چونکە ئەوانە بەراستی وبەپاکی پەیام وبەرنامەی خوایان راگەیاندوە ، وە ئەو ئەرك و ئەمانەتەی لەسەر شـانیان بـوە بـەجێ یـان هێنـاوە ، وەئامۆژگـاری گەلـەکانیان کردوە بەچاکەو بە خواپەرستی ، وەجیهـادێکی هـەق و ڕەوایـان لـەپێناو خـوادا کـردوە ، وەچەندان موعجیزەی گەوەرە وڕوونو ئاشکرایان لێ ڕوودواە کـە بوونەتـە بەڵگـە لەسـەر باوەڕ بوون بە خوای گەورەو سەرجەم پێغەمبەرەکانی ( سەلامی خوای گـەورەیان لەسـەر بێت )

وەك خوای گەورە ومیهرەبان دەفەرمووێ

إِنَّ الَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِاللّهِ وَرُسُلِهِ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُواْ بَيْنَ اللّهِ وَرُسُلِهِ وَيقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُواْ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلاً {١٥٠} أُوْلَـئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ حَقّاً وَأَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا {النساء/١٥١}

**واتە** : ئەوانەی بەرانبەر بە خوای گەورە و پێغەمبەرەکانی ، سەلامی خوایان لەسەر بێ بێ باوەڕن و، جیاوازی و ناکۆکی دەخەنە نێوان خوا و پێغەمبەرەکانی ، بە جۆرێ کە دەڵێن : بڕوامان بە هەندێکیانە و بڕوامان بە هەندێکیان نیە ، دەیانەوێ لە نێوان ئەوەدا بۆ خۆیان ڕێگەیەك بگرنەبەر و پەیڕەوی لێ بکەن ، ئەوانە بێباوەڕی ڕاستەقینەو هەهیقین ، لەبری ئەودا ئێمەش سزایەکی زۆر سەخت و دژوارو سەر شۆڕکەر مان بۆ بێباوەران ئامادەکردووە وەدەفەرمووێ :

رُّسُلاً مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلاَّ يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ وَكَانَ اللّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا {النساء/١٦٥}

**واتە** پێغەمبەرانی خوای گەورە ، سەلامی خوایان لەسەر بێ ، پێغەمبەرانێکن ، لەلایەن خوای گەورە وە هاتوون ، ترسێنەرو مز گێنی دەرن بۆ خەلك ، بۆ ئەوەی لە بەرنامە وپەیامی خوای گەورە ئاگاداریان بکەنەوە ، تا خەلکەکە هیچ ئەنجەت و بڕو بیان و بەلگەیان لەسەر خوای گەورە نەبێ لە ڕۆژی دوای ، دوای ئەوەی کە پێغەمبەرانیان بۆ هاتووە ، چونکە خوای گەورە زۆر زاڵ و بەهێزو دەسەلاتدارو لێزان و فەرمانڕەوایە وەدەفەرمووی

وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ وَاجْتَنِبُواْ الطَّاغُوتَ {النحل/٣٦}

**واتـە** : بێگومان ئێمە لە هەر گەل و نەتەوەیەك چەند پێغەمبەر ێکمان رەوانە کردوون ، بۆ ئەوەی ئاگاداریان بکەنە وە کە تەنها خوای گەروە بپەرستن و ، هەمیشە لە تـاغوت و پەرستراوەکانی تر دور بکەونەوە و خۆیان بپارێن

وە دەفەرموێ : وَمَا أَرْسَلْنَا من قَبْلِك من رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ {الأنبياء/٢٥}.

**واتـە**: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) ئێمە هیچ نێردراوێکمان پێش ئێوە نەناردووە، مەگـەر نیگـاو سروش مان بۆ کردوە کەهیچ خوایەك نی یە تەنها (من) نەبێ، دەکەواتا تەنها بەندایەتی من بکەن و من بپەرستن

خوای گەورە زۆر نوێنەر و پێغەمبەری ناردوون ، جا ئی وایان هەیە کە خـوای گـەورە لـە قورئانەکەی خۆیدا ، یالەسەر زوبانی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ناوەکەی بۆ ئێمە باس کردوە، وەهەندێکیشیان لەوانە هەر باسیان نەکراوە ، وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا من قَبْلِكَ مِـنْهُم مَّـن قَصصْـنَا عَلَيْـك وَمِـنْهُم مَّـن لَّـمْ نَقْصُـصْ عَلَيْـك {غافر/٧٨}

**واتـە** : ئەی محمـد (ﷺ) ،ئێمـە چـەندان نوێنـەر ( نـبي ) و پەیامبـەر ( رسـول )[٣٨] مـان لەپێش ئێوەدا ناردوون ، جا هی وایان هەیەکە بۆ ئێوەمان باس کـردوە ، وەهـی واشـیان هەیە کە بۆ ئێوە باسمان نەکردوە

---

[٣٨] نبي : لەهەواڵ ( نبأ ) هوەهاتوە ، واتە : هەواڵدەر ، هەواڵبەر ، هەواڵ هێنـەر و هـەواڵ گێنـەر ، ئەو کەسە پێغەمبەرەو لە رێگای خوریە و ئیلهامەوە کراوە بە پێغەمبەر ، ئەو ئەرکـە پـیرۆزەی پـێ سپێردراوە ، بەڵام رەسول بەو کەسە دەگوترێ کە لەرێگای سروشەوە لەلایەن خواوە پەیام و بەرنامەی خوای گەورەی بۆ دابەزیوە ، وەك (محمد)(ﷺ) وەرگێر

لەوانــە بیســت و پێـنج نوێنــەر و پێغەمبــەر (ﷺ) لــەقورئانی پـیرۆزدا ناویـان هـاتوە ، کەئەمانەن :

( ئادەم و ئیدریس و نوح و هـود و سـالح و ئیبراهیم و لـوط و ئیسـماعیل و ئیسـحاق و یەعقوب و یوسف و ئەییوبو شوعەیب ، موسی ، هارون ، ذوالکفل و یونس و سـلیمان و الیاس و الیسع و زکریا و یحی و عیسی و محمد ) سەلامی خوای گەورەیان لەسەر بێـت وەباسی نەوەکانی یەعقوب ( أسباط) ی کردوە

**ئەهلی سوننە و جەماعە:** بیروباوەڕیان وایـە کـەخوای گـەورە بـە لـوتفی خـۆی هەنـدێ پێغەمبەرانی لەهەندێکیان گەورەتر و پایەدار تر کـردوون ، ئومـەت لەسـەر ئـەوە کـۆڕاو یەکدەنگن کـە رەسـولەکان لەنەبییـەکان گـەورەترن ، وەهەنـدێ رەسـولیش لەهەنـدێکیان گەورەترن ، وەك خوای گەورە دەفەرمووێ :

وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ النَّبِيِّينَ مِيثَاقَهُمْ ومِنكَ ومِن نُّوحٍ وَإِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَاقًا غَلِيظًا {الأحزاب/٧}

**واتە:** ئـەی محمد (ﷺ) ئاگـادار بـە و یـادی ئـەو رۆژە بکـەوە کـە ئێمـە بـەڵێن و پـەیمانمان لـە پێغەمبەران و لـە تـۆش ، وە لـە حـەزرەتی نـوحو ئیبراهیم و موسـاو عیسـای کـوڕی مەریـەم وەرگرت ، سەلامی خوای گەورەیان لێ بێت ، پەیمان و بەڵێنێکی توندو پتەومان لێ وەر گرتن.

وە لەهەموو رەسول و نەبیەکانیش گەورتر خاوەن ورەکـان ( ألـو العـزم ) ن[٣٩] ، ئەوانـەش ئەم پێنجەن : (محمد ، نوح ، أبراهیم ، موسی ، عیسی ) سەلامی خوایان لێ بێت

---

[٣٩] بۆیە پێیان دەگوترێ ألوالعەزم ، چونکە زۆر دووچاری تاقی کردنەوەوتاڵی و ناسۆری و ئـازاردان بوینـە لەلایەن گەلەکەیان ، بەڵام خۆراگرو خاوەن وورە و ئیمانێکی پتەو و پۆڵاین و دامەزراو بوینە ، وەرگێر

وە ( محمـدی کـوری عبـدالله ) ش کـە پێغەمبـەری ئیسـلامە و دوایـن پێغەمبـەر و پەیامبەری خوای بوونەوەرە و لەنێوان ئەو پێنج ( ئولولعەزمانە ) لەهـەموویان گـەورەتر و پایـەدارترە لەلایـەن خـوای گـەورە و سـەرجەم موسـڵمانانەوە وەك خـوای گـەورە دەفەرمووی :

وەك خوای گەورە سەبارەت بەوە دەفەرمویٚ :

مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ من رِّجَالِكُمْ وَلَكِن رَّسُولَ اللَّه وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا {الأحزاب/٤٠}

**واتە** : ئەی خەلکینە ئاگاداربن محمد (ﷺ) باوکی کـەس لـە کـەس و کـارو پیاوەکـانی ئێوە نیە ، بەلکو پێغەمبەری خوای گەورەیە ، وەدوایین پێغەمبەرە، چونکە لەدوای ئـەو هیچ ئاین و پەیامێك دانابەزن و هیچ پێغەمبەرێکی تر نایێ، وە خوای گەورە بە هەموو شتێك لە بوونەوەر زانا و ئاگادارە

بڕوا هەبوون بە پێغەمبەران ( علیهم السلام ) بـە کـورتی یـە، بـەلاّم بـڕوا هـەبوون بـە (محمد) ی پێغەمبەر (ﷺ) بە تێر و تەسەلی یە، هـەروەك ئیسـلام دەخـوازێ کـە دەبـێ ئادەمیزاد بڕوای تەواوی بە قورئان و سـوننە بـێ، ئەوسـا ئینسـان ئیمـانی دادەمـەزرێ و تەواو دەبێت

**( محمد ) (ﷺ) پێغەمبەرو ڕەسوڵی خوای گەورەیە**

**( محمد ) (ﷺ) کوری عبدالله ، کوری عبدالمتلب کوری هاشـم کـوری عبـد منـاف کوری قصی کوری کلاب کوری مورە کوری کعب کوری لوئی کوری غالب کوری فهـری کوری مالك کوری نەزر کوری کنانە کوری خزیمە کوری مودرکە کـوری ئیلیـاس کـوری موزەڕە کوری نزار کوری معـد کـوری عـدنان ،لەرۆلـەی حـەزرەتی ئیسـماعیلی کـوری**

**پێغەمبەر ئیبراهیمە،** کۆتایی پێغەمبەرانە، نوێنەری خوایە بۆ لای تێکڕای مەردووم، وە بەندەی خوای گەورە یەو ناپەرستریێ، وە پێغەمبەرە و نابێ بەدرۆ بزانـدریێ و گاڵتـەی پـێ بکرێ، وە لـە هـەموو درسـتکراوەکانی خـوای گـەورە چـاکتر و بـەڕێزترە لەلایـەن خـوای گەورە، وە پلە و پایەی لە هەموو خەڵکی بەرزترە، وە لـە هـەموو کـەس لـە خواترسـترو لەخوا نزیکترە، بۆ ئەوەی بکرێتە وەسیلە، وە بە هـەق و هەدیـە (بـە ڕێنمـایی کـەر) بـۆ کۆمەڵی ئینسان و پەری ( جن ) هاتوە، وە خوا بە ڕەحمەت بۆ تێکـڕای خـەڵکی ڕەوانـە کردوە، وەك دەفەرموێ :

وَمَا أَرْسَلْنَاك إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ {الأنبياء/١٠٧}

**واتــە:** ئەی موحەمەد(ﷺ) ئێمە تۆمان بـۆ تێکـڕای خـەڵکان بـە ڕەحمـەت نـاردوە، تـا بەهۆی ئەو قورئانەوە ڕاستەڕێی ژیانودینی خوایان بکەیت

وە خوای گەورە کتێب (قورئان) ی خۆی بۆ دابەزانـدوە، وە لەسـەر دیـنی خـۆی خـۆڕاگر وپتەوو ڕاستەڕێ ی کردوە، وە ڕایسپاردوە بە ڕاگەیاندنی پەیام و بەرنامەکـەی خـۆی، وە بـێ گونـاهی کـردوە و شـۆردۆتیەوە و پاراسـتویەتی لـەوەی کـە هـیچ گـۆڕانو لادان و درێغییەك لە گەیاندنی ئەو بەرنامە و پەیامەی دا بکا، بۆیە بڕوای هیچ بەندەیەك تـەواو نابێ تا تەواو بڕوای بە پەیامەکەی نەبێ، وە تا گەواهی بۆ پێغەمبـەرایەتیەکەی نـەدات، وە هـەر کەسـێ گوێڕایـەڵی و پـەیڕەوی بکـا، دەچـێتە بەهەشـتەوە، وە هـەر کەسـێکیش لاملی لێ بکا و لێی یاخی بێ و سەرپێچیو سەرەخەری لە فەرمانـەکانی بکـا، دەچـێتە ناو ئاوری دۆزەخەوە

وەدەفەرموێ : وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى {٣} إِنْ هو إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى {النجم/٤}

**واتە :** پێغەمبەری خوای گەورە هـیچ شـتێك لەخۆیـەوە ، لـە هـەواو ئـارەزووی خۆیـەوە نالێ، بەڵکو ئەوەی دەیڵێ هەر هەمووی سروش ( **وحي** ) یـە کەلەلایـەن خـوای خۆیـەوە بۆی هاتەوەو پێی گوتراوە

ئیمـانی ئینسـانی بەنـدە دانامـەزرێ تـا بـڕوای بـە پەیامەکـەی نـەبێ ، وە گـەواهی بـۆ پێغەمبەرەکەی نەدات ، هەرکەسێك بە گوێ ی پێغەمبەرەکەی بکا دەچێتە بە هەشـتەوە و، هەرکەسێکیش بە گوێ ی نەکات دەچێتە ناو ئاگرەوە

وەك خوای گەورە دەفەرمووێ :

فَلاَ وَرَبِّك لاَ يُؤْمِنونَ حَتَّى يُحَكِّمُوك فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُواْ فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا {النساء/٦٥}

**واتە :** ئەی موحەممەد (ﷺ) سـوێند بەپـەروەردگارت ئەوکەسـانە ئیمانیـان تـەواو نـابێ‌و دانامــەزرێ ، تــا نەتکەنــە حــاکمو فــەرمانڕەواو دادوەر لەهــەموو ئــەو کێشــانەی کــە لەنێوانیاندا روودەدات، وەنابێ دوای بڕیاردانی تۆ هیچ گەردو دودلی‌و نارەزاییەك لەدڵ و دەروونیاندا پەیدا بێ ، بەرانبەر ئـەو بڕیـارەی کەبەسـەرتاندا داون ، بـەڵکو دەبـێ تـەواو تەسلیم و ڕازی بن بەفرمانی تۆ

هەر پێغەمبەرێك تەنها بۆ لای گەلەکەی بەتایبەتی هاتوە، بەڵام (محمد) ی پێغەمبـەری ئێمە (ﷺ) بە گشتی بۆ لای تێکڕای خەڵکان بە ئینسان‌و ئەجننەوە ڕەوانە کراوە

وەك خوای گەورە دەفەرمووێ :

ومَا أَرْسَلْنَاك إِلَّا كَافَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ {سبأ/٢٨}.

**واتە :** ئەی پێغەمبەر ﷺ ئێمە تۆ مان بە تێکرا بۆ لای هەموو خەڵکی بـە مـوژدەدەر و بە ترسێنەر رەوانە کردووە ، وەلێ زۆر بەی خەلکی ئەم هەقیقەتە نازانن

# موعجیزەی پێغەمبەران
# سەلامی خوای گەورەیان لەسەر بێت

**ئەهلی سوننە و جەماعە:** بڕوایان وایە کە خوای تاك و تەنیا و پاك و بێ گـەرد، بە چەندان دەستەوسان‌وناتەوانی (معجزة) ی ئاشکرا و بەڵگە و نیشـانەی ڕۆشـەن پالپشتی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) کردوە، لەوانە :

قورئانی پیرۆز: ئەو پەرتووکەیە کە خوای بێ هاوتا تەحەددای پـێ کـردوە لەسـەر هەموو نەتەوەکان، وە پەرتووکێکی ڕەوان و بەتوانا و ڕەوانبێژ و ژیربێژی یە.

وە لە گەورەترین موعجیزەکانیش لە دوای قورئانی پیرۆز، موعجیزەی سەرکەوتن و شەوڕۆیی ( الإسراء والمعراج ) ە کە پێغەمبەر (ﷺ) کە خوای گەورە بۆ خۆی ئەو گەشتە سەختەی پێ کردوە و پاڵپشتی کردوە.

وەك خوای گەورە دەفەرمووێ :

سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِّنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ البَصِيرُ {الإسراء/١}.

واتە : پاکی و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە بەشەوێك شەورەوی بە پێغەمبەرەکەی خۆی کرد، لە مزگەوتی حەرام بردیە مزگەوتی ئەقسا لە فەلەستین ، ئەو مزگەوتەی کە دەورویەریمان پیرۆزو بەبەرەکەت کردووە

ئەهلی سوننە و جەماعە: بڕوایـان وایـە کـە خـوای گـەورە پێغەمبەرەکـەی خـۆی (ﷺ) لە شەوێکدا، بە گیان و لاشەوە، بە خەبەر ویە ئاگاوە بەرزی کردۆتەوە و، بە شەو لە مزگەوتی (حرام) شەوڕۆیی پێ کردوە بۆ مزگەوتی ئەوپەڕ ( أقصى ) بە

بەڵگەی قورئان، پاشان لەوێوە بۆ ئاسانی بەرز کردەوە، تا سەرکەوت بـۆ ئاسمـانی حەوتەم، پاشان بۆ سەرووی ئەوەش بەرز بۆوە بۆ ئەو شوێنەی کە خوای گەورەحەزی کرد، کە (سدرة المنتهى) یە، کە بەهەشتی ( جنة المأوى ) ی لێیە.

لەو گەشتەیەدا، خوای گەورە بەوشێوە ( ڕێزی گرتوە کە ویستوویەتی، وە سروشی پێ کردوە، وە قسەی لەگەڵدا کردوە)، وە لە شەو و ڕۆژێکدا پێـنج نوێـژەکانی بـۆ داناون، وە چۆتە نێو بەهەشت و دیتویـەتی، وە دۆزەخـی دیتـوە، وە فریشـتەکانی دیتوون، وە جبریلی لەسەر ئەو شێوە هەقیقیە دیتوە کە دروستی کـردوە، وە دڵـی پێغەمبەر (ﷺ) درۆی نەکردوە سەبارەت بەو شتانەی دیتونی، بەڵکو بەڕاسـتی هەموو ئەو شتانەی بە چاوی خۆی دیتوە، ئەوەش لەبەر گەورەیی و پایەداری و ڕێز گیروای پێغەمبەر و پلەکەیەتی لەچاو هەموو پێغەمبەرەکانی تر(علیهم السلام).

لە پاشان کە گەڕایەوە لە ماڵی پاك و پیرۆز ( بیت المقدس ) هاتە خوارەوەو، لەوێ پێشـنوێژی بـۆ هـەموو پێغەمبـەران کـرد (علـیهم السـلام) پاشـان پـێش خۆرهەڵات(فجر) گەڕایەوە بۆ شاری مەککە.

وەك خوای گەورە دەفەرمووێ :

وَالنَّجْمِ إِذَا هَوَى {١} مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَى {٢} وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى {٣} إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى {٤} عَلَّمَهُ شَدِيدُ الْقُوَى {٥} ذُو مِرَّةٍ فَاسْتَوَى {٦} وَهُـو بِالْأُفُقِ الْأَعْلَى {٧} ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّى {٨} فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَـى {٩} فَـأَوْحَى إِلَى عَبْدِهِ مَا أَوْحَى {١٠} مَا كَذَبَ الْفُؤَادُ مَا رَأَى {١١} أَفَتُمَارُونَهُ عَلَى مَا يَرَى {١٢} وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى {١٣} عِندَ سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى {١٤} عِندَهَا جَنَّةُ الْمَـأْوَى {١٥} إِذْ يَغْشَى السِّدْرَةَ مَا يَغْشَى {١٦} مَا زَاغَ الْبَصَرُ وَمَا طَغَى {١٧} لَقَدْ رَأَى مِنْ آيَاتِ رَبِّهِ الْكُبْرَى {النجم/١٨}.

واتە : سوێند بە ئەستێرە کاتێ کـە لەشـوێنی خـۆی دەتـرازێ و شـۆڕ دەبێتـەوەو ئاوادەبێت ، هاوڕێتان کە محمد پێغەمبەرە ﷺ گومڕا نەبووە و لە ڕێگەی راست و ڕەوا لای نەداوە ، وەلە هەواو ئارەزوو و لەخۆیەوە بەبێ خوای گەورە قسە ناکات و فرمان نادات ، بەلکو ئەوەی کە دەیلێت نیگاوسروشە لەلایەن خوای گەورەوە بۆی دێت ، جوبرائیلی بەهێزو توانا سەلامی خوای گەورەی لەسەر بێت فێری قورئـانی پیرۆزی کردووە ، ئینجا لەسەر شێوە راستەقینەکەی خۆی وەستا ، لە کاتێکا ئەو لەئاسۆی هەرە بەرزو بلندبوو ، پاشان تا دەهات جبریل علیه السلام لە پێغەمبەر ﷺ نزیك دەبوویەوە تا نێوانیان بەقەد دوو کەوان یا کەمتریش ما ، ئەوسا خوای گەورە لەرێگەی حەزرەتی جبریلەوە سـەلامی خـوای گـەورەی لەسـەر بێـت نیگـاو سروشی بۆ پێغەمبەر کرد دەربارەی ئەوەی کەویستی ، ئەوەی کە پێغەمبـەر ﷺ بۆخۆی بینی بـەدڵ بڕوای پێکـرد و بـەدرۆی نـەزانی ، ئایـا ئێـوە لەسـەر شـتێك گفتوگۆی لەگەلدا دەکەن و بڕوای پێناکەن کە بۆ خۆی بینیویەتی ، سوێند بـەخوا جارێکی تـریش لـەکاتی دابەزینـدا حـەزرەتی جبریلـی بینیـووە ، لـەلای سـدرەت ولمونتەها ، ئەو شوێنەی کە بەهەشتی جێگەی حەسانەوەو حەوانەوەی لێیە، کاتێك ئەوەی سدرەتی داپۆشی مەگەر خوای گەورە بۆ خۆی بزانێ کە چی و کـێ بـوون ، چاوەکانی پێغەمبەر ﷺ لەوشەوەدا لە دیتنـی ئـەو شـتانە چەواشـەکراو و لادراو نەبوو، بەلکو دیتنێکی راست و ڕەوا بوو ، چەندان بەلگەو نیشانەی گەورەی خوای پەروەردگاری خۆی بینین .

## هەندێ لە موعجیزەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەمانەن

- لەت بوونی مانگ : کـە بەڵگـە و نیشـانەیەکی زۆر ڕوون و گەورەیـە و خـوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی خۆی داوە (ﷺ)، کە بەڵگەیە لەسـەر پێغەمبەرایـەتی ئەو، دیارە ئەوەش لەسەردەمی مەککەدا بوو، لەو کاتەی کە موشریکەکان داوای بەڵگەیان لێ دەکرد [40]
- زۆر بوون و زیادبوونی خـواردن و خـۆراك بـۆ پێغەمبـەر (ﷺ)، کـە ئـەوەش چەندان جار بۆ ئەو ڕوویداوە [41]

---

[40] وەك خوای گەورە سەبارەت بە لە تبوونی مانگ دەفەرموێ :

اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ {١} وَإِن يَرَوْا آيَةً يُعْرِضُوا وَيَقُولُوا سِحْرٌ مُّسْتَمِرٌّ {القمر/٢} .

واتە : ڕۆژی دوایی نزیك بوویەوەو مانگ لەت بوو، ئەگەر ئەم بێباوەڕانە بەڵگەو نیشانەیەك ببینن کە بەڵگەبێ لەسەر تواناو دەسەلاتی خوای گەورە ، پشتی تێدەکەن و دەڵێن : ئەوە هیچ نیە ، ئەوە شتێکی باوو بەردەوامە ، پێشتریش هەر هەبووە

[41] جابری کوری عبداللە ی سەحابە دەڵێ : پێغەمبەر (ﷺ) لەشەڕی خەندەق زۆربرسی بوو ، منیش پێم گووت بابچینە مالەوە هەندێ خواردنمان لە جۆرگۆشت هەیە ، چەندکەسێکیش لەگەل خۆتدا بێنە ، ئەویش بانگی هاوەلانی خەندەقی کرد ، گووتی وەرن بابچین ، وە پێیی گووتم :

لا تنزلن برمتكم ولا تخبزن عجينكم حتى أجئ وجاء ، فأخرجت له عجيناً فبصق فيه وبارك ( دعا بالبركة فيه ) ثم عمد الى برمتنا فبصق وبارك ، ثم قال أدعى خابزة ، فلتخبـز معـك و اقـدحي ( اغرفي ) من برمتكم ولاينزلها وهم الف فأقسم الله لأكلوا حتى تركوه و انحرفوا وان برمتنا لتغط ( تفور وتغلي ) كما هي ، وأن عجيناً ليخبز كما هو . متفق عليه .

واتە: قابلەمە چێشتەکەتان لەسەر ئاگر دامەبەزێنە ، هەویرەکەشتان مەکە نان ، تا من دێم،جاکاتێ کە پێغەمبەرﷺ هات هەویرەکەم بۆ دەرکرد،تفی خۆی پێکرد و پیرۆزی کرد، دوعای زۆر بـوون و

- زیاد بوونی ئاو و هەڵقوڵینی ئاو لە نێوان پەنجە پیرۆزەکـانی و، پاقژبوونـەوەی خواردن و خۆراك بۆی تا بیخوات، کە ئەوەش چەندان جار لە پێغەمبەر (ﷺ) ڕوویداوە.
- چاککردنەوەی نەخۆشەکان، وە چاککردنەوەی هەنـدێ لـە هاوەڵـەکانی لەسـەر دەستی ئەو، بەبێ دەرمانێکی بەرهەست و بەرجەسە[٤٢]
- ئادابی گیانلەبەران لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) . وە ملکەچی و سـەردانەواندنی دار و درەخت بۆی، وە سەلام کردنی بەردەکان لە پێغەمبەر (ﷺ)[٤٣]

---

خێرو بەرەکەتی لێکرد ، پاشان چاو و پالی دایە چێشت و قابلەمەکەمان ، تفی خـۆی پێکـرد و پیرۆزی کرد ، دوعـای زۆر بوون و خێرو بەرەکەتی لێکرد ، پاشان فەرمووی: ئافرەتە نانکەرەکە بانگ بکەن با ئاگرهەلبکاو لەگەل تۆ چێشت ونان دروست بکا ،وە لەسەر ئاگری دانەبـە زێنێـت ، ئـەم هاوەلانە زۆرن هەزار کەسن ، سوێند بەخوا تا بەئارەزوی خۆیان وازیان لە خواردنەکە هێناو لێیگەران لێیان خوارد ، کەچی خواردن و قاولەکەمان هەروەکوخۆی لەسەرئاگر دەکوڵی و بلقـی دەکـرد، وە هەویرەکەش ببووە نان وهەر وەکو خۆی بوو . وەرگێر.

[٤٢] بۆ وێنە کاتێ کە ابی رافع پێ ی شکابوو پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو :
( ابسط رجلك فبسطت رجلي فمسها فكأنما لم أشتكها قط ) بخاري .
واتە: پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: پێ ی خۆت درێژکە، دەڵێ پێی خۆم درێـژ کـرد، دەسـتێکی بەسەر دا هێنا و چاك بویەوە، وەك ئەوە وابوو کە قەت پێشتر نەهێشابێت، یا چاوی ئیمامی عەلی چاك کردوەوە، یا کاتێ کە سەلەمەی کوڕی ئەکوەع قاچی لـە شـەڕی خەیبـەر شـکابوو، پێغەمبـەر (ﷺ) سێ فوی لێ کرد و چاك بۆوە، یا جنی لە نەخۆش و پەرکەمداران دەردەکردن. وەرگێڕ.
[٤٣] بۆ وێنە جارێك لقی دارخورمایەك ( مثل صوت العشار) وەك وشتر دەینالاند، تـا پێغەمبـەر (ﷺ) دەستی بەسەر دانەهێنا ئەوسا بێ دەنگ نەبوو، یا کاتێ کە پێغەمبەر (ﷺ) لە دۆڵێکی

- تۆلە لێ بوونەوەیەكی بەپەلەوخێرا لەهەندێ لەوكەسانەی كە خیانەتو ناپاكیان لەگەل پێغەمبەردا(ﷺ) كردووە .
- خەبەردانی پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی چەند شت (كاروبار) ێكی نادیـار، وە خەبەردانی چەند شتێكی دوور كە دەستبەجێ ڕوویـان داوە، وە خەبـەردانی چـەند شتێك كە ڕوویان نەداوە، بەلأم دوای قسەی ئەو ڕویانداوە، وەك پێغەمبەر (ﷺ) باسی كردوە[44]

---

فراوان ویستی سەراو بكا، تەنها دوو دار لەلاپەرگەیەك هەبوون، كە چووە لایان، خۆیان وەك حوشتر ڕاخست، یا دارو بەرد سەلامیان لێ دەكرد.

وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ : ( إني لأعرف حجرا بمكة كان يسلم علـي قبـل أن أبعـث انـي لأعرفه الآن ) مسلم /ج، ص١٧٨٢، رقم /٢٢٧٧

واتە : بێگومان من بەردێك لە مەككە دەناسم و پێدەزانم كە پێشتر سـەلامی لـێ دەكـردم پـێش ئەوەی كە ببمە پێغەمبەر (ﷺ) ، ئێستاش دەزانم لە كوێ یە و پێی دەزانمەوە

وە كاتێ كە بەلای وشترێكدا تێپەڕی فەرموی كێ خاوەنی ئەو وشترەیە، یەكێك هاتوو گوتی مـن، ئەوسا وشترەكە لای پێغەمبەر (ﷺ) سكالأی لی كرد كە باری گران دەكاتن. وەرگێر.

[44] بۆ وێنە لە جەنگی بەدر پێغەمبەر (ﷺ) لە شەڕگە سەبارەت بە سەرانی كوفر گووتی: فلأنكەس لێرە دەكوژرێ، وە فلأنەكەسیش لێرە دەكوژرێ، جا چۆنی فەرموو دواتر هەمووی ئاوا هاتەدی، وە لە جەنگی مۆتە هەوالی دا بە شەهید بوونی هەرسێ سەركردەی موسلمانان . وە كاتێ كە نەجاشیش مرد هەر هەمان ڕۆژ هەوالی مردنی دا، وە سەبارەت بە كیسرایش فەرمووی : ( إذا هلك كسرى فلا كسرى بعده ، وإذ هلك قيصر فلا قيصر بعده ، والـذي نفسـي بيـده لتـنفقن كنزهما في سبيل الله ) بخاري و مسلم .

• وەلأمدانـەوە و گـیرا بـوو نـی سـەرجەم پارانـەوە و داواکـانی لەلایـەن خـوای پەروەردگارەوە لەهەموو کاتەکاندا .

• پاراستنی پێغەمبەر (ﷺ) لە لایەن خوای گەورە لەزیان پێگەیاندن و لەدەستی دوژمنان[٤٥]

• هەروەك ئەبی هورەیرە ، لە پێغەمبـەروە (ﷺ) دەگێڕێتـەوە و دەفـەرموێ : ڕۆژێ ئەبو جەهل گوتی: ئەی خەلکینە ئایا محمد(ﷺ) لێرە لەبەر چاوی خەلکی سوژدە دەباو دەم و چاوی خۆی بۆ خوا دەخاتە سەر ئەرد. ؟ دەلێ: یەکێك گـوتی بەلێ وادەکات ئەبو جەهل گوتی : سوێند بەلات و عوززا ئەگەر مـن لێـرە ببیـنم محمد وابکات ئەوا پێی لەسەر ملم دادەنێم و دەم و چاوی لەخۆل وەردەدەم . دەلێ : فەعلەن ڕۆژێ پێغەمبەر (ﷺ) هات و نوێژی دەکرد، ئەبوجەهل ویستی وای لێ بکا کەچی بەئەمری خوای گەورە لەناکاو ئەبوجەهل لەترسان لەسەر پاژنە پێکانی بەرەو

---

واتە: ئەگەر کیسرا لەناوچوو هیچ کیسرایەکی تر لە دوای ئەو نابێ، وە ئەگەر قەیسەریش لەناوچوو هیچ قەیسەرێکی تر لە دوای ئەو نابێ، بۆیە سوێند بەخوای گەورە گەنجینەکانی قەیسرە و کیسـرا دەبەخشرێن. وەرگێر.

[٤٥] . بەلگەی هەرە زەق و گەورە سەبارەت بەوە ئەوەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) بەمردنی خۆی مردوە لە هیچ شەڕو شۆر و پلانێکی دوژمنانیدا شەهید نەبووە، دیارە ئەوەش لەبەر چەندان هۆی گەورە بوە نەخاسمە کە خوای گەورە بەلێنی پاراستنی دابوو، بۆیە پارێزرا  وەك خوای گەورە دەفەرموێ :
وَاللّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ إِنَّ اللّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ {المائدة/٦٧}
واتە: ئەی محمد (ﷺ) خوای گەورە تۆ لەخەلکی دەپارێزێت لەوەی کە دەست و زەربەت لێ بدەن ، بۆیە دوای دابەزینی ئەو ئایەتە پیرۆزە پێغەمبەر ﷺ لەدەستی دوژمنان ئاسـودە بـوو پارێزیـاری نەمان . وەرگێر

دواوە دەکشایەوە و هەردوو دەستەکانی لەپێشە خۆی بەرز دەکردەوە ( وەك ئەوەی کەلە بەرانبەر هێرشەکارێك بەرگری لەخۆی بکا وابوو) دەڵێ : یەکێك پێی وت ئەی ئەبا هیشام ئەوە چیە بۆ وادەکەیت ، گـوتی لەبـەر ئـەوەی وادەبیـنم کـە لـەنێوان من‌ومحمد دا کەندرێکی پڕ لە ئاگرو غەزەب هەیە، وەچەند پەڕو بـاڵێکی درێـژیش دەبینم بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ئەگەر ئەویو جەهل ئەوسـا زیـاتر هاتبـا پێشـەوەو هەروا مابایەوە ، فریشتەکانی خوای گەورە ئەویان پارچە پارچە دەکرد

# پایەی پێنجەم ( الركن الخامس )
# بڕوا بوون بە رۆژی دوایی ( الإيمان باليوم الآخر )

**ئەهلی سوننەو جەماعە:** بیرو باوەڕ و ئیمان یان بـەرۆژی دوایـی هەیـە بـە بـڕوا هەبوونێکی راست و دروستوتێرو تەواو ، وە بڕوایان بەهەموو ئەو شتانە هەیەکە خوای بالاّ لەکتێبەکەی خۆیدا باسی کردوون ، وەبەهەموو ئەو شتانەی کەلە دوای مـردن ڕودەدەنو دەبـن کـە پێغەمبەرەکـەی (ﷺ) باسـی کـردن ،تائـەوەش کـە بەهەشتیەکان دەچنە بەهەشت و دۆزەخەکانیش دەچنە نێو دۆزەخـەوە بڕویـان پـێ یەتی .

وەخوای بـێ وێنـە باسـی رۆژی دوایـی لەکتێبـە پیرۆزەکـەی خـۆی دا زۆر دوپـات کردۆتـەوە و گرنگـی زۆری بەهـەبوونی داوەو، لـەزۆرجێ باسـی کـردوە و دوپـاتی کردۆتەوە کە بێگومـان روودەدات [٤٦] وە بروا هەبوون بە رۆژی دوایی گرێی داوە بە بڕوا هەبون بەخوای گەورە .

[٤٦] وەك خوای گەورە دەفەرموێ : وَأَنَّ السَّاعَةَ آتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا وَأَنَّ اللَّهَ يَبْعَثُ مَن فِي الْقُبُورِ {الحج/٧}

واتە : بێگومـان رۆژی دوایی دادێ و هیچ شەك و گومانی تیا نیە کە رودەدات، بەلکو زۆر نزیکیشە

وەك خوای گەورە دەفەرموێ: أَلَيْسَ الصُّبْحُ بِقَرِيبٍ {هود/٨١}

واتە: ئایا رۆژی قیامەت نزیك نی یە دابێت .

وە دەفەرموێ : يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَلْتَنظُرْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ لِغَدٍ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ {الحشر/١٨} .

وەك خوای گەورە دەفەرمووێ :

والَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ وَبِالآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ {البقرة/٤}.

واتە : ئەوکەسانەی کە بروایان بەو کتاب و پەیامـە هەیـە کـە بۆتـۆ دابـەزیوە و، وەبەوەی کە لە پێش تۆش دابەزیوە ، وە بڕوایان بەرۆژی دوایی هەیە ، ئەوکەسانە ئیماندارن .

وە ئەهلی سوننە و جەماعە : بروایان وایە کە رۆژی دوایی زانیـاری (علـم) یەکـە تەنها لەلایەن خوای گەورەیەو و کەس نای زانێ کە کەی دادێ جگە لە خوای گەورە وەك دەفەرموێ :

﴿ إِنَّ اللَّهَ عِندَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ ﴾ ( لقمان: ٣٤ ) .

واتە: بێگومان زانینی هاتنی رۆژی دوایی تەنها لای خوای گەورەیە و کـەس نـای زانێت[47]

---

واتە : ئەی ئیماندارینە دە لە خوای گەورە بترسن ، دە هەرکەسە و سەیری خۆتان بکەن ئاخۆ چی تان کردوە و چیتان پێشخۆ خستوە بۆ بـەیانی (بـۆ رۆژی دوایـی) تـا بـەروو سـوری بچـنە بەردەسـتی پەروەردگاری بوونەوەر . وەرگێر .

وەك حەزرەتی جبریل سەلامی خوای گەورەی لەسەر بێت لە پێغەمبـەری خـوای گـەورەی پرسـی و فەرمووی :

(متی الساعة یا رسول الله) .

واتە : ئەی پێغەمبەری خوا کەی قیامەت دادێ. پێغەمبەریش (ﷺ) لە وەڵامدا فەرمووی :

(ماالمسؤل بأعلم من السائل) مسلم / ج[46] ، ص ٣٩، رقم / ٩

واتە : پرسیار لێکرا و لە پرسیار کەر زاناتر نی یە دەربارەی هاتنی رۆژی قیامەت . وەرگێڕ.

[1] وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: نیشانەکانی ئاخیری زەمانی وەکو دەنکی تەسبیح یەك لە دوای یەك دێن، وەرگێڕ.

بەڵام خوای گەورە چەند (بەڵگەو نیشانە ومەرج) ێكی بۆدیـاری كـردوون ئەگـەر بێنە دی ئەوا بەڵگەن لەسەر نزیك بوونەوەو روداني ئەو ڕوداوەو ئەورۆژە .
وەبڕوایان بەهاتن و روداني هەموو نیشـانەكاني گـەورە و گچـكە هەیـە و دەبنـە بەڵگە و نیشانە بۆ روداني ئەو رۆژە بۆیە ئەوانـە دەچـنە نێـو بـابی بـڕوا هـەبوون بەرۆژی دوایی (الساعة) و بیروباوەری ئیسلامی ئازیز .

---

وەك خوای گەورە سەبارەت بەوە دەفەرموێ: وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ {الأحزاب/٤٠}
واتە : محمد پێغەمبەری خوای گەورە (ﷺ) دوایین پێغەمبەرە، چونكە لەدوای ئەو ئایین و پـەیام دانابەزن و هیچ پێغەمبەرێكی تر نایێ، وەك خوای گەورە دەفەرمووێ :
الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي {المائدة/٣}
واتە: ئەی محمد ئەمڕۆ ئایینی ئێوەمان بۆ ئێوە تەواو كرد و كۆتایی پێهات.
وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ :
(لا تقوم الساعةَ حتى يخرج ثلاثون دجالون، كلهم يزعم أنه رسول الله) سنن ابی داود
واتە: رۆژی دوایی دانایێ تا سی دەججال پەیدا نەبن، هەر هەمووشیان خۆیان بە پێغەمبەر دەزانن و بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەكـەنو، درۆ بـەناوی خـوای گـەورە و پێغەمبەرەكـەی هەڵدەبەستن وەرگێڕ.

# نیشانە گچکەکانی رۆژی دوایی
# علامات الساعة الصغری

ئەو نیشانانە بەر لـە هـاتنی رۆژی دوایـی (سـاعة) دێـن لـە چـەند سـەردەمێکی دوورودرێژدا، یەك لە دوای یەك (نەك لەیەك کاتدا)[48]، بە شێوەیەکی نـەریت ئاسـا (معتاد) دێـن، هەنـدێکیان دەبنـە هـاوەڵی نیشـانە گـەورەکان، واتـا لێـك نزیـك دەکەونەوە، وە نیشانە بچووکەکانیش ئێجگار زۆرن، جا ئێمە لێرەدا هەندێ لەوانە باس دەکەین کە لە فەرموودەدا سەلمێنراون، بۆ وێنە لەوانە:

هـاتنی پێغەمبـەر (ﷺ)، کـە بـەهۆی ئـەوەوە پـەیام و پێغەمبەرایـەتی سـەر مۆرکراوە[49]، وە مردنی پێغەمبەر (ﷺ)، وە ئازادکردنی ( بیـت المقـدس ) ە وە پەیدابوون و روودانی ئاشوب و ئاژاوەکانە، وە شوێن کەوتنی یاسا و رێسا و رێبازی نەتـەوە رابردوەکـانی وەك (جوولەکـەو گاورەکـان) ە، وە هـاتنی دەجالەکانـە، وە داواکردنی پیغەمبەرایەتییە[50]. وە دانان و هەڵبەستنی فەرمودەی بەدرۆیە بەزمانی پێغەمبەر (ﷺ)، وە ڕەتکردنەوە و وەلانانی بەرنامە و ڕێباز (سوننە)ەکەیەتی[51]، وە زۆر بوونی فڕو فێڵ و درۆ و دەلەسەیە، وە نەسەلماندنی بەڵگەیە لە گێڕانـەوەی

[51] وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ :
(لاتقوم الساعةَ حتی یخرج ثلاثون کاذباً دجالا، کلهم یکذب علی الله وعلی رسولهِ ) سنن أبی داود
واتە: رۆژی قیامەت بەرپا نابێ تا سی دەجالی درۆزن پەیدا نەبن، هەر یەکێ لەوانە درۆ بە خوا و بە پێغەمبەرەکەی هەڵدەبەستێ، وەگێڕ.

هەواڵەکان، وە نەمانی زانست و زانیاریــیە[52]، وە پەیدابوون و سەرهەڵدانی خراپە و نەفامییە. وە نەمانی پیاو چاکانە، وە هەڵوەشاندنەوە وە پچڕاندنی پەتی ئیسلامە گرێ لە دوای گرێ[53]، وە سەرکەوتنی نەتەوەکانە بەسـەر نەتـەوەی موحەمـەد، وە نامۆبوونی ئیسلام و موسڵمانانە[54]

---

[52] وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ :

(إن من اشراط الساعة: يرفع العلم ويظهر الجهل) بخاری/ ج٦، ص٢٤٩٧، رقم٦٤٢٣.

واتـە : لەنیشـانەکانی هـاتنی ڕۆژی دوایـی : بەرزبوونـەوەو نـەمانی زانسـتو زانیـاری شـەرعیو سەرکەوتن و دەرکەوتنی نەفامی و نەزانی یە

یا دەفەرمووێ : ( يقلل العلم ويكثر الجهل ) .

واتە: لە ئاخیری زەمانی زانست هەڵدەگیرێتەوە و کەم دەبێتـەوە، نـەفامی و نـەزانی زۆر دەبـێ و سەرهەڵدەدات. وەرگێڕ.

[1] وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ : ( لتنقض عرى الاسلام عروة بعـد عـروة ) المسـتدرك علـى الصحيحين .ج/٣.ص/١٠٤ . رقم ٧٠٢٢

واتە : کوفر ئەوپەڕی دوژمنایەتی ئسلامو موسلمانان دەکاو، گرێ بەگرێ هەولی هەلوەشاندنەوەو لە نێو بردنی ئیسلامو موسلمانان دەدا تا دەگاتە نوێژ، دواتر لەنوێژیش ناوەستێت .

٢ وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ : (بدء الإسلام غريباً وسيعود غريباً كما بدء فطوبى للغرباء. مسلم / ج١/ ص ١٣٠، رقم / ١٤٥.) .

واتە: سەرەتا ئیسلام زۆر بە مەینەت و نامۆیی پەیدا بوە، ئەگەر لاوازیش بـوو جـارێکی تـر بـە غەریبی و بە زەحمەت پەیدا دەبێتـەوە، جا خۆشـی و پـاکی بـۆ غـەریبان، بـۆ ئەوکەسـانەی کـە کردوکۆشش و چاکەکاری لە پێناو ئایینی خوای گەورەدا دەکەن. وەرگێڕ.

وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ : لە ئاخیری زەمانی لەبەر زۆری ئاشوب و ئاژاوە و دەرد و بەلاّ ئەگەر یەکێك بەلای گۆڕی مردوێکدا بڕوا دەڵێ:

( يا ليتني كنت مكان صاحب هذا القبر...) بخاری و مسلم، ج٤/ ص٢٢٣١، رقم/ ١٥٧.

وە کوشت و کوشتار زۆر دەبێ، وە لەبەر زۆری دەرد و بەڵا پیاو خۆزگە بـە مـردن دەخوازێ، وە ئێرەیی (حسود) ی بە خەڵکانی نـاو گۆڕەکـان دەبـەن[55]، وە مردنـی کتوپڕو لەناکاو زۆر دەبێ، وە مردنـی بـە بۆمەلـەرزە و پـەتا و نەخۆشـیەکان زۆ دەبێ[56]، وە ژمارەی پیاوان کەم دەبن، ژمارەی ژنان زۆر دەبن[57]. وە ژنان خۆپۆشی ڕوتـن[58]، وە زینـا و داوێـن پیسـی لەسـەر جـادە و ڕێگاکـان بڵاودەبێتـەوە[59]، وە

واتە: ئەی خۆزگە ئەو گۆڕە جێگای من دەبوو. وەرگێڕ.

[55]. وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (......ویکثر الزلازل ).

واتە: لە ئاخیری زەماندا بۆمەلەرزە و لەرینەوەی زەوی زۆر دەبێت. وەرگێڕ.

[56]وە ك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ:

(..... ویقل الرجال، ویکثر النساء حتی یکون لخمسین إمرأة القیم الواحد)

واتە: لە ئاخیر زەماندا لەبەر شەڕ و شۆڕو کوشتار و فیتنە و ئاشوبوئاژاوە پیاو کەم دەبن، وە ژن زۆر دەبن تا وای لێ دێ بە پەنجا ئافرەت پیاوێك سەروکاریان دەکات. وەرگێڕ.

[57]. وەك پێغەمبـەر (ﷺ) دەفـەرموێ : ( نسـاء کاسـیات عاریـات ) مسـلم/ ج٣/ ص١٦٨، رقم/٢١٢٨.

واتە: ژنان خۆپۆشی ڕوتن، واتە بەناو خۆیان دادەپۆشن ، جلەکانیان هێندە تەنکە ژێرەوەیان لـەبن دیارە

یان دەفەرموێ: ( رُبَّ کاسیة في دنیا عاریة في الآخرة ) بخاری .

واتە: زۆر ژنی خۆداپۆشەری دنیا هەن کە لە دوارۆژدا ڕووتو رەجاڵو ماڵ وێرانن. وەرگێڕ.

[58]. وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ:

( إن من أشراط الساعة...یکثر الزنا) بخاری/ ج٥/ ص٢٠٠٥، رقم/ ٤٩٣٣.

واتە: یەکێ لە نیشانەکانی رۆژی دوایی ئەوەیە کە زینا و داوێن پیسیوئیباحیەت بێ پەروا زۆر دەبێت تا وای لی دێت لەسەر شەقامو شۆستەکان لێك دەنیشن، ئەوکەسەی لەپەنایەك ئەنجامی بدا بە ئەدەبە. وەرگێڕ.

هاوکارانی ستەمکاران زۆر دەبن لەو پۆلیسانە کە قامچی لە خـەڵکان دەدەن، وە ئامێری کەمان و مۆسیقا و ئاوازدار دەردەکەون، وە مەی خواردنەوە و زینا کردن و سوو ( ربا ) خواردن و ئاوریشم پۆشـین زۆر دەبێ و ( حـەلاڵ ) پشـی دەکـەن، وە رۆچوون و لەنێوچون زۆر ڕوودەدەن[60]، وە سپاردە (أمانە) گوم دەکرێت و ناگەڕێتەوە لای خاوەنی خۆی، وە کار و مەسئولیەت بە خەڵکی ناشایستە دەسپێردرێ ، وە لە نێو خەڵکی دا لەڕو لاواز و بێ هێزەکان دەبنە پێشەوا، وە ئەوانەی کە لە ژێرەوەن و نادیارن بەرز دەبنەوە و سەردەکەون بەسەر خەڵکێکی زۆر چاکتر لـە خۆیـان، وە رۆڵە بە بێ ڕێز و سوك سەیری دایکە بەخێوکەرەکەی دەکـا، وە خـەڵکی هـەژار و نەدار چەندان قاتی ساختۆمان ( بینایە ) لەسەر یەکتری دروست دەکەن و تەنها گرنگی بە ڕەنگو ڕواڵەت دەدەن[61]

---

[59]. وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ :

سیکون في آخر الزمان خسف وقذف ومسخ ، إذا ظهرت المعازف والقينات واستحلت الخمر. ترمذي

واتە : لە کۆتایی زەمان هەرکاتێ ئارەق حەلال کراو دەڵڵو زوڕناوعودو کەمانو ناشەرعی زۆر بوو ، گۆڕینو ڕۆچوونو شەقبوونودەرهاویشتنو ناشیرکردن رودەدەن .وەرگێڕ.

[60]. وەك پێغەمبـەر (ﷺ) دەفـەرموێ: ( إذا ضـيعت الأمانـة فـانتظر السـاعة ، قـال: وكيـف أضاعتها؟ قال : إذا وسد الأمر الى غير اهله فانتظر الساعه ) جامع الأصول

واتە : هەرکاتێ ئەمانەت گومکرا چاوەڕێ ی قیامەت بە ، یەکێك گوتی گومبوونی ئەمانەت چۆنە ، فەرمووی : ئەگەر کاروباری خەلك بە خەلکی ناشەرعی و ناشایستە سپاردرا چـاوەڕێی خراپـەو قیامەت بکە. وەرگێڕ.

[61] وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ :

(.... أن تلد الأمة ربتها، وأن ترى الحفاة العراة رعاء الشاة ، يتطاولون في البنيان ) مسلم .

وە خـەڵکی خۆیـان هەڵدەکێشـن و لاف و گـەزاف لـێ دەدەن بـە ڕازاندنـەوە و جوانکردنی مزگەوتـەکان، وە کـات و سـات و سـەردەم دەگـۆڕێ، تـا وای لـێ دێ چەندان بتی هەمەجۆر دەپەرستن، وە شیرك لە نێو خەڵکی پەیدا دەبێت .

وە تـەنها سـەلام لـە ناسـیاوەکان دەکـرێ، وە مامەڵـە و بازرگـانی زۆر دەبـێ و، بازاڕەکان لێك نزیك دەبنەوە، وە سەروەت و سامان و دارایی زۆر دەکەوێتە دەست خەڵکی بەبێ ئەوەی کە سوپاسی خوا بکـەن[٦٢]، وە قرپـۆکی و ڕژدی ( شـح ) زۆر دەبێ، وە گەواهی بە درۆدان ( شهادة الزور ) زۆر دەبێ، کەچی شاهێدی بە هـەق دان دەشاردرێتەوە، وە کاری بەد و فاحیشە زۆر دەبێ، وە ناپاکیو دووبـەرەکی و ناکۆکی و رق لێکتربوونەوە و قرچۆکی و خۆپەرستی زۆر دەبێ، وە پەیوەندی سۆز و زەیی دەپچڕێ، وە دراوسێیەکان لەگەڵ یەکتری خراپ دەبن، وە کاتەکان لێك نزیك

---

واتە : لە نیشانەکانی ئاخیری زەمان ئەوەیە کە منال ڕێزی دایكو باوك بەخێوکەرەکەی ناگرێـت ، خەڵکی پێخواسو ڕوتو ڕەجالو شوان و پالەو سەپان کۆشكو تەلاری چەند قات لەسەر یەك دروست دەکەن  وەرگێر.

[٦٢] وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ :

( أن بين يدي الساعة، تسليم الخاصة، وفشو التجارة، حتى تعين المرأة زوجها على التجارة، وقطع الأرحام، وشهادة الزور، وكتمان الشهادة الحق، وظهور القلم ) سلسلة الاحاديث الصحيحة، ژمارەی حدیس/٦٤٧

واتە : لەسەر و بەندی هاتنی ڕۆژی دوایی خەڵك سەلام لە خەڵکی تایبەت وناسیاو دەکا ، بازرگانی فراوانو بلاو دەبێتەوە ، تاوای لێدێ ئافرەت مێردەکەی لەسەر بازرگانی خۆی دادەنێ ، هامۆشۆو پەیوەنـدی ناسـیاویو سـۆزدرای دەپچـڕێت ، شـاهێدی بـەدرۆ دەدرێ ، شـاهێدی هـەقو ڕەوا دەشاردرێتەوە ، زانستو زانیاری بێهودەو نوسین زۆر دەبێت . وەرگێر.

دەبنەوە، وە فـەڕ و پیـت و بەرەکـەت لـە کاتەکانـدا کـەم دەبێتـەوە، وە خـەڵکی هەڵدەچـی و لـە خـۆی بـایی دەبـێ، وە ئاشـوب و ئـاژاوە زۆر ڕوودەدات، وەك پارچەکانی شەوی تاریك[٦٣]، وە خەڵکی خۆیان لە یەکتری پشتاو نەناس دەکەن، وە سوکایەتی بەو ڕەوشتانە ئەکەن کە ئیسـلام بـرەوی پـێ داون، وە زانـاو پایـەداران خۆیان وەك گەنج و هەرزەکاران لێ دەکەن، وە ئاوی فوڕات دەگیرێتەوە و گـەمارۆ دەدرێ لە چیایەکی پڕ لە زێڕ[٦٤]، خەونەکانی بڕواداران ڕاست دەبن و دێنە دی .

وە شاری (مەدینـە) ی پێغەمبـەر (ﷺ) پیسـی لـە خـۆ دووردەخاتـەوە، تـەنها پیاوچاکانی تێدا دەمێنن، دورگەی عەرەب وەك مێرگ و گوزار و ڕۆژی لێ دێ[٦٥]،

---

[٦٣] وەك پێغەمبەری خوای گەورە (ﷺ)دەفەرموێ :

( يكون بين يدي الساعة فتن كقطع الليل المظلم ) جامع الأصول .

واتە : لە کۆتایی زەمان وەکو شەوی تاریك‌وبڕندە ئاشبو ئاژاوە ڕوودەدەن . وەرگێر.

[٦٤] وەك پێغەمبەر (ﷺ)دەفەرموێ:

( لاتقوم الساعة حتى يحسر الفرات عن جبل من ذهب يقتتل الناس عليه، فيقتـل مـن كـل مائـة وتسعون، ويقول كل رجل منهم لعلي أكون أنا الذي أنجو) بخاري .

واتە: قیامەت بەرپا نابێ تا ڕووباری فوڕات نەگیرێتـەوە، ئەوسـا چیایەکی زێـڕاوی دەردەکـەوێ، خەڵکی لەسە رئەو زێڕ و زیو و گەوهەرە یەکتری دەکوژن، بەجۆرێ کە لەسەدا ٩٩٪ کەس دەکوژێت، تەنها یەك کەس قوتاری دەبێت ، هەریەکێك لەوانە خۆزگە دەخوازێ کە ئەو کەسە ئەو بێ قوتاری ببێ. بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرمودەیەکی تردا سەبارە بەوە دەفەرموێ :

( فمن حضره فلا يأخذ منه شيئاً )

واتە: ئەگەر هەر کەسێك بەسەر ئەو گەنجینەیە ڕاگەیشت با هیچ شتێکی لێ هەڵنەگرێتەوە، بەڵکو باڵێ ی دوور بکەوێتەوەو وازی لێ بێنێت. وەرگێر.

[٦٥] وك پێغەمبەر (ﷺ)دەفەرموێت :

وە پیاوێك لە هۆزی (قحطان) پەیدا دەبێ، بەڵام خەڵکی سەرکۆنە و تاونباری دەکەن[٦٦]

وە ڕۆمەکان زۆر دەبن و لەگەڵ موسڵمانانادا دەجەنگن[٦٧]، وە موسڵمانان شەڕ لەگەڵ جوولەکەکان دەکەن، تا وای لێ دێ دار و درەخت و بەردەکان دەڵێن: (ئەی موسڵمان ئا ئەوە جوولەکەیە خۆی لە پاڵی من شاردۆتەوە، دەوەر بیکوژە) رواه بخاری[٦٨]

---

(لا تقوم الساعة.....حتى تعود ارض العرب جنات وأنهاراً) مسلم.

واتە: رۆژی بەرێ داناێ تا خاکی عەرەبان نەبێتە مێرگ و گولزارو باخات (تا خۆش نەبێت) ، هەروەك بەهۆی ئەو هۆکارە پێشکەوتوانەی کە ئێستا هەن وڵاتانی عەرەبی بوونەتە بەهەشتی سەر دونیا. وەرگێڕ.

[٦٦] وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ :

( لاتقوم الساعة حتى يخرج رجل من قحطان يسوق الناس بعصاه ) مسلم وبخاري.

واتە: قیامەت داناێ تا پیاوێکی خوەدان هێز و دەسەڵات و پایە لە هۆزی قەحتان پەیدا نەبێ کە بە گۆچانەکەی خۆی خەڵکی وەپێش خۆی دەدا و لێیان دەخوڕێت، وەرگێڕ.

[٦٧] وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (....يكثر الروم) . واتە: ڕۆمەکان زۆر دەبن. وەرگێڕ.

[٦٨] وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : ( لاتقوم الساعة حتى تقاتل المسلمون اليهود ، فيقتلهم المسلمون، حتى يختبئ اليهودي وراء الحجر والشجر، فيقول الحجر أو الشجر، يا مسلم، يا عبدالله هذا يهودي خلفي فتعال فأقتله إلا الغرقد، فإنه من شجر اليهود ) صحح مسلم .

واتە : قیامەت داناێ تا موسلمانان لەگەل جولەکەکان نەجەنگن ، ئەوسا موسلمانان هێندە لەگەل جولەکەکان دەجەنگن و دەیانکوژن ، تا وای لێ دێ جولەکەکان خۆیان لەپەنای دارودرەختو بەردەکان دەشارنەوە ، ئەوسا دارودرەختو بەردەکان شکات لە جولەکەکان دەکەن و دەڵێن : ئەی

**وە ڕۆژی دوایی داناێ ، تا ڕۆما ئازاد (فتح) نەکرێ هەروەکو قوستەنتینە[٦٩] ئـازا کراوە.**

**وە جگە لەوانەش چەندان بەڵگە و نیشانەی تر هەن کە لە فەرموودەی ڕاستەکاندا هاتوون و سەلمێنراون.**

موسلمان ، ئەی بەندەی خوای گەورە ، ئەوە جولەکەیە خۆی لە پەنای من ناوە وەرە بیکوژە . تەنها داری غەرقەد نەبێ شکاتیان لێ ناکات ، چونکە داری جولەکەکانە . وەرگێڕ.

[٦٩] قوستەنتەنیە: ناوی سەردەمی خەلافەتی ئیسلامییە، ئەو شارەیە کە ئێستا پێی دەگوترێ ( ئەستەمبۆڵ ) کە لە دوای روخانی خەلافەت ئەو ناوەی لێ نراوە، دەور و بەرەکەی دەریاوناوە، پێشتریش لە ساڵی (١٥٠٠) دەکان لە سەردەمی محمد فاتح فەتح کراوە . وەرگێڕ .

# نیشانە گەورەکانی رۆژی دوایی
# علامات الساعة الكبرى

ئەو نیشانانە بەڵگەن لەسەر نزیـك بوونـەوەی و رووداو و بـەرپابوونی رۆژی بـەرێ (الساعة) جا ئەگەر ئەو نیشانانە دەرکەوتن ئەوا هاتنی رۆژی دوایی لەسەر لێوارو وەختی خۆیـەتی ، وە ئـەهلی سـوننە بـەو شـێوەیە بڕوایـان پێیـەتی هـەروەك لـە پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵمان پێ دراوە کە هەندێ لەوانە ئەمانەن :

- دەرکەوتن و پەیدابوونی مەهدی : مەهدی ناوی (محمد کوری عبداللە) یـەو لـە خانەوادە (أهل البيت) ی پێغەمبەرە و، لەرۆژ هەڵاتەوە پەیـدا دەبـێ و ، حـەوت ساڵان دەمێنێتەوە ، و حکومڕانی دەکا ، بەهۆی ئەوەوە زەوی پڕدەبێ لە یەکسانی و دادگەری ، دوای ئەوەی کـە پێشـتر پـڕ بـوە لـە سـتەم و زۆرداری و بـێ دادی ، خەڵکی (ئوممەت) لەسەردەمی ئەودا لەناز و نیعمەتێکدا دەژین ، کە هەرگیز پێشتر ئەو نیعمەتەیان نەدیتوە ، بۆ وێنە : زەوی رووەك و گیا و گوڵ دەڕوێنێ ، ئاسمـان ئاوی خۆی دەبارێنێ ، وەسامان و دارایی بەبێ شومار دەبەخشرێ .
- دەرچوون و پەیـدابوونی دەجـاڵی مـەسـیح[٧٠] : وە دابـەزینی (عیسـای کـوری مریەم) مەسیحە لەکن منارەی سپی رۆژهەڵاتی شاری (شام) ( دیمەشق )[٧١]، وەکو

[٧٠] بۆیە پێی دەگوترێ مـەسیح : چونکە حوکمی ئەو هەموو دنیا دەگرێتەوە ، واتـە هـەمـوو دونیـا دادەگرێ و رەش دەکاتەوە ، وەلایەکی رووی چاوی برۆی پێوەنیە ، وە نەزۆکە وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ : (عقيم لا يلد له) مسلم ، واتە : دەجال کەسێکی نەزۆکە منالی لێ نابێت . وە لە ٤٠ ساڵی دێ . وەرگێر

فەرمانڕەواو دادوەرێك دادەبەزێ کەکار بە شەریعەتی محمد (ﷺ) دەکا ، وەدەججال دەکوژێ و ، لەزەوی دا حوکم بە ئیسلام دەکا ، ئەوکاتەی کە دادەبەزێ کۆمەڵی سەرکەوتوو هەن کەلە پێناو هەق دەجەنگن و ، کۆبووینەوە تا شەڕ لەگەڵ دەجال دا بکەن ، ئەویش لەکاتی بەرپابوون و دەست پێ کردن (إقامة) ی نوێژ دێتە خوارەوە ، نوێژ لەدوای فەرمانـدەی ئەو کۆمەڵە دەکات .

• پەیـدابوونی یـاجوج و مـاجوج و[72]، هەرسـێ داتـەپین و رۆچـونەکانی زەمـین : رۆچونی یەکەم لە رۆژ هەڵاتە و ،هی دووەم لە رۆژ ئاوایە و هی سێیەم لە دوورگەی

---

[71] وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ : ( ينزل عيسى بن مريم عن المنـارة البيضـاء شـرق دیمشـق) صحيح جامع الصغير/ رقم ٨٠٢٥

واتە : حەزرەتی عیسا سەلامی خوای گەورەی لەسەر بێ لـە کۆتـایی زەمـان لـە ئاسمـان لـە لای گومبەتی سپی لە خۆر هەلاتی شاری دیەشق دادەبە زێتە خوارەوە و حوکمی سەر زەوی دەکـات وەرگێر.

[72] یاجوج و مەجوج گەلێکن لەدوو نەتەوە پێك دێن و لە ئاخیری زەمان ێن دونیا داگیر دەکـەن و زەوی فەساد دەکەن . وەك خـوای گـەورە دەفـەرموێ : إِنَّ يَـأْجُوجَ وَمَـأْجُوجَ مُفْسِـدُونَ فِـي الْـأَرْضِ {الكهف/٩٤}

واتە : یاجوج و ماجوج خەلکێکن خراپەکاری لە گۆی زەویدا بەرپا دەکەن .

وە پێغەمبەریش (ﷺ) لە چەندەها فەرموودەدا ئاماژەی پێکردون بۆ وێنە دەفەرموێ :

(ياجوج و ماجوج يحفرون كل يوم حتى إذا كادوا يرون شعاع الشمس...)

واتە : یاجوجو ماجوج هەمو رۆژێ قۆرت لێ دەدەن تا وایان لێدێ تیشکی رۆژ ببینن و دەرکەون.

یا دەفەرموێ : ( يفتح يأجوج ومأجوج يخرجون على الناس...)

واتە : یاجو ماجوج لەسەر خەلك دەردەچنو زۆریەی شوێنەکان داگیر دەکەن .وەرگێر

عەرەبە[٧٣] وە چـرە دو کـەڵێك پەیـدا دەبـێ [٧٤]، وەرۆژ لـە خۆرهەڵاتـەوە هەڵـدێ و دەگەڕێتەوە بۆ رۆژئاوا[٧٥]، وە گیانداڕێکی چوار پێی زەوی ( دابـة الأرض ) پەیـدا دەبێ و قسە لەگەڵ خەڵکی سەر زەوی دەکا [٧٦] وە ئاگرێك پەیدا دەبێ کە خەڵکی کۆدەکاتەوە[٧٧]

---

[٧٣] وەك پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرموودەیەکدا باسی ئەو سێ رۆچونە دەکا و دەفەرموێ :

( ثلا ث خسوف ، خسف بالشرق وخسف بالمغرب وخسف بجزيرة العرب ) مسلم .

واتە : لە کۆتایی زەمان سێ رۆچوون لە زەوی رودەدن، رۆچونێك لە رۆژ هەلات و رۆچونێك لە خۆر ئاواو رۆچونێك لە دورگەی عەرەب رودەدەن . وەرگێر

[٧٤] وەك خوای گەورە دەفەرموێ : فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاء بِدُخَانٍ مُّبِينٍ {الدخان/١٠}

واتە : ئەو رۆژەی کە دونیا تێك دەچێ ئاسمان دەبێتە یەك پارچە هەورو دوکەڵو تەپوتۆزو تەمومژ .

وەپێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێ :

( إن ربكم اتدركم ثلاثا : الدخان ياخذ المؤمن كالزكمة ، ويأخذ الكافر فينتفخ حتى يخروج من كل مسمع منه ) . وەرگێڕ .

وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ :

( لاتقوم الساعة حتى تطلع الشمس من مغربها ، فإذا اطلعت فراها الناس آمنوا أجمعين ، فذاك حين لاينفع نفساً أيمانهم، لم تكن آمنت من قبل أو كسبت في أيمانهم خيرا) فتح الباريء /١١/ ٣٥٢

واتە : رۆژی قیامەت داناێ تارۆژ لە خۆرئاواکەی هەڵنەێ ، کاتێ کە رۆژ لە رۆژ ئاوا هـەڵهات ، دەبینی کە خەڵکی بە تێکرا ئەو بە دەکەن وپەشیمان دەبنەوەو ئیمان دەێنن ، بەڵام ئەگەر کەسێك پێشتر ئیمانی نەهێنابێ و ئیمانەکەی کاری چاکی پێ نەکردبێ ئەو ئیمان هێنانەی ئەوسای هیچ نیە و دادی نادات . وەرگێڕ.

[٧٦] وەك خوای گەورەو دانا دەفەرموێ :

**ئەهلی سوننەو جەماعە : بڕوایان بەهەموو ئەو شتە پەنهان و نادیارانە هەیە کـە لەدوای مردن روو دەدەن ، دەربارەی ئەو شتانەی کـە خـواو پێغەمبەرەکـەی (ﷺ) باسـیان کـردوە ، وەك تـاڵی و ناسـۆریەکانی سـەرەمەرگ و گیـان کێشـان و[78]،**

---

وَإِذَا وَقَعَ الْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَابَّةً مِّنَ الْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ النَّاسَ كَانُوا بِآيَاتِنَا لَا يُوقِنُونَ {النمل/٨٢}

واتە: کاتێ کە بڕیار و فرمانو قسەی ئێمە یان بەسەردا سەپاو قیامەت بەرپابوو ، زیندەوەرێکیان بۆ لەزەوی دەردەهێنن کە قسەیان لەگەڵدا بکات ، ئەگەرچی زۆربەی خەڵکی پێشتر بڕوایـان بـەو ئایەتانەی ئێمە نەبوو . وەرگێر .

[77] وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ :

( وآخر ذلك نار تخرج من اليمن تطرد الناس الى محشرهم ) مسلم.

واتە: دوایین نیشانەی ئاخیری زەمان ئاگرێکە لەیەمەن پەیدا دەبێ کە خەڵکی بەرەو کۆگەی خۆیان (دەشتی مەحشەر)کۆیان دەکاتەوە

وە دەفەرموێ: ( أما أول أشراط الساعة فنار تحشرهم من المشرق الى المغرب) بخاري .

واتە : یەکەم بەلگە و نیشانەی رۆژی دوایی کە پەیدا دەبێ و روودەدات ، پەیدا بوونی ئاگرێکە خەڵك لە خۆر هەلات بەرەو خۆر ئاوا تاودەدات و کۆی دەکاتەوە

وە دەفەرموێ: ( ستخرج نار من حضرموت قبل القيامة تحشر الناس، قـالوا: يـا رسـول الله فمـا تأمرنا؟ قال: عليكم بالشام)جامع الأصول رقم/ ٧٨٨٨.

واتە: بەر لە رۆژی دوایی ئاورێك لە حەزرەموت دەردەچێ کە خەڵکان کۆدەکاتـەوە، گوتیـان ئـەی پێغەمبەری خوا ئەوسا ئێمە چی بکەین باشە؟ . فەرموی: ئەگەر بۆتان دەکری لە شام بن، چونکە ( الشام ارضي الحشر والمنشر)

واتە: شام جێی تێدا بلاوبونەوەو سەرهەڵدان و حەشرکردنی خەڵکیە . وەرگێڕ.

[78] بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) دوعا لە خوای گەورە دەکا تا لە تاڵی و ناخۆشییەکانی ئاویلکە (سکرات الموت) ی بپارێزێ، بۆیە دەفەرموێ:

ئامەدەبوونی فریشتەکانی کاتی مردن و ، دڵخۆش بـوونی بـڕوادار بەگەیشتن بـە خـوای خـۆی[79] ، وە ئامـادەی بـوونی شـەیتان لـەکاتی سـەرەمەرگی مردنـدا ، وەگیرابوونی بڕوا هێنانی مرۆڤی بێ باوەڕ لەکاتی سەرەمەرگدا ، وەبڕواهەبوون بە جیهانی نادیارویەردە ( عالم البرزخ )[80]، وە بەناز و نیعمەتەکانی ناو گۆڕ و، بەسزاو

---

( لقنوا مرتاکم لا اله الا الله ) مسلم/ ج٢، ص٦٣١، رقم/ ٩١٦

واتە: کاتی سەرمەرگ خەڵکانتان بە (لا اله الا الله) تەڕاووگۆش بکەن، چونکە بۆ خۆی سـەبارەت بەوە دەفەرموێ:

( إن للموات سكرات) بخاری .

واتە: بەڕاستی کاتی سەرەمەرگو ئاویلکەی مردن تاڵی و ناسۆری و ناخۆشی زۆرن. وەرگێڕ.

[79] وەك خوای گەورە دەفەرموێ : ( يوم يفرح المؤمنون بلقاء الله)

واتە : لەڕۆژی بەرێ بڕواداران بەگەشیتنیان بەخوای گەورە زۆر شاد و خۆشیاروئاسودە دەبن

[80] . چونکە خوای گەورە دەفەرموێ :

حَتَّى إِذَا جَاء أَحَدَهُمُ الْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ارْجِعُونِ {٩٩} لَعَلِّي أَعْمَلُ صَالِحًا فِيمَا تَرَكْتُ كَلَّا إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَائِلُهَا وَمِن وَرَائِهِم بَرْزَخٌ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ {المؤمنون/١٠٠}

واتە : ئینسان کافرو خوانـەناس لەژیانیـدا هـەر خراپـە و تـاوان و بێـدینی دەکـا تاکـاتێ دەگاتـە سەرەمەرگ و دەکەوێتە ئاویلکە، یا لەناو گۆڕو گلکۆدا لە گوناهوتاوانەکانی پەشیمان دەبێتـەوەو دەڵێ : ئەی پەروەردگارە جارێکی تریش بمگێڕەوە دونیا و مۆڵەتم پێ بدەو مەمرێنە، بـەڵکو کـارو کردەوەی چاکە بکەم، لە گوناهوتاوانەکانم پەشیمان بمەوە ، خـوای گـەورەش پـێ ی دەفـەرمووێ : نەخێر وانیە ، ئەوە تەنها قسەیە کە بۆخۆی دەیکا، دەنا کاری پێناکا ، ئەی ئەوکەسە لە دونیا نە بوو کەچی کارو کردەوەی چاکی نەکرد ، بابزانیت لە پاش مردن و ئەم قسانە، تارۆژی حەشرو حساب و زیندووبوونەوە لەژیانێکی نادیارو پەردە دار لە نێوان مردن و زیندوبوونەوەوحەشرو حساب دادەژیت

ئازارو ئاژاوەکانی ناوگۆڕ ، وە بە پرسیار لیّ کردنی هەردوو فریشتەکانی ناو گـۆڕ ،وە بەوەی کە شەهیدانی ریّ ی خوای گەورە هەمیشە زیندوونـەو لەلایـەن خـوای خۆیان رزق و رۆزی یان هەیە[٨١]، وە بەوەی کە گیانەکانی خەلکی خراپ و شەکەت (أهل الشـقاوة) سزادراون ، وە بڕوای تەواویان بە بەرپابوونی رۆژی دوایـی گـەورە هەیە ، کەتیادا خوای هەمیشە زیندو و زالّ ژیان و زینـدەوەران لـە نێـو دەبـاو ، لەپاشـان بەنـدەکانی خـۆی دەگێڕێتـەوەو زینـدوویان دەکاتـەوە لەهـەموو کـون و کەلەبەرێك ، ئەوانەی کەلە گۆڕەکانیان زیندویان دەکاتەوە[٨٢]، لـەنێو دەسـتەکانی پەروەردگار رادەوستن و ، پاشان لێپرسینەوەیان لەگەلّدا دەکریّ .

---

وە دەفەرمویّ : وَهُوَ الَّذِي مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ هَذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا وَحِجْرًا مَّحْجُورًا {الفرقان/٥٣}.

واتە : خوای گەورە ئەو خوایە و ئەو زاتەیە کە دوو دەریا، یـا دوو جـۆ و روبـار لـەپال یـەك پێـك دەگێنیّ ، یەکێکیان ئاوەکـەی خـۆش و سـازگارەو بەکـەلکی بـەکار هێنـان و خواردنـەوە دیّ و ، یەکێکیشیان تفت و تال و سوێرەو بە کەلکی خواردنەوە نایەت ، لەنێوان هەردووکیانیشد پەردەیەکی داناوە کە لیّ ناگەریّ ئاوەکان تێکەل بەیەکتری ببن ,، لەیەکتریان دەپارێزێت . وەرگێر.

٨١. وەك دەفەرمویّ: وَلاَ تَقُولُواْ لِمَنْ يُقْتَلُ فِي سَبيلِ اللّهِ أَمْوَاتٌ بَلْ أَحْيَاء وَلَكِن لاَّ تَشْعُرُونَ {البقرة/١٥٤}

واتە : هەرگیز بەو کەسانە مە لێن مردون کە لە پێناو خوای گەورە دا کوژراون و شەهید بـوون ، بەلکو ئەوانە زیندوون ، بەلام ئێوە هەست بە زیندوێتی ئەوان ناکەن کە چۆنن .

٨٢. وەك خوای گەورەو میهرەبان دەفەرمویّ :

إِنَّا نَحْنُ نُحْيِي الْمَوْتَى وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ وَكُلَّ شَيْءٍ أحْصَيْنَاهُ فِي إِمَامٍ مُّبِينٍ {يس/١٢}

**وەبڕوایان بەفوکردن بەکەڕانەدا ( بالنفع فی الصور )[83]، هەیە کە بریتییە لـە دوو فوپیاکردن[84].**

**یەکەم / ئەو نەفەخە گەورە و ترسناکەی کە شێوەورووخساری جیهانی پێ دەچەرخێ و ، یاسا و سیستەمی ژیان و دونیای پـێ تێـك دەچـێ ، وە دونیـا و مرۆڤایـەتی دەهاردرێ و لەنێو دەچێ ، وەهیچ شتێك نامێنێ، تەنها خوای پـەروەردگار نـەبێ (کە هەر هەبوە و هەر دەمێنێ ) و هەرگیز لە نێو چون و گۆڕانکاری بەسەر دانای.**

**دووەم : نـەفخی زیندوبوونـەوە و بڵاوبوونـەوەی خـەڵکی بەسـەر زەوی دا ، بـۆ کۆبوونەوەیان لە کۆگە و محشر بۆئەوەی لەخزمەت خوا رابوەستن بۆ لێپرسینەوەیان.**

---

واتە : بێگومان ئێمە لە دوای مردنی ئینسانەکان مردووەکان زیندو دەکەینەوە ، وەهەرچی کردویانە لە کاروکردەوە و شوێنەوارەکانیان دەینوسین ، وەهەموو شتێکمان لە تۆمارو پەرتوکێکی ئاشکراو ئەمیندا دەرزو تۆمارکردووە

وە دەفەرموێ : وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ الْأَجْدَاثِ إِلَى رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ {يس/٥١}.

واتە : دوای مردنی هەموو شتەکانی بونەوەر، فوو بە کەڕانەدادەکرێ ، ئەوسا هەموو مردووەکان لە توێ ی خاك و لەناو ناخی گۆڕەکانیان زیندوو دەبنەوە و بەرەو پەروەردگاریان دەڕژێن

[83] . بە فەرمانی خوای گەورە فریشتە ئیسرافیل نەفخ لێ دەدا. وەرگێڕ.

[84] . وەك خوای گەورە و میهرەبان دەفەرموێ :

يَوْمَ تَرْجُفُ الرَّاجِفَةُ {٦} تَتْبَعُهَا الرَّادِفَةُ {النازعات/٧}

واتە : لەرۆژی بەرێ کاتێ کە فوو بە کەڕانەدا دەکرێ ، دونیا هەمووی دەلەرزێ و تێك دەچێ و وێران دەبێ ، پاشان جارێکی تریش لەدوای ئەو فوو بە کەڕانەدادەکرێ بۆ زیندوبوونەو و حەشرو حسـاب لەگەڵداکردن . وەرگێڕ.

وە بڕوایان بە زیندووبونـەوە و کۆبوونـەوە و لێپرسـینەوە هەیـە کـە خـوای گـەورە خەڵکەکەی لە گۆڕەکانیان زیندو دەکاتەوە ، وەخەڵکی لـە بەرانبـەر خـوادا بـەپێ پەتی و بەسەر کۆتی و بەڕوتوڕەجالیو بە سوننەت نەکراوی رادەوەستن[85]، تا ئەو کاتەی کە رۆژ زۆر شۆڕ دبێتەوە سەریا ،وەهەندێکیان لەبەر گەرمای رۆژ تالغاو لە ئارەقی خۆیان رۆدەچن. وە یەکەم کەسیش کە زیندو دەکرێتـەوەو لـەزەوی دەردێ پێغەمبەرە (ﷺ) .

وەلەو رۆژە سەرسام و پڕ مەترسیە دا هەموو خەڵکی بـە فـەرمانی خـوای گـەورە لەیەك کاتدا لە گۆڕەکانیان دێنە دەرێ ، دەڵێ ی کلۆ (جراد) ن بەزەوی دا پەرش و بڵاوەبن ، زۆر بەخێرا بەسەر شۆڕی بەدەم پەڕاوی کاروکردەوەکـان یـان دەچـن ، ئەوسـا پیـاو خـراپ و پیـاو چـاکان دەردەکـەون ، روتو قـوتو خـۆ داپۆشـەران دەردەکەون ، ئەو کەسانە دەردەکەون کە شتیان لە دڵەکانیان دا شاردۆتەوەو خۆیان لەبەرگی ئاین دا پـەنا داوە ، وەلـەو رۆژەدا خـوای گۆیـا بـەبێ وەرگێرانـی زمـان (ترجمان) قسە لەگەڵ بەندەکانی دا دەکات ، هەر کەسە و بـەناوی خۆیـو بـەناوی بابەکانی بانگیان دەکرێت .

وەبڕوایان بـە تـەرازوو هەیـە کـە دوولاتـرزاوی هەیـەو کاروکردەوەکـان (صـحائف الاعمـال) خـەڵکی پێـی پێوانـەو کـێش دەکـرێ ، دوای ئـەوە هـی وا هەیـە کـە پەراوەکانی خۆی بەدەستی راستی وەردەگرێتەوە[86]، ئەوە کەسێکی سـەرکەوتوو و

---

[85]. وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ :

(حفاة عراة غرلاً) بخاری/ ج٤، ص١٧٦٦، رقم/ ٤٤٦٣ و مسلم/ ج٤، ص٢١٩٤، رقم ٢٨٥٩.

واتە : بە پێخواسیو بەپێ پەتی و بە روت و رەجالی و بە سوننەت نەکراوی .وەرگێڕ.

[86]. ئەو کەسەیان سەرفراز و بەختیار و بە هەشتییە وەك خوای گەورە دەفەرموێ:

بەهەشـتیە ، وە ئـی واش هەیـە کتـابی کاروکردەوەکـانی بـە دەسـتی چـەپی وەردەگرێتەوە[87]، یالە پشتەوە را ( وراء الظهر) وەردەگرێتەوە[88]، ئەوەش کەسێکی دۆڕاوو دۆزەخییە.

پـردو ڕایـەل (صـراط) لەسـەر پشـت (مـتن) ی دۆزەخ دانـراوەو هەلواسـراوە ، پیاوچاکانو بەهەشتیەکان لەسەری ڕەت دەبن و دەپەڕنەوە ، بـەڵام خراپـەکاران و دۆزەخیەکانی لێ گیر دەبن و دەکەونە نێو ئاگری دۆزەخەوە

بـیر و بڕوایـان وایـە کەبەهەشـت و جەهەنـەم ، دوو دروسـتکراوی خـوای گـەورەن، ئێستاهەن و هەرگیز لەناو ناچن[89]، بە هەشت خانە و ماڵی بڕواداره راستەقینە و

---

فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ {٧} فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا {الإنشقاق/٨}.

واتە : ئەوکەسەی کە لە ڕۆژی بەرێ لەکاتی حەشرو حساب لەگەڵداکردنیدا نامـە و پـەڕاوی کـارو کردەوەکانی بە لای ڕاستی دا وێ دەدرێتەوە ، ئەوکەسە لێپرسینەوەیەکی ساناو سادەی لەگەڵدا دەکرێ و، دەچێتە بەهەشتەوە . وەبە پێچەوانەوە ش . وەرگێڕ.

[87]. ئەو کەسەیان سەرشۆڕ و شەکەت و دۆزەخییە وەك خوای گەورە دەفەرموێ:

وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ وَرَاء ظَهْرِهِ {١٠} فَسَوْفَ يَدْعُو ثُبُورًا {١١} وَيَصْلَى سَعِيرًا{الإنشقاق/١٢}

واتە : ئەوکەسەی کە لە ڕۆژی بەرێ لەکاتی حەشرو حساب لەگەڵداکردنیدا نامـە و پـەڕاوی کـارو کردەوەکانی بە لای چەپی دا، لە پشتەوەیرا وێ دەدرێتەوە ، ئەوکەسە لێپرسینەوەیەکی سـەخت و ئەستەمی لەگەڵدا دەکرێ و، ئەوسا هاوارو دادو شین و واوەیلای لێ بەرز دەبێتە ، دەچێتە نێو ئاوری دۆزەخەوە . وەرگێڕ.

[88]. بۆیە دەفەرموێ لە پشتەوەی را، چونکە پیاوی دۆڕا و و سەرشـۆڕ هەمیشـە بـێ ڕوە و شـت ڕوبەڕو وەرناگرێ، بەڵکو لە شەرمان بەلاتەنیشتی وەردەگرێ، وەرگێڕ.

[89]. بەڵێ ئەهلی سوننە هەموویان لەسەر ئەوە کۆکن کـە بەهەشـت و جەهەننـەم ئێسـتا هـەن و دەمێنن، بەبەڵگەی ئایەتی خوای گەورە کە سەبارەت بە بەهەشت دەفەرموێ :

وَسَارِعُواْ إِلَى مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ {آل عمران/١٣٣}

واتە : پەلە بکەن بۆ لێخۆشبوونی خـوای گـەورەو بەهەشـتێك کـە پانتاکـەی ئاسمانـەکان و زەوی گرتۆتەوە و ، بۆ خواناسان و پارێزکاران ئامادەکراوە

وە دەفەرموێ : سَابِقُوا إِلَى مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا كَعَرْضِ السَّمَاء وَالْـأَرْضِ أُعِـدَّتْ لِلَّـذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ ذَلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاء وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ {الحديد/٢١}.

واتە : پەلە و پێشبڕکێ بکەن بۆ لای لێخۆشبوونی پەروەردگارتان و بەهەشتێك کە پانتاکەی وەك پان و بەرینی ئاسمان و زەوی یە و ، بۆ ئەو کەسانە ئامادەکراوە کە بروای تەواویان بە خـوای گـەورە و بەرۆژی دوایی هەیە ، ئەوە فەزل و بەخششی خوای گەورەیە بەکەسێکی دەدا کە دەیەوێ ، خـوای گەورە خاوەنی فەزل و بەخششێی زۆرو زەوەندە

وە سەبارەت بە جەهەننەم دەفەرموێ :

وَاتَّقُواْ النَّارَ الَّتِي أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ {آل عمران/١٣١}

واتە : لەو ئاگرە بترسن ، خۆتان لەو ئاگرە بپارێزن کـە خـوای گـەورە لـەرۆژی دوایـی بـۆ کـافرو بێباوەران ئامادەی کردووە

وە دەفەرموێ : إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتْ مِرْصَادًا {٢١} لِلطَّاغِينَ مَآبًا {النبأ/٢٢}

واتە : لە رۆژی دوایی دۆزەخ بـۆ کـافرو بێبـاوەرو خوانەناسـان لـە بۆسـەدایە ، جێگـای تـاغی و خوانەناسانە ، ئەوانەی لە ستەم و بێباوەریدا رۆچوون و هەموو سنوریان بەزاندووە

بەکورتی : بەهەشت بۆ ئیمانداران‌و دۆزەخ بۆ بێباوەر وتاوانباران سازوئامادەکراوە ، بەهەشت لەبەر بەهەشتیەکان بە هەمیشـەیی دەمێنێتەوە تا تیایدا بژین، وە دۆزەخیش بە هەمیشـەیی دەمێنێتەوە تا تیادا بمێننەوە تا هەتا هەتایە

وە پێغەمبەریش(ﷺ) سەبارەت بەوە دەفەرموێ :

( إن أحدكم اذا مات عرض عليه مقعده بالغداة والعيشي ، إن كان من أهل الجنة فمن اهل الجنة ، وان كان من أهل النار فمن اهل النار، يقال هذا مقعدك حتى يبعثك الله يوم القيامة ) بخاری/ ج١، ص٤٦٤ ، رقم ١٣١٣ و مسلم ج٤، ص٢١٩٩، رقم ٢٨٦٦

یەکتاپەرست و لەخوا ترسەکانە و، دۆزەخیش جێی بێ باوەرە هاوبەشی پەیدا کەر و گاور و جولەکەو مسقۆف و خوانەناس و بت پەرستو گوناهبار و دووڕوەکانە.

ئاگر و جەهەننەم بۆبێ باوەڕان (کفار) هەردەمێنێ و لەنێو ناچێ [90]، وە بەهەشتیش بۆ ئیمانداران لەرۆژی دوای هەر دەمێنێ و لە نێو ناچێت . خوای گەورە بەهەشت و جەهەننەمی بەر لە بوونەوەر دروست کردون .

وە بڕوایان وایە کە ئۆممەتی (محمد) (ﷺ) یەکەم ئۆممەتە کە موحاسەبەی دەکرێ ، وە پێش هەموو نەتەوەکانی تریش دەچێتە بەهەشتەوە [91]، نیوەی بەهەشتیەکان ئەوانن ، حەفتا هەزار کەس لەوان بە بێ حیساب دەچنە بەهەشت[92]

---

واتە : هەریەکێك لە ئێوە ئەگەر مردن بەبەیانیان و بە ئێواران شوێنی خۆی پیشان دەدرێت ، ئەگەر ئەوکەسە بەهەشتی بوو ، شوێنی خۆی لەبەهەشت پیشان دەدرێت ، ئەگەر ئەوکەسە دۆزەخی بوو ، شوێنی خۆی لەدۆزەخ پیشان دەدرێت . پێی دەگوترێ ئەوە شوێنەکەتە تارۆژی دوای خوای گەورە زیندوت دەکاتەوە . وەرگێڕ.

() چونکە : بەئەندازەی گوناهەکانیان سزا دەدرێن و پاشان بە لێخۆشبوونی خوای گەورە دەگەڕێنەوە ناو بەهەشتی پان و بەرین و نە بڕاوە.

[90]. چونکە: بێ باوەڕان لە دۆزەخدا هەمیشەیی (أبدي) ین، بۆیە دەبێ دۆزەخەکەش هەر بمێنێ. وەرگێڕ.

[91].وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (أنا اول من يقرع بـاب الجنـة) مسلم/ ج١، ص١٨٨،رقم ١٩٦.

واتە: من یەکەم کەسێکم کە دەرگای بەهەشت دەکەمەوە و دەچمە بەهەشتەوە، ئیمامی ئەبو بەکری صدیق لە دوای من پێش هەموو خەڵکی دەچێتە بەهەشتەوە، وە ئۆممەتی من پێش هەموو ئۆممەتێکی تر دەچێتە بەهەشتەوە، وەرگێڕ.

[92]. وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ :

وە بڕوایان وایە کە یەکتا پەرستان بەهەمیشەیی لە ئاگردا نامێننەوە ,ئەوانەی کە بەهۆی تاوەنەکانیانەوە چونەتە دۆزەخ، وەلێ هاوبەشـیان بـۆ خـوای گـەورە پەیـدا نەکردووە، چونکەهاوبەش پەیدا کەران بە هەمیشەیی لە نێو دۆزەخدا دە مێننەوەو هەرگیزلێی دەرناچن.

وە بڕوایان وایە کە کە کانیاو و ئەستێرك (حوض) ی پێغەمبەر (ﷺ) لە گۆرەپانی رۆژی دوایی یەو ئاوەکـەی زۆرلـە شـیر سـپی تـرە ، وە لەهـەنگوین شـرین تـرەو، بۆنەکـەی لـە میسـك خۆشـترە ، وە گـلاس و پـەرداخ و دەفرەکـانی ژمارەیـان لـە ئەستێرەکان زیاترە ، وەپانایییەکەی یەك مانگە رێ یەو درێژییەکەشی یەك مانگـە رێ یە، هەر کەسێ لێ ی بخواتەوە هەرگیز جارێکی تر تێنووی نابێ ، ئەو ئـاوەش لەو کەسە قەدەغەیە کەشتێك لە ئایینەوە دادێنێ و دروستی دەکات .

وەك پێغەمبەری خوای گەورە دەفەرمووێ:

**حوضي مسيرة شهر ، مـاؤه ابـيض مـن اللـبن ، وريحـه اطيـب مـن المسـك ، وكيزانه كنجوم السماء ، من شرب منها فلا يظمأ أبدا . بخاري .**

واتە : لە رۆژی دوایی کانیاوی من بەقەد مانگە رێ یەك دورو درێژە ، ئاوەکەی لە شیر سپی تر ، پەرداخ و کوپەکانی بەقەد ئەستێرەکانی ئاسمان زۆرن ، هەرکەسێك جارێك ئاوی لێ بخواتەوە ، جارێکی تر تێنوی نابێت .

---

(أعطيت سـبعين الفاً من أمتي يدخلون الجنة بغير حساب وجههم كالقمر ليلـة البـدر....) صـحيح الجامع/ ١٠٦٨

واتە: لەلایەن خوای گەورە پێم دراوە کە حەفتا هەزار کەس لە ئۆمەتم بەبێ حیساب لەگەڵدا کردن دەچنە نێو بەهەشتەوە کە دەموچاو و رەنگو روخساریان وەکو مانگی شەوی چواردە دەدرەوشێتەوە. وەرگێڕ.

وە دەفەرمووێ: **إني فرطكم على الحوض ، من مر على شرب ، ومن شرب لم يظمأ أبدا ، ليردن ، على أقوام أعرفهم ويعرفونني ، ثم يحالُ بيني وبينهم .**
واتە : لە ڕۆژی دوایی من لەسەر کانیاوی ئاوی کەوسەر دادەنیشم و چاوەڕێ تـان ئەکەم و کار ئاسانی تان بۆ ئەکەم ، هەرکەسێك بێتەلای من و بەسەرمدا ڕەت بێ لەو ئاوە ئەخواتەوە ، هەرکەسێك لەو ئاوە بخواتەوە قەت جارێکی تر تینوی نابێ ، لەو ڕۆژەدا هەندێ کەس دێنە لام و بەسر مندا ڕەت دەبن ، من ئەوان ئەناسـم و ئەوانیش من ئەناسن ، پاشان قسە لە نێوان من و ئەواندا دەکرێ . لە ریوایە تێکی تر دا دەفەرموێ :
**فأقول : إنهم مني ، فيقال إنك لاتدري ما أحدثوا بعدك ، فأقول : سحقا سحقا لمن غير بعدي . البخاري .**
واتە : من ئەلێم ئەوانە لە منن ، کەچی دەگوترێ ، تۆ نازانی لـە دوای تـۆ چـی رویداوە و ئەوانە چیان کردوە ، ئەوسا منیش ئەلێم ، دورکەوتنەوە و مال وێرانی و تێشکان بۆ ئەو کەسەی کە لە دوای من خۆی (ئاینەکەی ) گۆڕیووە
وە بڕوایان وایە کەتکا بۆ کردن (شفاعة) و پایەو جێی ستایش کردن (مقام محمود) ی پێغەمبەرەکەمان(ﷺ) هەیە ، وە شەفاعەتی ئەو بۆ خەڵکی راوەستاوی دەشتی مەحشەرە ، تا خوای گەورە بڕیاری جوێ بوونەوەی بەهشتیەکان و جەهەننەمیەکان لێکتریان بۆ دەدا ، وە شافاعەتی ئەو بۆ بەهشتیەکان تا بچنە بەهەشـتەوە ، کـە خۆشەویست یەکەم کەسە دەچێتە بەهەشتەوە ، شەفاعەتی ئەو بۆ (أبی تالیب) ی مامەکەی ، تاخوای گەورە سزای لەسەر سووك بکا

ئەوسێ شەفاعەتانەش تەنها تایبەتن بە پێغەمبەر (ﷺ) بۆ بەرز بوونـەوەی پلـەی هەندێ لە ئۆممەتەکەی لەوانەی کە چونەتە بەهەشت ، بەرزتر ببنەوە ,وەشەفاعەت بۆ کۆمـەڵێك دەکا لە ئۆممەتەکەی خۆی تا بەبێ لێپرسینەوە بچنە بەهەشت .

وەشەفاعەت بۆ خەڵکانێك دەکا کە کـاروکردەوەی چـاکە و خراپـەیان وەکـو یـەك (یەکسان) ە شەفاعەتیان بۆ دەکا ، تا بچـنە نـاو بەهەشـتەوە ، وەشـەفاعەت بـۆ خەڵکانێك دەکا کە فەرمانیان پێ کراوە بچنە دۆزەخەوە تا نەچنە نێو دۆزەخ .

وە شەفاعەت بۆ کەسانێکی شیاو دەکا تا سزایان لەسەر سووك بکرێت .

وەشەفاعەت بۆ یەکتاپەرستە گوناهبارەکان دەکا لە تا لەئاگر بێنە دەرێ و، بچنە بەهەشتەوە

وە فریشتەکان و پێغەمبەران و شەهیدان و پیاو چاکان و راستگۆیان و بڕوادارانـی راستەقینەیش بەشداری لەو شەفاعەت بۆکردنە دەکەن ، دوای ئەوە خـوای گـەورە خەڵکانێك بەبێ شەفاعەت بۆ کردن بەفەزل و بەرەحمەتی خۆی لە ئاگریان دەردێنێ و دەیان خاتە بەهەشتەوە ، بەڵام بێ باوەڕان ( کفار ) هـیچ شـەفاعەتێکیان بۆنیە و

هەر لەدۆزەخدا دەکولێن و دەمێننەوە.

وە کاروکردەوەکانی چاکی بڕوادار لەو رۆژەداشەفاعەت بـۆ خاوەنەکـەی دەکـات ، هەروەك پێغەمـبەر ﷺ دەفەرمووێ :

الصيام و القران يشفعان للعبد يوم القيامة . صحيح الجامع الصغير ى البانى رقم ٣٨٨٢

واتە : رۆژو و قورئان لە رۆژی دوایی تکای لێ خۆشـبون بـۆ بەنـدە خاوەنـەکانیان ئەکەن لەبری ئەوەی کە بەرۆژو بوون یا قورئانیان خوێندووە

وە خوای گەورە دەفەرمووێ :

وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْآزِفَةِ إِذِ الْقُلُوبُ لَدَى الْحَنَاجِرِ كَاظِمِينَ مَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ حَمِيمٍ وَلَا شَفِيعٍ يُطَاعُ {غافر/١٨}

واتە : ئەی محمد ﷺ ئاگادارو بێداریان بکەوە سەبارەت بەو رۆژەی کە لە ترس و خەفەتان خەڵك دڵیان ئەگاتە قوڕگیان ، لەو رۆژەدا ستەمکاران دۆستو پشتیوان و تکاکارێکیان نیە کە تکایان بۆ بکاو بەگوێ ی بکرێت .

وە دەفەرمووێ :

فَمَا تَنفَعُهُمْ شَفَاعَةُ الشَّافِعِينَ {المدثر/٤٨}.

واتە : رۆژی دوایی رۆژێکە شەفاعەتی هەموو شەفاعەتکارێك سودو قازانجیان پێ ناگێنێت .

وەلەو رۆژەدا مردن نامێنێ و دەردەهێنرێ و لەبەرچاوی خەڵك سەری دەبڕێ .

هەروەك پێغەمبەری خوا دەفەرموێ :

( إذا صار أهل الجنة الي الجنة ، وصار أهل النار الي النار ، أتى بالموت حتى يجعلون بين الجنة والنار ثم يذبح ، ثم يناد مناد : يا أهل الجنة لاموت و ياأهل النار لاموت ، فيزداد أهل الجنة فرحا إلى فرحهم و يزداد أهل النار حزنا إلى حزنهم) مسلم .

واتە : کاتێ کە ئەهلی بەهەشت چونە بەهەشت و ئەهلی جەهەننەمیش چونە جەهەنەم ، مردن دەهێنن و لەنێوان بەهەشت و جەهەننەم دادەنرێ و ، لەبەر چاوی خەڵکەکە سەری دەبڕدرێت ، لەپاشان بانگەرێك بانگ دەکا و و دەڵێ : ئەی خەڵکی بەهەشت ، ئەی خەڵکی جەهەننەم ، تازە مردن نەماو تەواوبوو ، جابەوە بەهەشتیەکان زیاتر شاد و دڵخۆش دەبن ، وە جەهەننەمیەکانیش زیاتر دڵتەنگ و خەمناك و خەفەتبار دەبن ، ئیمامی مسلم گێراویتیەوە

## پایەی شەشەم ( الركن السادس )

## بڕوا هەبوون بە بڕیار و ئەندازەی گیری خوای گەورە ( الإيمان بالقدر )

ئەهلی سوننە و جەماعـە : بیروباوەڕی تەواوو نەگۆڕیان وایە کە هـەموو چـاکە و خراپە (خێر و شەڕ) ێك بەویست و بڕیارو ئەندازە گیری خوای گەورە دەبێ ، وەهیچ شتێك لە نەخشەو بەرنامەو حەز و ئارەزووی ئەو بەدەر نیە ، وەخوای گەورە هەموو شتێکی زانیوەو ئاگادارە بەوەی کە بوە و دەبێ ، بەر لەوەی کە ببێ، لەسەرەتا ( أزل ) ە وە زانیویەتی ، وەئەندازە گیری (تقدير) ی هـەموو شـتەکانی بونـەوەری کـردوە بەپێی زانست زنیاری و ویست و فەرمان و بریار ی خۆی هەر لە پێشترەوە ، واتا بەر لە ئەنجامدانی ، وەکاروکردەوەوئاکارو رەوشتی بەندەکانی خۆی وەك خواردن و خۆراك و ماوەی ژیانو کاتی مردن و... هتدی زانیووە و بۆی بڕیارداون ، هەر لە پێشترەوە ، واتا بەر لـە ئەنجامـدانی، وە جگـە لـەو کاروبارانـەش بـەڵکو هـەموو رووداوێـك لە(زانسـت و ویسـت و توانـا و فـەرمـان..)ی ئـەو دەردەچێت، بـەکورتی و پـوختی سەبارەت بەهەموو شتێك ئەوەیە کە پێشتر خوای گەورە زانیویـەتی و ئاگـادرە، وە پێنوس (قلم) ی لیێ داوە کە ببێ، بۆیە روویداوە، یا نەبێ، بـۆ یـە نـابێ، دەربـارەی هەموو بووەکانی ناو بوونەوەرەکانی بریاری داوە تارۆژی دوایی .

هەروەك خوای گەورە بۆ خۆی دەفەرمووێ :

سُنَّةَ اللَّهِ فِي الَّذِينَ خَلَوْا مِن قَبْلُ وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا {الأحزاب/٣٨}

واتە : ئەوە سوننەت و سروشت و یاسا و رێساو بریاری خوای گەورە یە کە لە نێو پێغەمبەران و گەلەکانی پێش ئێوەشدا بووە ، فرمانی خوای گەورەش شتێکی بریار لەسەر دراو و ئەندازە گیراوە

وە دەفەرمووێ : وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيراً {الفرقان/٢}.

واتە: خوای کردگار هەموو شتێکی بونەوەری دروست کردوە، وە ئەندازەی ژیان و هەموو شتەکانیشی بۆ گرتوە بە ئەندازەیەکی ووردوتەواو[٩٣]

إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ {القمر/٤٩}.

واتە : بێگومان ئێمە هەموو شتێکمان بەئەندازە و پێوانە دروستکردوەو لەناو چونیشمان بۆ بڕیارداون[٩٤]

---

[٩٣]. وەك دەفەرموێ: أَلاَ لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ تَبَارَكَ اللّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ {الأعراف/٥٤}

واتە: ئەی خەلکینە ئێوە باش ئاگادار بن کە دروستکردن و کار و فەرمان هەر هەمووی هی خوای گەورەو بەدەست خوای گەورەیە ، وە خوای گەورەش باشترین دروستکەرە، وە مرۆڤیشی لە جوانترین شێوە و ڕوخسار دروست کردوە، وەك دەفەرموێ :

لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ {التين/٤}

واتە: بێگومان ئێمە ئادەمیزادمان لە جوانترین شێوە و روخسار و پەیکەر دروست کردوە ، وەك دەفەرموێ : الَّذِي خَلَقَ فَسَوَّى {الأعلى/٢}

واتە: خوای گەورە ئادەمیزادی دروست کردوەو، لە جوانترین شێوە رێکی خستوە، وەرگێر.

[٩٤] وەك خوای گەورە دەفەرموێ : وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ قَدَراً مَّقْدُوراً {الأحزاب/٣٨}

واتە : فەرمانەکانی خوای گەورە هەمووی بەئەندازە و ئەندازە گیریە

وەپێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ : ( لا يؤمن عبد حتى يؤمن بالقدر خيره وشره ، وحتى يعلم ما أصبه لم يكن ليخطئه ، وإن ما أخطأه لم يكن ليصيبه) ترمذي . ج ٤ ، ص / ٤٥١ ، ٢١٤٤

واتە : ئینسانی بەندە بیروباوەڕی تەواو نابێ تاباوڕای تەواوی بە قەدەرو بڕیاری خوای گەورە نەبێ لە رووی چاکەو خراپەوە کە دەیهێنێت ، وە تاوانەزانێ ئەوەی کە توشی دەبێ بۆ ئەوە نیە تابەهەلە

ببێ و دوچاری گوناهو تاوان ببێ ، وە ئەو هەڵەو گوناهو تاوانانەش کە دەیکات بۆ ئەوە نیە کـە خێرو پاداشتی لەسەر بدرێتەوە . وەرگێڕ .

وەخوای گەورە دەفەرموێ : وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيراً {الفرقان/٢}

واتە : خوای گەورە و میهرەبان هەموو شتێکی بە ئەندازە و بریارو بێ کەموکوڕی دروست کردووە .

وە دەفەرموێ : إِذْ أَنتُم بِالْعُدْوَةِ الدُّنْيَا وَهُم بِالْعُدْوَةِ الْقُصْوَى وَالرَّكْبُ أَسْفَلَ مِنكُمْ وَلَوْ تَوَاعَدتُّمْ لاَخْتَلَفْتُمْ فِي الْمِيعَادِ وَلَكِن لِّيَقْضِيَ اللّهُ أَمْراً كَانَ مَفْعُولاً لِّيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَن بَيِّنَةٍ وَيَحْيَى مَنْ حَيَّ عَن بَيِّنَةٍ وَإِنَّ اللّهَ لَسَمِيعٌ عَلِيمٌ {الأنفال/٤٢}

واتە : ئەی هاوەڵینە یادی ئەورۆژە بکەنەوە کە ئێوە لە دامێنی خوارەوەی دۆڵەکە بوون ، نزیك بوون لە مەدینە ، ئەوانیش (کافرەکان) لەسەرووی دۆڵەکە بوون ، دورتر بوون لە مەدینە ، کاروانەکەش لە خوارتانەوە بوو ، ئەگەر بریارتان بدابایە کە بەیەك بگەن و شەر بکەن ، ئەوا شەرتان لە نێواندا دروست دەبوو ، وەلێ خوای گەورە دەیەوێ بارودۆخێك پێشبهێنێت کـە خـۆی دەیـەوێت و بریـاری لەسەر داوە ، بۆئەوەی ئەو کەسە لەناو بچێت کە لە زانست و ویستی خوای دا لە ناو چووە ، وە بۆ ئەوەی ئەو کەسە ی لە زانست و ویستی خوای گەورەدا لەسەر چاکە و دینداریە لە ژیانـدا لەسـەر چاکە و دینداری و خواستی خوای گەورە و بەڵگە و بەرچاو روونی بژیت .

وە دەفەرموێ : سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى {١} الَّذِي خَلَقَ فَسَوَّى { ٢} وَالَّذِي قَدَّرَ فَهَدَى {الأعلى/٣}.

واتە : ناوی خوای پەروەردگاری بالات بەپاکی بگرە و بێنە ، ئەو خوایەی کە بوونەوەری دروستکردوە و رێکی خستووە ، ئەو خوایەی کە بوونەوەری تەقدیرو کردووە ورێنمای کردووە

وە دەفەرموێ : أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاء وَالْأَرْضِ إِنَّ ذَلِكَ فِي كِتَابٍ إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ {الحج/٧٠}

واتە : ئایا نازانی خوای گەورە ئەوەی لەئەرزو ئاسمانە دەیزانێ ، ئەوە لە پەرتووکی خوای گەورە دایە ، ئەوە لەسەر خوای گەورە زۆر سوك و ئاسانە

وە پێغەمبەری رابەریش (ﷺ) دەفەرموێ : ( هەموو بەندیەك بیروباوەری تەواونابێ تا بڕوای تەواوی بەخێر و شەری قەدەر نـەبێ کـە لەلایـەن خـوای گەورەوەیـە ، وە هەتاوانە زانێ ئەوەی کە دووچاری دەبێ بۆ ئەو نی یە کە بە هەلە بپردرێو توشی گوناهوتاوان بێ، وەکە تووشی هەلەو گوناهو تاوانیش دەبێ بۆ ئەوە نیە کەتووشی نارەحەتی ببێ . صحیح ترمذي/ الباني .

**ئەهلی سوننەو جەماعە** : دەڵێن بڕوا هەبوون بەقەدەر بە چـوار شت نـەبێ دانـا مەزرێ ، ئەو شتانەش بە پلەو پایەکانی قەدەر ناو دەبەن یا بەڕوکنـەکانی قـەدەر ناویان دەبەن و ئەو شتانەش دەروازەیەکن بۆ تێگەیشـتن لـە مەسـەلەی قـەردەر ، وەبڕوا هەبوون بەقەدەریش دانا مەزرێ تەنها بـە هاتنـەدی پلەوپایـەکانی نـەبێ ، چونکە هەندێك یان پابەندن بەهەندێکیانـەوە ، وەهـەر کەسـێ بـڕوای تـەواوی بـە هەموو ڕوکنەکانی قەدەر نەبێ ئیمانی دانامەزرێ ، ئەگەر ئیمانی بەیەك لەم پایانە نەبێ یا بەزیاتر ، ئەوا کەموکوڕی لە ئیمان هەبوونەکەیدا هەیە و ئیمـانی تـەواو نابێ سەبارەت بە قەدەر.

---

وە دەفەرموێ : لِكَيْلَا تَأْسَوْا عَلَى مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا بِمَا آتَاكُمْ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ {الحديد/٢٣}.

واتە : بۆ ئەوەی خەم و خەفەت لەسەرئەوە نەخۆن کە لەدەستتان چووە و نەماوە ، وە بەوەش شاد و دلخۆش نەبن کە پێتان دەدرێ و بۆتان دێت ، خوای گەورە خەلکی خۆبەزلزان و خۆگەورە گـرو بـە فیزو فەخر فرۆشی خۆش ناوێت .

وە چەندان ئایەتی تر لە قورئانی پیرۆزدا سەبارەت بە قەزاو قەدەر هاتوون . وەرگێر

## پلە و پایەی یەکەم/ زانست و زانیاری ( العلم ):

بریتی یە لە بڕوا هەبوون بەوەی کە خوای دانا ئاگادارە بە هەموو ئەو شتانەی کە بووەو، بەهەمـوو ئەوانەی کە نەبووینە، وە بەوانەی کە نابن، یا ئەگەر بن چۆن دەبن‌وکـەی دەبـن ، بـە تێروتەسـەلی پـێ یـان ئاگـادارە، وە خـوای زانـا بـەر لـە دروسـتکردنی دروسـتکراوەکان زانیویـەتی کـەچ؟ دەکـەن، وە هـەر لـە سـەرەتاوە خواردن و خۆراك و ماوەی ژیان و مردن و جم و جۆڵ و کاروکردەوەکانی زانیـون‌و پێیان ئاگادارە، وە کێ لەو مرۆڤانە خراپ (شقی) ە و کێ یـان بەختـەوەر و چـاك (سعید) ە، ئەوەش بەهۆی زانایی‌ودانایی خۆی دەزانێ کە هەر لە ئەزەلـەوە ئـەو زانستەی هەیە .

وەك خوای گەورە دەفەرمووێ : إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ {التوبة/١١٥

واتە : خوای گەورە بە هەموو شتێك ئاگادارو زانایە

## پلە و پایەی دووەم / نووسین ( الكتـابة ):

بریتی یە لە بڕوا هەبوون بەوەی کە خوا ی گەورە بە زانست‌وزانیاری خۆی ماوە و ئەندازەی هەموو دروستکراوێکی پێشتر لـە تەختـەی پـارێزراو (لـوح المحفـوظ) دا نوسیوە و، وە پێش دروستکردنەکانی خستووە، لەوح کتێبێکە زێدە و کـەمی لـە هیچ شتێکدا نەکردوە، بەڵکو هـەموو شـتێکی کـە بـووە یـا دەبـێ، وە هـەموو دروستکراو (بونەوەر) ێك وەك خۆی تا ڕۆژی دوایی لەلایەن خواوە لە (أم الكتاب) = (ذکـر) = (إمـام) = (کتـاب المـبین) دا نوسـراو و پـارێزراوە، وە پێغەمبـەریش (ﷺ) فەرمویەتی :

یەکەم شت کە خوای گەورە دروستی کرد، قەڵەم بوو[٩٥]، پێی فەرموو بنوسە، قەڵەم گووتی: چی بنووسم؟ خوای گەورە فەرمووی : هەموو ئـەوە بنوسـە کـە هەیـە، و ئەوەی کە دەبێ تا دونیا دونیایە، سنن ترمزی/ ئەلبانی .

وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

وَكُلَّ شَيْءٍ أحْصَيْنَاهُ فِي إِمَامٍ مُبِينٍ {يس/١٢}

واتە : ئێمە هەموو شتێکمان لە پەرتوك و پەراوێکی دیـارو ئاشـکرادا بـە نوسـین دەرزو تۆماو ئەژمار کردووە .

وەك پێغەمبەر خوای گەورە (ﷺ) دەفەرموێ :

إن أول ما خلق الله القلم ، فقال : أكتب ، قال : ما أكتب ؟ ، قال : أكتب القدر ما كان وما كان هو كائن إلي الابد .

واتە : یەکەم شت کە خوای گەورە دروستی کرد پێنووس بـوو ، خـوای گـەورە پـیّ ی فەرموو : بنووسـە ، پێنـووس گـووتی : چ بنووسـم ، خـوای گـەورە پـیّ ی فـەرموو: چارنووسی ئەندازەو شتەکان بنووسە ئەوەی کـە بـووە و ئـەوەیش کـە نـەبووە تـارۆژی دوایی .

---

[٩٥]. وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ : ( أول ما خلق الله القلم ) المستدرك علی الصحيحين/ ج ٢، ص٤٩٢، رقم ٣٦٩٣

واتە: یەکەم شت کە خوای گەرە دروستی کرد قەڵەم بوو ، پێی فەرموو بنوسە، قەڵەم گـوتی چـی بنووسم، خوای گەورە فەرمووی: هەموو شتێك لە بوونەوەردا بنووسە تا ڕۆژی دوایی دێ، وەرگێڕ.

## پلە و پایەی سێیەم: خواست ویست (الإرادة والمشیئة)

واتە: هەموو شتێ کە لەم بوونەرەوەدا هەبێ، بەپێی حەز و ویستی خوای گەورە دەکرێ لە نێوان حکمەت و ڕەحمەتو دادگەری خۆی ، جا کەسێ کە بیەوێ ئەوا بە ڕەحمەتی خۆی ڕێنمایی دەکا، وە کەسێ کە نەیەوێ بەپێی حکمەتی خۆی گـومڕاو سەگەردانی دەکا، جا لەبەر تەواو (کمال) ی حوکم و حیکمەت و دەسەلاّتی خوا ی گەورە، هەرگیز پرسیاری لێ ناکرێ لەوەی کە دەیکا، بەڵکو پرسیار لەوانە دەکرێ دەربارەی ئەو شتانەی کـە دەیـان کـەن[٩٦]، وە هـەر شـتێك لـەو شـتانەی کـە لـە دروستکراوەکان ڕوودەدەن و دەبن ، کۆك و هاتیـەوەن لەگـەڵ زانسـت و زانیـاری پێشتری خوای گەورە کە لە ( لوح المحفوظ) ی دا نووسـیوە، جـا بـە ویسـت و ئارەزووی خوای گەورە جێ بەجێ دەبێ، وە تواناکەشی گشتگیرە و ئەوە دەگرێتەوە کە دەیەوێ ببێ، وە ئەوەیش کە نایەوێ ببێ، نابێ، وە هیچ شتێك لـە ویسـت و ئارەزووی ئەو بەدەر نیە و دەرناچێت، وە ك خوای گەورە دەفەرموێ :

وَمَا تَشَاؤُونَ إِلَّا أَن يَشَاء اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ {التكوير/٢٩}.

واتە: ئەوەی کە ئەوان حەز دەکەن ببێ نابێ، بەڵکو تەنها ئەوە دەبـێ، کـە خـوای پەروەردگاری جیهانیان دەیەوێ ببێ[٩٧]

---

[٩٦]. وەك خوای گەورە دەفەرموێ : لاَ يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ {الأنبياء/٢٣}

واتە: پرسیار لە خوا ناکرێ لەوەی دەیکا، بەڵکو خوای گەورە پرسیار لە دروسـتکراوو بەنـدەکانی دەکا دەربارەی ئەوەی کە دەیکەن. وەرگێر.

[٩٧]. وەك خوای گەورە لە حەدیسی قودسیدا دەفەرموێ :

( عبدي انت ترید وانا ارید ، ولایکون إلا ما أرید...)

وە پێغەمبەری خوای گەورە دەفەرموێ:

إن قلوب بني ادم كلها بين إصبعين من أصابع الرحمن كقلب واحد ، يصرفه حيث يشاء . مسلم .

واتە : دڵەکانی ئادەمیزاد هەمووی وەك یەك دڵ لە نێوان دوو پەنجەی خوای گەورە دان لە پەنجەکانی خوای گەورە ، چۆن بیەوێ ئاوا هەڵی دەسوڕێنێت .

## پلەی چوارەم / دروستکردن ( خلق ):

بریتییە لە بڕوا هەبوون بەوەی کە خوای گەورە دروستکەری هەموو شتێکە و، هیچ خوا و پەروەدگارێکی تری بەهەق (جگە لەو) نیە، وە هەموو شتێك (جگە لەو) دروستکراو (مخلوق) ە، بەڵکو خوای گەرە دروستکەر و داهێنەری هەموو کارکەرویکەرەو (عامل) و کردوەکانیەتی، وە دروستکەری هەموو جولە و (متحرك) و جم و جۆڵەکانیەتی، وەك خوای گەورە دەفەرموێ : وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيراً {الفرقان/٢}.

واتە: خوای کردگار هەموو شتێکی بونەوەری دروست کردوە، وە ئەندازەی ژیان و هەموو شتەکانیشی بۆ گرتوە بە ئەندازەیەکی ووردوتەواو[٩٨]

---

واتە: ئەی بەندەی من تۆ شتێکت دەوێ بیێ و منیش شتێکم دەوێ بیێ، بەڵام دەرئەنجام هەر ئەوە دەبێ و دێتە جێ کە من دەمەوێ بیێت . وەرگێڕ.

[٩٨] . وەك دەفەرموێ : أَلاَ لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ تَبَارَكَ اللّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ {الأعراف/٥٤}

واتە: ئەی خەڵکینە ئێوە باش ئاگادار بن کە دروستکردن و کار و فەرمان هەر هەمووی هی خوای گەورەو بەدەست خوای گەورەیە ، وە خوای گەورەش باشترین دروستکەرە، وە مرۆڤیشی لە جوانترین شێوە و ڕوخسار دروست کردوە، وەك دەفەرموێ : لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ {التين/٤}

بێگومان هەر شتێ لە چاكە وخراپە لە (خێر و شەڕ)، لە كوفر و ئیمان، لە گوێڕایەڵی و لەیاخی بوو، بە ویستی خوای گەورە دەبێ‌و، خوای گەورە تەقدیری كردوە.

خوای گەورە دروستكەری تاك و تەنیایە و بێ نیازە كە دروستكراوەكان و بـوونی بـەدیهێناوەو، دروسـتكەری هـەموو شـتێكە بـەبێ جیـاوازی، هـیچ دروسـتكەر وپەروەردگارێكی تر غەیری ئەو نیە.

وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ {الرعد/١٦}﴾ (الرعد:١٦).

واتە : خوای گەورە دروستكەرو بەدیهێنەری هەموو شتەكانی ژیانە ، خوایەكی تاك‌و تەنیاو زاڵ و دەسەلاتدارە بەسەر هەموو شتەكاندا

اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ {الزمر/٦٢}

واتە : خوای گەورە دروستكەری هەموو شتێكە و، بەسەر هـەموو شـتێكدا زاڵ و دەسەلاتدارە.

وە خوای گەورە دەفەرموێ :

ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ {غافر/٦٢}

واتە : خوای گەورەتان دروستكەرویەدیهێنەری هەموو شتێكە .

وە خوای گەورە دەفەرموێ :

هَلْ مِنْ خَالِقٍ غَيْرُ اللَّهِ يَرْزُقُكُم {فاطر/٣}

---

واتە: بێگومان ئێمە ئادەمیزادمان لە جوانترین شێوە و روخسار و پەیكەر دروست كـردوە ، وەك دەفەرموێ : الَّذِي خَلَقَ فَسَوَّى {الأعلى/٢}

واتە: خوای گەورە ئادەمیزادی دروست كردوەو، لە جوانترین شێوە ڕێكی خستوە، وەرگێر.

واتە : ئایا جگە لە خوای گەورە هیچ دروستکەرێکی تر ڕزق و ڕۆزیتان پێ دەدات.
خوای تاك و پاك دروستکەری بەندەکانی و کارو کردەوەکانیانە ، هـەر شتێك لـە چاکە وخراپە ، لە کوفرو ئیمان، لە گوێڕایەلی و سەر پێچی، خوای گەورە ئەندازەی گرتەوە و دروستی کردوە و ، هیچ شتێك لە وانە بێ خوای گەورە نابن و ناکرێن. وەلێ خوای گەورە چاکە و ئیمانی لە ئینسان ئەوێت. وەك خوای گەورە سـەبارەت بەوە ئەفەرموێ :

وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تُؤْمِنَ إِلاَّ بِإِذْنِ اللّهِ {یونس/١٠٠}

واتە : هیچ کەسێك بەبێ روخسەت و ئاگاداری خوای گەورە بۆی نیە ئیمان بە بێنێ و ئیمان نایەنێ ، ئەگەر بشیەوێ ئیمان بێنێت . وەرگێر

وە ئەفەرمووێ :

قُل لَّن يُصِيبَنَا إِلاَّ مَا كَتَبَ اللّهُ لَنَا {التوبة/٥١}

واتە : ئەی محمد ﷺ بلێ : هیچ شتێکمان توش نابێ ، تەنها ئەوە نەبێ کە خـوای گەورە لەسەری نوسیوین .

وە ئەفەرمووێ :

وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ {الصافات/٩٦}.

واتە : خوای گەورە ئێوەی دروست کردووە ، وەلێ ئێوە نازانن و دانی پیا نا هێنن.
خوای گەورە سەبارەت بە بەندەکانی هەمیشە پەیڕەوی و گوێڕایەڵی (طاعة) ی پـێ خۆشە و تاوان ویاخی بوون و سەرپێچـی (معصـیة) دەبێزێنـێ و رقـی لێیـەتی، وە هەرکەس کە حەز بکا بەبەخششی خۆی راستەڕێ ی دەکا، وە کەسێ کە نەیەوێ بـە دادگەری خۆی گومڕا و سەرلێشواوی دەکا، ئەو کەسـەی کـە گـومڕاش دەبـێ هـیچ بەڵگـە (حجـة) و پـەلپ (عـذر) ێکـی نیـە لەسـەر ئـەو، چـونکە خـوای گـەورە

پێغەمبەرانی ناردوە تا بەڵگە و بیانو (حجـة) یـان بـبڕێ، بـۆ ئـەوەی دیـنی خـوای گەورەیان بۆ ڕۆشەن بکەنەوە و ڕاستەڕێ یان بکەن، لەبەر ئـەوەی خـوای گـەورە وای کردوە کە بەندە (عبد) خۆی خاوەنی کار و کردەوەی خۆی بێ و، بۆ خۆی شتی چاك‌و خراپ بکا.

وەك خوای گەورە دەفەرمووێ :

إِن تَكْفُرُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنكُمْ وَلَا يَرْضَى لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ وَإِن تَشْكُرُوا يَرْضَهُ لَكُمْ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى {الزمر/٧}

واتە : ئەی خەڵکینە ئەگەر ئێوە بەرانبەر بە خوای گەروە بێباوەڕیش بن، خوای گەورە لێتان بێ نیازەو دەولەمەندە و پێویستی بە ئێوە نیە، ئاگاداربن خوای گەورە کوفر لە بەندەکانی خۆی قبوڵ ناکات، واتە بە کوفرو بێ باوەڕی رازی نیە کە بەندەکان بیگرنەبەر، جا ئەگەر سوپاسی خوای گەورە بکەن لەسەر ئەو ژیان دین و ئیمانەی خوای گەورە بە ئێوەی داوە ، خوای گەورە بە هۆی ئەوە لێتان رازی دەبێ، دەنا کەس گوناهوتاوانی یەکتر هەڵناگرێ و لە جیاتی یەکتر لەرۆژی دوایی سزاو ئازار نادرێت .

وە خوای گەورە دەفەرمووێ :

وَاعْلَمُوا أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ اللَّهِ لَوْ يُطِيعُكُمْ فِي كَثِيرٍ مِّنَ الْأَمْرِ لَعَنِتُّمْ وَلَكِنَّ اللَّهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ الْإِيمَانَ وَزَيَّنَهُ فِي قُلُوبِكُمْ وَكَرَّهَ إِلَيْكُمُ الْكُفْرَ وَالْفُسُوقَ وَالْعِصْيَانَ أُولَئِكَ هُمُ الرَّاشِدُونَ {الحجرات/٧}

واتە : ئەی خەڵکینە ئێوە بزانن کە پێغەمبەری خوای گەورە تان لە نێو دایە(ﷺ)، ئیمانی پێ بێن، پرس و رای پێ بکەن و سودی لێ وەر بگرن، ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ)

لە زۆر شت بە گوێی ئێوەی بکردبایە تووشی زۆر گیرو گرفت و ناخۆشی دەبوو ، وەلێ خوای گەورە بەفەزل و بەخشی خۆی ئیمانی لە دل و دەروونی ئێوەدا جێگیرو خۆشەویست کردووە ، وە لە دل و دەروونی ئێوەی دا رازاندۆتەوە و جوانی کردووە ، وە لەهەمانکاتدا کوفرو بێباوەری و گوناهوتاوان و خراپەکاری و سەرپێچی و یاخی بوونی لەلابێزاندوون ، ئەوکسانە سەر ڕاست و رێنمایی کراو و ئاقل و ژیرن .

وە هیچ شتێکیشی لە بەندە (مرۆڤ) داوا نەکردوە، کە پێی نەکرێ و لە توانای دا نەبێ، وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا {البقرة/٢٨٦} واتە: خوای گەورە زیاد لە توانای خۆی بار و تەکلیفی نەخستۆتە سەرشانی هیچ کسێك، مەگەر لە توانایدا نەبێ[٩٩]

وە خوای گەورە دەفەرمووێ :

تُجْزَى كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ لَا ظُلْمَ الْيَوْمَ إِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ {غافر/١٧}

واتە : لەرۆژی بەرێ هەرکەسەو بە پێی کارو کردوەکانی کـە کردویـەتی پاداشـتی دەدرێتەوە ، لەبەر ئەوەی لەو رۆژەدا هیچ ستەمێك نیە ، بەلکو دادگەری هەیە ، سزاو لێپرسینەوەی خوای گەورە زۆر خێراو ڕەوانە

وە خوای گەورە دەفەرمووێ :

إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا {الإنسان/٣}

واتە: ئێمە ئینسانمان رێنمایی کردووە بۆ رێگەی راست ، جا بەئارەزووی خۆیـەتی لەسەر ئەم رێیە راستە دەمێنتەو ئیمان دێنێ، یا لەو رێیەراستە لادەداو بێ باوەر دەبێتیان نا.

---

[٩٩] کەواتا: ئەوانەی لە خۆیانەوە دەلێن رۆژومان بۆ نەگیرێ ، چونکە لە تواناماندا نیە، یا دکتۆر بۆی داناوین. وانیە چونکە خوای گەورە ئەوەی داناوە کە دەکرێ و ئەنجام دەدرێ . وەرگێر.

وە خوای گەورە دەفەرمووێ :

لِئَلاَّ يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ {النساء/١٦٥}

واتە : ئێمە کە پێغەمبەرانمان بۆ خەلك ناردوون سەلامی خوای گەورەیان لێ بێت ، بۆ ئەوەمان ناردوون تالەسەر یان ببنە بەلگە لـە رۆژی دوایـی ، تـا خـەلك هـیچ بەلگەو بڕو بیانوی لەسەرخوای گەورە نەمێنێتەوە دوای ئەوەی کە پێغەمبەرانیان بۆ هاتوون ، نەلێن نەمان زانی ئاینی خوای گەورە و رێ ی راست چیە و چۆنە

وە خوای گەورە دەفەرمووێ :

فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُرْ {الكهف/٢٩}

واتە: ئەوەی حەز دەکا با بڕوا بێنێ، ئەوەیش حەز دەکا با ئیمان نەیەنێ، با کافر بێ، خوای گەورە بێ نیازو دەولەمەندە.

وە ئەنجامدانی کاری بەد و خراپ هەرگیز پاڵ ناردێتە لای خـوای گـەورە، چـونکە خوای گەورە کامل و بێ نەنگـە و، فـەرمانی کـردوە بـە چـاکە کـردن ونـەکردنی خراپەو، مرۆڤی سەرپشك (إختیار) کردوەو زۆری لێ ناکات[١٠٠]، وە هانی دەدا بۆ چاکە کردنو نەهی لێ دەکا بۆ خراپەکردن، خوای گەورە هەمیشە لەگەڵ چاکە دایە و چاکەی خۆش دەوێ، بەڵام مرۆڤی بەد ڕەفتاروکردار کـاری بـەدو خـراپ ئـەنجام دەدا، چونکە نەفسی بەدی وای لێ دەکا، وە مرۆڤی جوانڕەفتارو خوانـاس، کـاری

---

[١٠٠]. وەك خوای گەورە دەفەرموێ : فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُرْ {الكهف/٢٩}

واتە: ئەوەی حەز دەکا با بڕوا بێنێ، ئەومیش حەز دەکا با ئیمان نەیەنێ، با کافر بێ، خوای گەورە بێ نیازو دەولەمەندە.

یا دەفەرموێ: وَهَدَيْنَاهُ النَّجْدَيْنِ {البلد/١٠}

واتا: ئێمە خەلکمان بۆ دوو رێگە سەرپشك کردوە، بۆ رێگەی چاك و خراپ، وەرگێڕ.

چاك و شەرعی ئەنجام دەدا، چونکە ئیمانەکەی پاڵی پێوە دەنێ‌وەوای لێ دەکات ، وە هیچ شتێکیش بەبێ توانا و ویستی ئەو نابێ، چـونکە تەنانـەت هـیچ هـەبوو (موجود) یێك بەبێ ئەو نابێ و ناژێ، ئجای جم و جۆڵ و کاروکردەوەکانیـان. وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

مَّا أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ اللّهِ وَمَا أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٍ فَمِن نَّفْسِكَ {النساء/٧٩}.

واتە : ئەو شتە چاکانەی کە دەیکەن‌و دووچاری دەبن، لە خواوەیە، ئەو خراپانەش کە دەیکەن و دووچاری دەبن، لە خۆتانەوەیەو، بۆ خۆتان دەیانکەن‌و ئەنجامیان دەدەن[١٠١] چونکە خوای گەورە ، پاك و بێگەرد و بەری یە لە ستەم کردن[١٠٢] ، بەڵکو بێ وێنە دادگەرە، بە ئەندازەی توێسقاڵە گەردیلەیەك ستەم لە کەس، لە کافر و موسلمان ناکات، بەڵکو هەموو کار و کردەوەکانی خوای بێ هاوتـا حیکمـەت‌و ڕەحمـەت و عەدالەتن .

وەك خوای گەورە دەفەرموێ:

---

١٠١ . وە دەفەرموێ: وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَقُولُواْ هَذِهِ مِنْ عِندِكَ {النساء/٧٨}

واتە: ئەگەر جوولەکەکان دووچاری سەروەت و سامان و سـەرکەوتن و شـتی چـاك و پـاك ببانـە، دەیانگوت ئەی محمد ئێمە دەزانین کە ئەو شتە چاکانە هەموویان لە خواوەن ، بەڵام ئەگەر دووچاری قات وقڕی و گرانی و ناخۆشی وتەنگی وشتی خراپ ببانە، دەیانگوت ئەی محمد ئەو شتە خراپانە لەلای تۆ پێمان دەگەن، کەچی خوای گەروە دەفەرموێ :

قُلْ كُلٌّ مِّنْ عِندِ اللّهِ فَمَا لِهَؤُلاء الْقَوْمِ لاَ يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا {النساء/٧٨}

واتە: ئەی محمد پێیان بڵێ کە هەموو شتێك لە خواوەیەو، لەلایەن خوای گەورەوە بڕیاری دەدرێ و دەردەچێت، بەڵام نەفام و بێباوەڕان نایزانن، وەرگێر.

١٠٢ وە ك خوای گەورەو میهرەبان دەفەرموێ: وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ {فصلت/٤٦}

واتە: ئەی موحەمەد پەروەردگاری تۆ هەرگیز ستەم لە بەندەکانی خۆی ناکا، وەرگێڕ.

وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ {فصلت/٤٦}

واتە: ئەی موحەمەد پەروەردگاری تۆ هەرگیز ستەم لە بەندەکانی خۆی ناکا، وەرگێڕ.

وَأَنَّ اللَّهَ لَيْسَ بِظَلاَّمٍ لِّلْعَبِيدِ {الأنفال/٥١}

واتە: خوای گەورە قەت ستەم لە بەندەکانی ناکات .

وە خوای گەورە دەفەرموێ:

وَمَا أَنَا بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ {ق/٢٩}

واتە: من هەرگیز ستەم لە بەندەکان ناکەم .

وە خوای گەورە دەفەرموێ:

إِنَّ اللّهَ لاَ يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ {النساء/٤٠}

واتە: خوای گەورە بەقەد گەردیلەیـەك سـتەم لـە بەنـدەکان و لـە دروسـتکراوەکان ناکات.

وە خوای گەورە دەفەرموێ:

وەك دەفەرموێ: وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا {الكهف/٤٩}

واتە: ئەی محمد پەروەردگارت قەت ستەم لە هیچ کەسێك و لە هیچ شتێك ناکات ، بەڵکو لەگەڵ هەموو بونەوەردا دادگەری بەکار دێنێ .

وە خوای گەورە دەفەرموێ:

لاَ يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ {الأنبياء/٢٣}

واتە: پرسـیار لـە خـوا نـاکرێ لـەوەی دەیکـا، بـەڵکو خـوای گـەورە پرسـیار لـە دروستکراوو بەندەکانی دەکا دەربارەی ئەوەی کە دەیکەن.

خوای گەورە مرۆڤ و کاروکردەوەکانی دروستکردوە، وە (حەز و ئارەزوی توانا و هێز و ویست و هەڵبژاردن.......) یشی پێ بەخشیوە، بۆ ئـەوەی کاروکردەوەکـانی ببنـە هەقیقەتێك و لە خۆیەوە سەرچاوە بگرن، وە (ئەقڵ و تێگەیشتن) یشی پـێ داوە تـا جیاوازی پێ لە نێوان چاکە و خراپەدا بکا، وە موحاسەبەشی تەنها لەسەر ئەو کار و کردەوانە دەکرێ ، کە بەویست و ئارەزووو ئیختیاری خۆی دەیانکا، چونکە مـرۆڤ زۆر لێکراو (مجبر) نیە، بەڵکو خاوەن ویسـت و خواسـت و ئـارەزووی خۆیـەتی، لـە هەڵبژاردن و دیاریکردنی بیرو باوەڕ و کار و کردەوەکانی، وە شوێن کەوتە ( تابع ) ی ویستی خوایە لەوەی کە خوای گەورە دەیەوێ، چونکە هەر شتێك خوا بیـەوێ ببێ، ئەوە دەبێ، وە ئەوەی کە نەیەوێ ببێ، هەرگیز نابێ و نایەتەدێ، خوای گەورە دروستکەری کردەوەکانی بەندەکانە، بەڵام بەندەکان بکەر (فاعل) ی کردەوەکانیانن، چونکە کردەوەکانی مرۆڤ لە ڕووی (دروست کردن و بە دیهێنان و و بڕیار و تەقدیر و ئەندازەگیری) لەلایەن خواوەیە، وە کردن‌و بە دەست هێنان (فعل وکسـب) لەلایـەن خودی مرۆڤەکانەوەیە بە بەڵگەی ئەوەی کە خوای گەورە دەفەرموێ :

وَمَا تَشَاؤُونَ إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ {التكوير/٢٩}.

واتە: ئەوەی کە ئەوان حەز دەکەن ببێ نابێ، بەڵکو تەنها ئەوە دەبـێ، کـە خـوای پەروەردگاری جیهانیان دەیەوێ ببێ .

وە خوای گەورە دەفەرمووێ :

وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ وَيَخْتَارُ مَا كَانَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ سُبْحَانَ اللَّهِ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ {القصص/٦٨}.

واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ پەروەردگارت هەرچی دەیەوێ دروستی دەکات ، وە ئەوەی باش و چاك و پاکە بۆ یان هەڵدەبژێرێ و بڕیار دەدات ، پاکی و بێگەردی و بەرزی و بلندی بۆ ئەو خوایەی کە شەریکی بۆ پەیدا دەکەن .

وە پێغەمبەریش ﷺ دەفەرمووێ : **ما منكم من أحد إلا وقد كتب مقعده من النار ومقعده من الجنة .**

واتە : هەریەکێك لە ئێوە کورسیەکی لە بەهەشت و کورسیەکی لە دۆزەخ بۆ دابین و دیار کراوە . گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ئێمە پشت بە پەرتوکەکانی کارو کردەوەکانمان نە بەستین و ، واز لە کارو کردەوەکەنامان نەیـەنین ، ؟ . ئـەویش لـە وەلامدا فەرمووی :

**إعملوا فكل ميسر لما خلق له ، أما من كان من أهل السعادة فييسر لعمل أهل السعادة ، وأما من كان من أهل الشقاء فييسر لعمل أهل الشقاء .**

واتە : نا ، هەوڵ بدەن و کار بکەن ، هەمو کەسێك ڕام و ژێر دەستەیە بۆ ئـەوەی کە بۆی دروستکراوە ، جا ئەوەی کە لە خەلکی خۆشیارو بەختەوەرە ، بەرەو کارو کردەوەی خەلکی چاك و بەختەوەر دەڕواو ڕام و ژێردەستە دەکرێ ، وە ئەوەی کە لە خەلکی خراپ و گوناهبارو بەد بەختیشە ، بەرەو کارو کردەوەی خەلکی خـراپ و گوناهبارو بەد بەخت دەڕواو رام و ژێردەستە دەکرێ .

پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە خوای گەورە دەفەرمووێ :

**فَأَمَّا مَن أَعْطَى وَاتَّقَى {الليل/٥} وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى {الليل/٦}**

واتە: کەسێك کە لە پێنـاوی خـوای گـەورە دەبەخشێ و دەترسێت ، وە بەچـاکە کردارو رەفتار لەگەل خەلکدا دەکات ، سەربەرزو سەرفرازە .

وە خوای گەورە دەفەرمووێ :

سَيَقُولُ الَّذِينَ أَشْرَكُواْ لَوْ شَاء اللّهُ مَا أَشْرَكْنَا وَلاَ آبَاؤُنَا {الأنعام/١٤٨}

واتە: ئەوانەی کە شەریکیان بۆ خوای گەورە پەیدا دەکـرد ، دەڵـێن ئەگـەر خـوای گەورە بیویست بایە نە ئێمە و نە باب و باپیرانیشمان شەریکمان بۆ خوای گـەورە پەیدا نە دەکرد

قُلْ هَلْ عِندَكُم مِّنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَا إِن تَتَّبِعُونَ إِلاَّ الظَّـنَّ وَإِنْ أَنـتُمْ إَلاَّ تَخْرُصُـونَ {الأنعام/١٤٨}.

واتە: ئەی محمد ﷺ پێیان بلێ : ئەگەر هیچ زانیاریەکی تەواو راست و دروستان لایە بۆمانی دەرخەن ، یا ئێوە تەنها بەدوای گومان و درۆ و دەلەسە و بوهتان دەکەون و، لە خۆتانەوە شت هەڵدەبەستن و دژایەتی دەکەن .

چونکە هیچ شتێك بەبێ توانا وویستو زانستو زانیاریو ئاگاداری خوای گـەورە ناکرێو نابێ ، کەس لەخۆیەوە توانای هیچی نیە، لەبەر ئەوەی خوای گەورە توانا و هێز و دەسەڵاتی بەبەندەکانی خۆی داوە، ئەگینا لە بنچینەدا هیچیان نەبووە، ئەوانیش بەو توانایە چاکە یا خراپە ئەنجام دەدەن، خۆ ئەگەر بیانـەوێ خراپەیـەك ئەنجام بدەن، بەڵام خوانەیەوێ ببێ و بەرگریان لێ بکا، هەرگیز نابێو بۆیان ناکرێ، با ئەوانیش بیانەوێ ببێ، بەڵام خوای گەورە ئەوەی نەکردۆتە یاسای ژیان، چونکە کە مرۆڤی دروستکردوە (ئەقڵ و ئیختیار) ی پێ بەخشیوە بۆ ڕێی چاك و خراپ، وە لە دونیادا بە چاکە و خراپە تاقی دەکاتەوە، وێڕای ئـەوەی کـە فـەرمانی پـێ کردوە بە چاکە، و ڕێی لێ گرتوە لە خراپە کردن، وە لە دوارۆژیشدا بۆ چارەنووسو سەرەنجامی مرۆڤ بە هەشتی بۆ دروست کردووە لە بری چاکە کردن، وە دۆزەخیشی

بۆ هەڵگێڕساندون لەبەرامبەر خراپەکردن، کەچی بابا (کابرا) بۆ خۆی.کاری خراپە دەکا و بە دوای هەواو ئارەزوی بەدی خۆی و شەیتان دەکەوێ و لە فەرمانی خوای کردگار لادەدا، وە لە دوارۆژ بەهۆی ئەوە دەچێتە دۆزەخ‌و دەسووتێ، ئـەوا خـۆی تاوانبارە و ستەمی لە خۆ کروە، لەکاتێکا لـە سـەر پـاکی لـە دایـك بـووەو، بـۆ بەندایەتی خولقاوە وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ {الذاريات/٥٦}.

واتە: من ئینسان و ئەجینەم تەنها بۆ پەرستنی خۆم دروستکردوون .

کەچی (ئەو) لەو ڕێڕەوەی لاداوە[١٠٣]

ئەهلی سوننە و جەماعە : بیروباوەڕیان وایە کە (قەدەر) نهێنیەکی خوای گەورەیە لە بوونەوەر لە دروستکراوەکانی خۆیدا هەیە و، هیچ فریشتەیەکی نزیك لە خوا و پێغەمبەرێکی نێردراو پەی (درك و إطلاع ) ی پێ نەبردوە و هیچـی لـێ نـازانن، بۆیە قوڵبوونەوە و ڕۆچوون لەوەدا سەرلێشێوان‌و گومڕاییـە، چـونکە خـوای دانـەر زانستی قەدەری لە دروستکراوەکانی خۆی پێچایتەوە و پەنای داوە، وە قەدەغـەی کردوە کە خەڵکی بەم مەبەستە بگەن و بیزانن. وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

لاَ يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ {الأنبياء/٢٣}

---

[١٠٣]. بۆ وێنە: کاروانچییەك لە شوێنێکی مەترسیدار بە شارەزایەك (بە خـەڵکی ئـاوایی) دەڵـێ: بەکوێ؟ دا بڕۆین چاکو بێ مەترسیە، ئاوبراو دەڵێ: بە ڕاستدا بڕۆن سەلامەت دەبن، ئەگەر بە لای چەپەدا بڕۆن دوژمنە و دەکەونە بۆسەوە، جا ئەگەر کاروانچیەکان بەگوێی شارەزایەکەیان نەکرد و گریان بەلای چەپدا چوون و کەوتنە کەمین، کێ تاوانبارە؟ دیارە هەر بۆ خۆیان تاوانبارن ، شارەزا کە هیچ زەمبوتاوانی نیە، چونکە ئەوان بەپێی ڕێنماییەکانی ئەو نەڕۆیشتن وەرگێڕ.

واتە: پرسیار لە خوا ناکرێ لـەوەی دەیکـا، بـەڵکو خـوای گـەورە پرسـیار لـە دروسـتکراوو بەندەکانی دەکا دەربارەی ئەوەی کە دەیکەن. وەرگێر.

ئەهلی سوننە وجەماعە : قسە و گفتوگۆ لەگەڵ ئەو کۆمەڵە گومڕایە دەکەن، وە بە قورئان و سوننە بەڵگەیان بۆ دێنن، تا بڕوا بکـەن، چـونکە خـوای گـەورە لـەو بارەیەوە دەفەرموێ :

قُلْ كُلٌّ مِّنْ عِندِ اللّهِ فَمَا لِهَؤُلاء الْقَوْمِ لاَ يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا {النساء/٧٨}

واتە: ئەی موحەممەد بلـێ: هـەموو ئەمانـە لەلایەنـە خواوەیـە، ئـەم گەلـە چـیان لەوەدایە کە دورە لەوەی کە هیچ قسەیەکیان لێ تێ بگەن .

ئەوە ئەو بیروباوەڕەیە کە پێشینە چاکەکان لە هاوەڵان و تابعین و شوێن کەوتوانیان بە چاکە تا ڕۆژی دوایی بڕوایان پێیەتی، خوای گەورە لەهەموویان رازی بێ و بە بەهەشتیان شاد بکات .

# بنچینەو بنەمای دووەم

# ناو براوەکانی بیروباوەڕ
# لای ئەهلی سوننەوجەماعە

# الأصل الثاني

# مسمى الإيمان
# عند أهل السنة و الجماعة

## ناوبرواى بیرو بـاوەڕ ( مسمى الايمان )

لە بنچنەکانی بیرو باوەری پێشینەچاکەکان ، ئەهلی سوننە و جەماعە دەلێن: بیروباوەڕ ( ئیمان) بریتییە لە : بەڕاست دانانی بەدڵ (التصدیق بالجنان) و گـوتنی بە زمان (قول باللسان) و کارکردنی بە ئەندامـەکان ( العمل بالجوارح و الأركان) وە بەهۆی فەرمانبەری‌و گوێڕایەڵی ئاین ، زیاد دەبـێ ( تزیـد بالطاعـة )، وەبـەهۆی یاخی بوون و سەرپێچی و گوناهکردن، کەم دەبێتەوە ( ینقص بالمعاصي ) .

- ئیمان : (کردارو گوفتارە ، قسە و کردەوەیە) یە (قول و عمل) ە
- قسەی سەرزار و زوبان و ناودل و دەروونە.
- کاروکردەوەی دل و دەروون و زمان و ئەندامـەکانە .
- قسە و گووتەی دل و دەروون (قول القلب): بریتییـە لـە بـڕاو پـێ هـەبوونی و زانینی‌و دان هێنانی و دڵنیایی .
- قسە و وتەی بەزار (قول اللسان):

واتە دان پێدا هێنانێکی بەکردەوە ، واتابەزار هەردوو شاهادەکان بڵێ‌و بەکردەوەش کار بەمەبەست و بەناوەڕۆکیان بکات .

- کردەوەی دڵ و دەروون (عمل القلب):

واتا: نیاز و مـەبەستت وابێ، وە بەدڵ خۆتبـە دسـتەوە بـدەیت، وە بـۆی دڵسـۆز و دڵپاك بیت، وە سەر و ملی بۆ کەچ بکەیت، وە ویستت لەسەر کارو کردەوەی چاك بێ و پێت خۆش بێ.

- کردەوەی زمان و ئەندامـەکانی (عمل اللسان و الجوارح) :

واتە : کردن و ئەنجامدانی شتە فەرمان پێ کراوەکان و ، نەکردن‌و وازهێنان لەشتە یاساغ و قەدەغەکراوەکان .

## ئیمان تەواو نابێ تەنها بەکردوە نەبێ ، وەقسەی کـردوەش وەرنـاگیرێ بەبێ نیەت ، وەقسەوکردوە و نیەتیش هیچ نیەو گیرا نابێ ئەگەر بە پێی قورئان و سوننە نەبێ [104]

---

[104] . وە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا لە زۆربەی شوێن ئیمان بە کار و کردەوە بەند و بـەراورد دەکا، بۆ وێنە دەفەرموێ :

إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ وَأَقَامُواْ الصَّلاَةَ وَآتَوُاْ الزَّكَاةَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ {البقرة/٢٧٧}

واتە : ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوەو کارو کردەوەی چاکەدەکەن و، نوێـژ ئـەنجام دەدەنو ، زەکـات دەدەن ، خێروپاداشتی خۆیان لەلای پەروەردگاری خۆیانە ، بەهۆی ئەوەوە لەرۆژی بەرێ نەترسـیان لەسەرە ، نە خەمبار دەبن .

یا دەفەرموێ: إِلَّا الَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ {الإنشقاق/٢٥}

واتە : تەنها ئەوانە نەبێ کە ئیمانیان هێناوەو کارو کردەوەی چاکەدەکەن ، خێروپاداشتێکی نەبڕاوەو چاكو پیرۆزیان بۆ هەیە لەلای پەروەردگاریانەوە .

یا دەفەرموێ: وَقُلِ اعْمَلُواْ فَسَيَرَى اللّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ وَسَتُرَدُّونَ إِلَى عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ {التوبة/١٠٥}

واتە : کار بکەن ، خواو پێغەمبەرﷺ و ئیمانداران بەرهەمی کارو کردەوەکانتان دەبینن ، لە دوای مردنتان دەگەرێنەوە لای خوای بینەرو پەنهانزان بۆ لێپرسینەوە لە کارو کردەوەکانتان ، ئەوسا هەواڵ و بڕیارتان پێدەدا سەبارەت بەو کارو کردەوانەی کردوتانن .

وە دەفەرموێ: كَبُرَ مَقْتًا عِندَ اللَّهِ أَن تَقُولُوا مَا لَا تَفْعَلُونَ {الصف/٣}.

واتە : گەورەترین گوناهو تاوان لەلای خوای گەورە ئەوەیە کە شتێك بلێ یت بەلام نەیکەیت .

یا دەفەرموێ: أَتَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ الْكِتَابَ أَفَلاَ تَعْقِلُونَ {البقرة/٤٤

واتە : ئایا فرمان بەخەڵك دەکەن کە کاری چاك بکەن ، بەلام خۆتان لەبیر دەکەن و نای کەن ، تـا کەی ئاقل نابن .

خـوای بەدیهێنـەر بـە شـێوەیەکی رەهـا (مطلـق) لـە قورئـانی پـیرۆزدا باسـی سیفەت‌وخەسلەتەکانی بڕواداارانی کردوە . کەلە بارەی بنچینە و لقەکانی ی ئاین ، کار بەو شتانە دەکەن ، کەبڕوایان پێی هەیە ، جا ئەوانەی ئاشکران ، یا شاراوەن ، وە شـوێنەواری ئـەو ئیمانـەش لـە بیروبـاوەرو کرداروگوفتـارو رەفتـارە دیـارو نادیارەکانیان ، رەنگی داوەتەوە . وە خوای تاك وتەنیا فەرموویەتی:

إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ { ٢} الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ {٣} أُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا لَّهُمْ دَرَجَاتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ {الأنفال/٤}

واتە: بەڕاستی بڕواداران ئەو کەسانەن، کاتێ کە باسی خوایان لەلا دەکرێ، یەکسەر دڵیان ڕادەچڵەکێ و وێك دێن، وە کاتێ کە ئایەتەکانی خوای گـەورەیان بەسـەردا دەخوێندرێتەوە ، یەکسەر ئیمانیان پێی زێدە دەبێ و ، زیاتر پشت بەخوای خۆیان دەبستن ، ئەوانەش ئەو کەسانەن کە نوێژ دەکەن ، وەخێرو سەدەقە دەکەن لەو رزق و رۆزیو دارایی یەی کە خوا پێی داون دەیبەخشـن ، بەراسـتی ئەوانـە بـڕواداری

---

بە کورتی لەهەر شوێنێ باسی ئیمان بکا باسی کاری چاکە دەکا ، چونکە ئیمان بەبێ کاری چـاك گیرا نابێ، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ : ( لايزني الزاني حين يزني وهو مؤمن....الخ ) مسلم/ ج١، ص٧٦، رقم ٥٧

واتە: زیناکەر ئەو کاتەی کە زینا دەکا ئیمانی لەلا نامێنێ و ئیماندار نیە، چونکە ئیمان و گوناھ پێچەوانەی یەکن، بۆیە ئەوسا ئیمان دەڕوا و لەلای نامێنێ .

وە سەبارەت بە گەورەیی زینا دەفەرموێ: ( زينا العين النظر ) بخاري .

واتە: زینای چاو، چاولێکردنی ئافرەتی نامەحرەمە، وەرگێڕ

تەواو و راستەقینەن ، لەلای خوای خۆیان پلەو پایەی بەرزیان بۆ هەیە ، وە رزق و رۆزیەکی نەبڕاوە و لێخۆشبوونیان بۆ هەیە .

خوای گەورە لە زۆر لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا ، ئیمانی لەگەڵ کردەوەدا بەندو بەروارد کردووە . وەك خوای گەورەو میهرەبان دەفەموێ :

إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّاتُ الْفِرْدَوْسِ نُزُلًا {الكهف/١٠٧}.

واتە : ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوەو کارو کردەوەی چاکەدەکەن ، لە بەهەشتدا جێگەیان ناو ەندی بەهەشتی نەبڕاوەیە کە بەرزترین جێگە و پلە یە

وە دەفەرموێ :

إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ {فصلت/٣٠}

واتە : ئەوکەسانەی کە لە ژیاندا گوتیان پەروەردگارمان خوای گەورەیـە ، پاشـان لەژیاندا لەسەری خۆڕاگرو بەردەوام و پشو درێژبوون ، لەسـەرە مـەرگ و لـەکاتی ئاویلکە و پێویستدا فریشتەکانی خوای گەورەیان دادەبارێنە سەر ، پێیان دەلێن : لەداهاتوو مەترسن و لەرابردووش غەمبار مەبن ، مژدەتان لێ بێت بەو بەهەشتەی کە لە دونیـادا بـەلێنتان پێـدراوە لەبـەر انبـەر ئـەو کـارو کـردەوە چـاکانەی کـە کردوتانن.

وَتِلْكَ الْجَنَّةُ الَّتِي أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ {الزخرف/٧٢}

واتە : ئا ئەوە ئەو بەهەشتەیە کە ئێوە بە پاشماوە ( میراث ) تان گرتوە بۆ خۆتان ، لەبەارنبەر ئەوەی کە کاری بۆ بکەن بە کردەوەی چاك هەوڵی بۆ بدەن و بەدەسـتی بێنن .

وە دەفەرموێ :

وَالْعَصْرِ {١} إِنَّ الْإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ {٢} إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ {العصر/٣}

واتە : سوێند بەکات و سەردەم و رۆژگار، رەگەزی ئینسان لە دوارۆژدا لەزەرەر مەندیدایە لەبەرانبەر ئەو کاروکرداوانەی کە کردوویەتی ، تەنها ئەو کەسانە نەبن کە ئیمانیان بە خوای گەورە هێناوەو، کارو کردەوەی چاکەیان کردووە، وە ئامۆژگاری خەلك یان کردوە کە رێك و راست بن و لەگەل هەق و راستی دا بن ، وە ئارامگرو خۆراگرین .

وە پێغەمبەری خوای گەورەش (ﷺ) دەفەرموێ :

قل امنت بالله ثم استقم

واتە : بلێ ئیمانم بە خوای گەورە هەیەو ، لەسەری خۆڕاگرو بەر دەوام دەبم .

وە دەفەرموێ :

( الإيمان بضع و سبعون شعبة ، فأفضلها قول لا إله إلا الله، و أدناها إماطة الأذى عن الطريق ، والحياء شعبة من الأيمان ) بخاری .

واتە : بیرو باوەڕ حەفتاوچەند بەشێکە ، گەورەترین‌و بەرزترین یان وتەی لا إله إلا الله یە ، نزمترین یان لادانی ئازاردەرو رێگرێکە لەسەر ریچگا تا زیان بـە خـەلك نەگێنێت ، شەرم‌و حەیا بەشێکە لە بیروباوەڕ.

جا ( زانست و کردەوە ) دوو شتی پێکەوە هاوپەیوەست و تـەواو کـەری یـەکترن ، هەرگیز یەکێك یان لەویکە جوێ نابێتەوە ، چونکە کارو کردەوە گەوهەر و کڕۆك و وێنەی زانست و زانیاریە .

وە دەقی زۆر لە قورئان و سوننە لەسەر ئەوە هاتوون ، کـە ئیمـان چـەندان پلـە و پایەو بەش (درجات و شعب) ی هەیە ، زێدە دەکا و کەم دەکا ، وەخەڵکی خودان باوەڕیش هەندێك یان باشـترو بڕوادارتـرو لـە خـوا نـزیکترن ، وەك خـوای گـەورە دەفەرموێ:

وَإِذَا مَا أُنزِلَتْ سُورَةٌ فَمِنْهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَـٰذِهِ إِيمَانًا فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا فَزَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ {التوبة/١٢٤}

واتە : کاتێك کە سورەتێك لە قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوە ، هەنـدێ: لـە دوڕووە کان بەگاڵتەکردنەوە بەیەکتریان دەگووت کێ لە ئێوە بە هۆی دابەزینی ئەم سورەتە ئیمانی زیادکردووە ، جا ئەوانەی کە ئیمان داربوون بێگومان ئیمانیان زیادوو پتەو تر بوو بە هۆی دابەزینی سورەتەکانی قورئانی پیرۆزەوە ، وە موژدەی سەرکەوتن و خۆشی بەیەکتر دەدەن .

وە دەفەرموێ : وَيَزْدَادَ الَّذِينَ آمَنُوا إِيمَانًا {المدثر/٣١}.

واتە : بۆ ئەوەی ئەوانەی کە ئیمانیان بە خوای گەورە هەیە ئیمانیان زیاترو پتەوتر بێ.

وە دەفـەرموێ : وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ {الأنفال/٢}

واتە: بەڕاستی بڕواداران ئـەو کەسـانەن، کاتـێ کـە ئایەتـەکانی خـوای گـەورەیان بەسەردا دەخوێندرێتەوە ، یەکسەر ئیمانیان پێی زێدە دەبێ و ، زیاتر پشت بەخوای خۆیان دەبستن .

وە دەفەرموێ : هُوَ الَّذِي أَنزَلَ السَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ الْمُؤْمِنِينَ لِيَزْدَادُوا إِيمَانًا مَّعَ إِيمَانِهِمْ وَلِلَّهِ جُنُودُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا {الفتح/٤}.

واتە : خوای گەورە ئەو خوایە یە کە هۆگری و دڵنیایی خستۆتە نێودڵ و دەروونی بڕوادارن ، بۆئەوەی بڕوا لەدوا بڕوایان زیاد بێت .

وە دەفەرموێ : الَّذِينَ قَالَ لَهُمُ النَّاسُ إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَاناً وَقَالُواْ حَسْبُنَا اللّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ {آل عمران/١٧٣}

واتە : ئەو هاوەڵانەی کە خەڵك پێی گوتن ، بترسن خەڵك لەبۆتان کۆبۆتـەوە بـۆ ئەوەی هێرشتان بکاتەسەرو زەرەتان لێ بدات ، ئەوان لە جیاتی ئەوەی بترسن بەوە ئیمانیان زیاتر بوو و گوتیان : خوای گەورە بەسمانە و باشترین پشت و پەنامانە کە بەرگریمان لێ بکات .

وەپێغەمبەری نازداریش ﷺ فەرموویەتی :

( من أحب لله و أبغض لله، فقد إستكمل الايمان ) ابو داود

واتە: هەرکەسێك تەنها لەبەر خوای گەورە خەڵکی خۆش بوێ ولەبەر خوای گەورە ڕقی لە خەڵك ببێ تەوە ، بڕوای تەواو و دامەزراوە . وە دەفەرموێ :

مـن رأى مـنكم منكـرا فلـيغيره بيـده ، فـإن لم يسـتطيع فبلسـانه ، فـإن لم يستطيع فبقلبه ، وذلك أضعف الايمان . مسلم .

واتە : ئەگەر هەرکەسێك لـە ئێـوە خراپـەو ناشـەرعیەکی بینـی بـا سـەرەتا ئـەو خراپەوناشەرعیە بەدەستی بگۆڕی و لای ببا ، ئەگەر نەیتوانی بەدەستی بیگۆڕیت با بە زمان بیگۆڕیت و دژیایەتی بکات ، ئەگەر نەیتوانی بەزوبانیش بیگۆڕیت با بە دڵ بیگۆڕیت و دژیایەتی بکات و پـێ ی رازی نـەبێت ، ئـەو شـێوازو قۆناغـە خراپترین و لاوازترین بیروباوەرو هەڵوێستە کە ئینسانی ئیماندار هەیـەتی ، واتـە باشترین هەڵوێست و ئیمان ئەوەیە کە ئینسان بەدەست و بە ئەندامەکانی خراپە و

گوناهوتاوانەکان بگۆریت ، ئەگەر هەندێ شت بە زمان‌و بـە قسـەو بـەئامۆژگاری باشترو پێویست بوو ئەوە ئاساییە با بە زمان وبە قسە و بە ئامۆژگاری بیگۆریـت چـاکترو گونجـاوترە ، واتـە چ هۆکـارو شـێوازێك پێویسـت بـوو بـۆ گۆرانکـاری و چاکسازی ئەوە بەکاربێنێت چاك‌وشەرعیە ، نەك بێ هەلوێست و ترسنۆك بێت ، بە دل‌و دەروونیش هەر هەلوێستی نەبێت .

ئاوا هەوەڵە بەرێزەکان لە پێغەمبەری خوای گەورە (ﷺ) فێر بوونەو وەریان گرتوەو تێگەیشتوونە ، کەئیمان : بیرو باوەڕ و ، قسە و کردەوەیە ، بەتاعـەت زیـاد بـێ ویەمەعسیەت کەم دەبێت .

ئیمامی علی کوری ئەبی تالیب ئەمیری ئیمانداران دەفەرمووێت :

الصبر من الايمان بمنزلة الرأس من الجسد ، من لا صبر له لا إيمان له . كتاب شرح اصول إعتقاد اللالكائي .

واتە : سەبرو خۆراگری لە بارەی ئیمان و بیروباوەڕەوە وەکو سەر وایە لە لاشەدا ، هەرکەسێك سەبرو خۆراگری نەبی ئیمانیشی نیە ،

عـبدالله ی کوڕی مسـعود خوای گەورە لێی رازی بێت دەفەرموێ :

اللهم زدنا إيمانا ، ويقينا ، وفقها . كتاب شرح اصول إعتقاد اللالكائي .

واتە : ( خوایە ئیمان و یەقین و فیقهمان زێدەکەی) .

عـبدالله ی کوری عەباس و ئەبی هورەیرە و ئەبو دەرداء خوایان لێ رازی بێت دەلێن:

الايمان يزيد وينقص . كتاب شرح اصول إعتقاد اللالكائي .

واتە : (ئیمان : زیاد دەبێ و کەم دەبێت) .

وەکیعی کوڕی جەڕڕاح رەحمـەتی خـوای لێ بـێ دەڵـێ : ئـەهلی سـوننە دەڵـێن :

الايمان قول وعمل . واتە : ئیمان قسەو کردەوەیە .

**وەئیمامی ئەهلی سوننە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەڵێ :**

(ئیمان زێدەن دەبێت و کەم دەبێ ، زێدەبوونەکەی بەهۆی کاری چاك و فەرمانبەری کردنی خواو پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ ، وەکەم بوونەوەکەشی بـەهۆی کـاری خـراپ و سەرپێچی کردنی خواو پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ ) .

وە ئیمامی حسنی بەصری رەزاو رەحمەتی خوای گەورەی لەسەر بێت دەفەرموێ : لیس الایمان بالتحلي ولا بالتمني ، ولکن ما وقر في القلوب وصدقته الاعمال . فتح الباری / ج١ ص ٦٢ کتاب الایمان .

واتە : ئیمانداری و ئیمان هەبوون بە خۆڕازاندنەوەو بە خۆ هەڵکێشان و بە خۆزگە خواستن نیە ، بەڵکو ئیمان هەبوون بە و بیروباوەڕەیە کـە لـە نێـو دڵ و دەروونـدا جێگیر ببێ و لە کارو کردەوەکانیشدا رەنگ بداتەوەو بەرجەستە بێت ، واتە کـارو کردەوەکانی بەراستی دابنێن و بیسەلمێنن کە ئیمانی هەیە .

**وە ئیمامی شافعی ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەفەرموێ :**

(ئیمان قسەو کردەوەیە ، زێدە دەبێ وکـەم دەبـێ ، بـەهۆی تاعـەت زێـدەدەبێ و بەهۆی تاوان کەم دەبێ) پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە :

وَيَزْدَادَ الَّذِينَ آمَنُوا إِيمَانًا وَلَا يَرْتَابَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ وَالْمُؤْمِنُونَ وَلِيَقُولَ الَّـذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَالْكَافِرُونَ مَاذَا أَرَادَ اللَّهُ بِهَذَا مَثَلًا كَذَلِكَ يُضِلُّ اللَّهُ مَـن يَشَـاء وَيَهْـدِي مَـن يَشَـاء وَمَـا يَعْلَـمُ جُنُـودَ رَبِّـكَ إِلَّـا هُـوَ وَمَـا هِـيَ إِلَّـا ذِكْـرَى لِلْبَشَـرِ {المدثر/٣١}.

واتە : بۆ ئەوەی ئەوانەی کە ئیمانیان بە خوای گەورە هەیە ئیمانیان زیاترو پتەوتر بێ ، وە ئەوانەیش کە پەرتووکیان پێدراوە گوماندار نابن ، هەق نیە توشی گومان

و دو دلی بن ، وە ئیمانداڕن زیاتر ئیمانیان دابمەزرێت ، وە بۆ ئەوەی ئەوانەی کە لە کافرو بێباوەر و دووڕوەکان دل و دەرونیان نەخۆشە ، بۆخۆیان بلێن : ئەوە خوای گەورە مەبەستی لەم نمونە هێنانەوە چیە ، بەم شێوەیە خوای گەورە ئەوەی بیـەوێ گومڕاو سەرگەردانی دەکا ، وەئەوەی کە بشـیـەوێ راسـتـەرێ و رێنمـای دەکـات ، جگە لە خوای گەورە کەس نازانێ سەربازەکانی خوای گەورەو میهرەبان چـەندن ، ئەم ئایەت و فەرمودانە تەنها پەندو ئامۆژگارین بۆ ئادەمیزاد ئەگەرسـودیان لـێ وەربگرن .

وەلــەو رووەوە ســەرجەم ســەحابەو تابیعــەکان و شـوێن کەوتووەچـاکەکانیان لــە (فەرموودەناسان و شەرعزانان و پێشـەواکانی ئـاین) هـەموویان لەسـەر ئـەوەن ، وەهیچ کەسێك لە پێشینەو پاشینەکان لەگەڵ ئەوەدا پێچەوانە و دووبەرەك نـین ، تەنها ئەوانە نەبن کە لە هەق لایان داوە.

ئەهلی سوننە دەڵێن: هەر کەسێ کردەوە (عمل) لە ئیمان جیابکاتـەوە و دەربیـێ نێ، ( مرجوع )ەیە، وە ئەوەی بچێتە ناو ئەوە شەوە ، بیدعە چیە.

وەهەر کەسێ بە زوبان دان بەهەردوو شەهادەکاندا بنێ ، وە بەدڵ و دەروون بڕوای تەواوی بەیەکتاپەرستی خوای گەورە هەبێ ، بەڵام بەکردەوە و ئەندامەکانی پلـەو پایە (روکن و رکیزة) ەکانی ئیسلام جێ بەجێ ناکـات ، ئیمـانی تـەواو نابـێ بـا لەڕووی ناو و حوکم لە سەردانەوەش لەفزی ( ئیمان ) یشی پێوە بنێن، وە ئەوەش کـە هـەر ( أبـداً، أصـلاً) دان بـە هـەردوو شـەهادەکە دانانـێ، نـاوی ( ئیمـان و ئیماندار)ی هەر پێوە نالکێ و ناگوترێ .

## هەلاوێردن و جوێكردنەوە (إستثناء) لە ئیماندا:

ئـەهلی سـوننە و جەماعـە: وای بـۆ دەچـن كـە هـەلاوێردن و جوێكردنـەوە (استثناء) لە ئیماندا هەیە، وەك ئەو وتەیەی كە دەگوترێ:

(أنا مؤمن إنشاء الله) واتە: ئەگەر خوا حەز بكا من بڕوادارم، لـە ڕووی چـاكە و خۆشەویستی و سوونەتەوە دروستە نەك لە ڕووی واجبەوە ، چونكە بە شـێوەیەكی بڕەو (جازم) نالێ من هەر ئیماندارم، ئەوەش لەبـەر زۆر لەخواترسـانە، وە لەبـەر سەلماندنی قەدەری خوایە، وە لەبەر خۆ بە پاك نەگرتن ( تزكية النفس ) ە، چونكە ئیمانی تۆ كمە و ڕەها (كامـل و مطلـق) لـە ئەنجامـدانی هـەموو فەرمانـەكان ( طاعـات ) و نـەكردنی هـەموو قەدەغـەكراوەكان (منهیـات) دەگرێتـەوە، بـەلاّم جوێكردنەوە ( استثناء ) یا ساغ و قەدەغە دەكەن ئەگەر لە ڕووی بوونی گومان و دڕدۆنگی لە ئیماندا ئەوە بگوترێ، وە بەڵگەش لەسـەر ئـەوە زۆرن لـە (قورئـان و سوننە و لە ئەسەری سەلەف و گوتەی زانایان)، بۆ وێنە خوای پـاك و بـێ گـەرد دەفەرموێ :

وَلَا تَقُولَنَّ لِشَيْءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا {٢٣} إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ {الكهف/٢٤}

واتە : بەبێ حەزکردننی خوای گەورە بۆ هیچ شتێك مەلێ من بەیانی ئەوە ئەکەم ئەگەر نەلێیت ، ئەگەر خوای گەورە حەزبکا، چونکە هیچ شتێك بەبێ ویستی خوای گەورە نابێت .

وە دەفەرمووێ : فَلَا تُزَكُّوا أَنفُسَكُمْ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ اتَّقَى {النجم/٣٢}.

واتە: پاکانەی خۆتان مەکەن و خۆتان بەبێ نەنگ و هەڵە مەزانن، چونکە هەر خوای گەورە زانا و ئاگادارترە ئاخۆ کێتان؟ لە هەمووان پاکتر و لەخواترسترە.

وە بەڵگەی ئەو فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ کە دەچێتە نێو گۆڕستان و دەفەرموێ:

السلام عليكم أهل الديار من المؤمنين والمسلمين وإنا إن شاء الله بكم لاحقون، أسأل الله لنا ولكم العافية . مسلم .

واتە: سەلامتان لێ بێ ئەی خەڵکی گلکۆ و گۆڕستان، بڕوادار و موسڵمانەکان، ئەگەر خوای گەورە بیەوێ (ئێمەش) بە ئێوە دەگەین، بۆ خۆمان و بۆ ئێوەش داوای خۆشی و لێبوردن لە خوای لێخۆشبەر دەکەین.

عـبدالله ی کوڕی مـەسعود ڕەزای خوای لـێ بـێ دەڵـێ: هـەر کەسـێ کـە گـەواهی (شاهێدی) بۆ خۆی بدا کە ئیماندارە، با گەواهیش بدا کە بەهەشتییە.

وەلەبارەی ئیمانەوە پرسیار لەئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبـەل کـرا؟، ئـەویش لـە وەلامدا گوتی :

ئیمان : هەوڵ و عەمەل و نیەتە ، یەکێك پێی گووت: ئەگەر پیاوێك گووتی: ئەتۆ ئیمانداری؟ ئیمام فەرمووی: ( ئەوە بیدعەیە )، یەکێك پێی گوت چ بەو کابرایـە بگوترێ؟ ئیمام فەرمووی: با بڵێ: ( إنشاء الله تۆ ئیمانداریت ).

ئیمان لەلای ئەهلی سوننە و جەماعە : لاناچێ تەنها بەنەمانی بنچینەکان (أصل) ی خۆی نەبێ ، بەڵام لاچوونی لق (فرع) ەکەی بەئەنجامدانی شتە قەدەغە کراوەکان و نەکردنی واجیباتەکانە ، بەوەش ئیمان کەم دەکا و دەشێوێ ، بەڵام تەواو ناڕوا و لاناچێ ، وە بەندە تەنها بە بڕوا پێ نەبوون و بەرهەڵستی کردن (جحود)ی ئەو شتە لە ئیمان دەردەچێ کە پێی هاتۆتە نێو ئیمانـەوە ، وە زۆر جـار (کـوفر و ئیمـان) شیرك و توحید ، تەقواو فجور) لەپیاودا کۆدەبنەوە .

ئەوەی تاوانە گەورەکان دەکا لە ئیمـان دەرناچـێ ، بـەڵکو ئـەو کەسـە لـە دونیـا ئیماندارێکی ئیمان ناتەواوە ، ئیماندارە چونکە ئیمانی هەیە ، بەڵام فاسقە بەهۆی

ئەو تاوانە گەورەیە، وە لە ڕۆژی دوایشدا لە ژێـر ویسـتی خوایـە ، ئەگـەر خـوای گەورە حەز بكا لێ ی خۆش دەبێ ، ئەگەر حەزیش نەكا ، سزای دەدا

ئیمان: قەبولی بەش بەشكردنی (تجزئة) و هەندێكایەتی (تبعیض)دەكا ، وە خوای گەورە بەهۆی هەندێك گوناهبارێكەی لەناو ئاگری دەردێنێ ، هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ:

( لايدخل النار من كان في قلبه مثقال حبة من خردلٍ من إيمان ) مسلم .

واتە: ناچێتە نێو ئاورەوە ئەو كەسەی كەبە ئەندازەی دەنكە خەرتەلێك ئیمان لەناو دڵ و دەروونیدا هەیە .

لەبەر ئەوە ، ئەهلی سوننە و جەماعە هیچ كەسێك لەخەڵكی ڕووگە (أهل القبلة) بێباوەڕ (تكفیر) ناكەن بەهۆی هەر گوناهێكەوە بێ تەنها بەو گوناهە نەبێ ئەسڵی ئیمانی پێ لادەچێ و نامێنێ ، وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاء وَمَن يُشْرِكْ بِاللّهِ فَقَدِ افْتَرَى إِثْمًا عَظِيمًا {النساء/٤٨}.

واتە : خوای گەورە لەکەسێك خۆش نابێ کە هاوبەشی بۆ پەیـدا بکـا ، بـەڵام لـە هەموو گوناهێکی تری لە خوار (شرك) خۆش دەبێ ، لەکەسێ کە دەیـەوێ لـێ ی خۆش بێ ، وەهـەر کەسـێ شـیرك بـۆ خـوای گـەورە بڕیاربـدا، بەراسـتی تـاوان و ناماقوڵیەکی گەورەی بەرانبەر بەخوای گەورەکردوە .

وە پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێ :

( أتاني جبريل – عليه السلام – فبشرني أنه من مات من أمتك لايشـرك بـالله شيأ، دخل الجنة و قلت: وإن زنى و إن سرق؟ ، قال وإن زنى وإن سرق ) مسلم .

واتە : جبریل هاتە لام (ﷺ) . مژدەی پێ دام بەوەی کەهەرکەسێ لە ئۆممـەتی تـۆ مردووە و بەهیچ شێوەیەك هاوبەشی بۆ خوای گـەورە بڕیـار نـەداوە ، ئـەو کەسـە بەهەشتی یە ، منیش گوتم : ئەگەر زیناشی کردبێ ، یان دزی کردبێ ؟ فەرمووی بەڵێ ئەگەر زیانا یا دزیشی کردبێت .

وە ئەبو هورەیرەی سەحابەی شکۆدار رەزاو رەحمەتی خوای گـەورەی لەسـەر بـێ ، دەفەرموێ : ئیمان پاکە ، هەرکەسێك پیسی بکا ئیمانی لێ جیا دەبێتەوە ، وەلێ ئەگەر ئیمانی خۆی سەر کۆنە و تاوانبار کرد ، ئیمانەکەی دەگەڕێتەوە لای .

وە ئەبو دەرداى سەحابەى شـکۆدار رەزاو رەحمـەتى خـواى گـەورەى لەسـەر بـێ ، دەفەرموێ: ئیمان وەکو کراسی بەرى ئێوە وایە ، جارێك دادەمالرێ و جـارێکیش لەبەر دەکرێ ، سوێند بە خواى گەورە بەندە لە ئیمانی خۆى دلنیا نابێ ئـیلا لـێ دادەمالرێ ، وەلێ دواتر دەستی دەخاتەوە و دەبەرى دەکاتەوە .

وە عبداللە کورى عباس سەحابەى شکۆدار رەزاو رەحمەتى خواى گـەورەى لەسـەر بێ، بە غولامێکی خۆى فەرموو : ئاگاداربە ژنت لێ مارە دەکەم ، واتە ژن بێنە ، چونکە هەر بەندەیەك زینا بکا، خواى گەورە بە هۆى ئەوە رۆناکـایی ئیمـانی لـێ دادەمالێت .

لەوەلامدا عیکرە مە رەزاو رەحمەتى خواى گەورەى لەسەر بێ لـە عبداللـە کـورى عباس شکۆدار ی پرسی چۆن ئیمانی لێ دادە مالرێ ، ئەویش پەنجەکانی هەردوو دەستی خۆى لەنێو یەك راکردن و دەریهێنانو ، فەرمووى : بەم شێوەیە وەك ئـەم پەنجانە ئیمان لەناو لاشـەى ئینسـانە و بـە هـۆى گونـاهو تاوانەکانیـەوە لەبـەرى دادەمالدرێت .

# بنچینە و بنەمای سێیەم

# هەڵوێستی خەڵکی سوننە و جەماعە سەبارەت بەمەسەلەی بێ باوەڕکردن

# الأصل الثالث

# موقف أهل السنة والجماعة من مسألة التكفير

# هەڵوێستی ئەهلی سوننە و جەماعە دەربارەی مەسەلەی تەکفیرکردن

نچینەکانی بیرو باوەڕی سەلەفی سالح (ئەهلی سوننە و جەماعە) ئەوەیە ، کە کەسێك لە ئیسلام بەدەرناکەن، ئەگەر کارێك بکا کە پێی کافر دەبێ، بەڵام ئەگەر نەزان بوو ، یابەهەڵەی تێگەیشتبوو، یازۆر لێکراو بوو (ئەگەر دڵەکەی بەئیمان ئۆقرەگربێ) ، تەنها دوای ئەوە نەبێ کە بەڵگەی لەسەر تۆمار دەکرێ، بەڵام وەلای دەنێ و کاری پێ ناکا، وەهیچ کەسێك لە مسوڵمانان کافر ناکەن بەکردنی هەر تاوانێك ، با تاوانەکە لە تاوانە گەورەکانیش بێ کەلە خوار شیرکە وەیە، ئەهلی سوننە هێشتا حوکمی دەرچوون (فسق) و کەم ئیمانی بەسەر دەدەن ماتو حەڵاڵی نەکا، یا بەرهەڵستی (جحد) ی شتێك نەکا کەلە پێویستیە زانراوەکانی ئایینە، لەبەر ئەوەی خوای گەورە فەرموویەتی :

إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاء وَمَن يُشْرِكْ بِاللّهِ فَقَدِ افْتَرَى إِثْمًا عَظِيمًا {النساء/٤٨}.

واتە : خوای گەورە لەکەسێك خۆش نابێ کە هاوبەشی بۆ پەیدا بکا، بەڵام لە هەموو گوناهێکی تری لە خوار (شرك) خۆش دەبێ ، لەکەسێ کە دەیەوێ لێ ی خۆش بێ، وەهەر کەسێ شیرك بۆ خوای گەورە بڕیاربدا، بەراستی تاوان و ناماقوڵیەکی گەورەی بەرانبەر بەخوای گەورەکردوە .[١٠٥]

---

[١٠٥] وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ السَّمَاء فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ أَوْ تَهْوِي بِهِ الرِّيحُ فِي مَكَانٍ سَحِيقٍ {الحج/٣١}

وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ {الزمر/٥٣}

واتە : ئەی ئەو بەندانەی من کەزێدە ڕۆی تان لە گوناهوتاوانکردن لە خۆدا کردەوە وتێتان پەڕاندوە ، لەزەیی و بەخششی خوای گەورە بێ هیواوئومێد مەبن ، چونکە خوای گەورە بەزەیی و لێخۆشبەرەو ،، ئەگەر بیەوێ لەهەموو گوناهەکان تان خۆش دەبێت .

وەپێغەمبەری خوای گەورە ش (ﷺ) دەفەموێ :

(أيما إمرئ قال لأخيه كافر، فقد باء بها أحدهما، إن كان كما قال ، وإلا رجعت عليه) مسلم .

---

واتە : ئەو کەسەی کە هاوبەشی بۆ خوای گەورە بڕیاردەدا ، وەکو ئەوە وایە کەلە ئاسمان کەوتۆتە خوارەوە و ، بالە فڕە دەیفڕێنێ یاباویژ دەی هاوێتە شوێنێکی هاڕەرو فەوتێنەر.

وە پێغەمبەریش (ﷺ) سەبارەت بە شیرك بۆ خوا پەیداکردن دەفەرموێ :

(حق الله على العباد أن يعبدة ولا يشركوا بة شيئاً) بخاری /ج٣، ص١٠٤٩، رقم٢٧٠١ و مسلم/ ج١، ص٥٩، رقم ٣٠

واتە: هەقی خوای گەورە لەسەر بەندە دروستکراوەکانی ئەوەیە کە تەنها ئەو بپەرستن و بە هیچ شێوەیەك هاوبەشێکی بۆ بڕیار نەدەن .

وە دەفەرموێ : ( من مات من أمتي لايشركوا بالله شيئاً دخل الجنة ) بخاری .

واتە: هەر کەسێك لە ئۆمەتی من مرد و قەت هاوبەشی بۆ خوای گەورە بڕیار نەدا، ئەوا چۆتە بەهەشتەوە.

وە دەفەرموێ : (من لقي الله لايشركوا به شيئاً دخل الجنّة ) بخاری، وەرگێڕ.

واتە: هەر کەسێك بە براکەی بڵێ: ئەی کافر، بێگومان یەکێك یـان لـەوە بەریـە، ئەگەر فەعلەن کابرا وابوو، وەکو ئەو گووتی، دەنا ئەو کافریە بۆ خۆی دەگەڕێتەوە.

وەپێغەمبەری خوای گەورە ش (ﷺ) دەفەموێ :

من دعا رجلا بالكفر، أو قال : عدو الله ! وليس كذلك إلاحار عليه . مسلم .

واتە : کەسێك کەسێك بە کافر بانگ بکات و ناوی ببات ، یا پێی بلێ : دوژمنی خوا ، ئاواش نەبێ کە پێی گووتووە ، ئەوقسە خراپ و ناشەرعیە بۆسەر خۆی دەگەڕێتەوە .

وەپێغەمبەری خوای گەورە ش (ﷺ) دەفەموێ :

لايرمي رجل رجلا بالفسوق ، ولا يرميه بالكفر، إلا ارتدت عليه ، ان لم يكن صاحبه كذلك . البخاري .

واتە : هەرکەسێك کەسێك بە گوناهو فسق یا بە کوفر تاوانبار بکات و ناوی ببات، ئەگەر کەسەکە ئاوا نەبێ کە پێی گووتووە ، ئەوقسە خراپ و ناشەرعیە بۆسەر خۆی دەگەڕێتەوە .

چونکە ئەسلی کوفر بریتییە لە: بەدرۆزانینێکی بە ئانقەست ( تكذيب المتعمد)و سینە بۆ کردنەوە و، دڵ و دەروون پێ ئۆقرە گرتن و هۆگربوون و دڵنیا بوون پێیەوە.

بۆیە خوای گەورە دەفەرموێ :

وَلَكِن مَّن شَرَحَ بِالْكُفْرِ صَدْرًا فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِّنَ اللَّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ {النحل١٠٦}

واتە: بەڵام، ئەو کەسەی کە سینەی خۆی بۆ بێ باوەڕی کردۆتەوە و دڵی پێ شاد و گوشاد دەبێت ، حسابی جیایە لەگەل ئەو کەسەی کە تەنها گوناهو تـاوان دەکـا،

وەلێ دلی بە ئیمان‌و ئیسلام گۆش‌و بەندو هۆگرە ، ئەوانە خەشمی خوای گەورەیان لەسەرە و، سزاو ئازارێکی زۆریان بۆ هەیە لە دوارۆژدا

وە هیچ کەسێك لە خۆوە بە کافر دانانێن ئەگەر بەڵگەی قورئان و سوننەیان لەسەر کوفر کردنیان نەبێ، ئەگەر کوفریشی کردبوو، وە لە سەر ئەوە مرد، چارەنووسی بە دەست خوای گەورەیە، ئەگەر خوا ویستی سزای دەدا و ئەگەر ویستی لێی خۆش دەبێ، بە پێچەوانەی کۆمەڵە گومڕاکان (الفرق الظالة)، کە حوکمی کافر بوون بەسەر بکەر (فاعل) ی تاوانە گەورەکاندا دەدەن، یان دەڵێن لە دوا ڕۆژدا لە نێوان دوو هەوار (لە نێوان بەهەشت و جەهەننەم) ە، بەڵام پێغەمبەری خوای گەورە (ﷺ) لەوەی ئاگادار کردوینەوە، وەك دەفەرموێ :

یا دەفەرموێ : (من رمى مؤمناً بكفر، فهو كقتله) بخاری .

واتە: هەر کەسێك ئیماندارێك بە کوفر تۆمەتبار بکا، وەکو کوشتنی وایە[106]

وەپێغەمبەری خوای گەورە ش (ﷺ) دەفەموێ :

اذا قال الرجل لأخيه : ياكافر فقد باء به أحدهما.البخاري .

واتە : ئەگەر هەرکەسێك بە برایەکەی بلێ : ئەی کافر ، ئەوقسە خراپ و ناشەرعیە یەکێکیان لەهەردووکیان دەگەڕێتەوە .

---

[106]. وە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: ( من قذف مؤمناً بكفرٍ فهو كقتله ) بخاری .

واتە: هەر کەسێك ئیماندارێك بەبێ باوەڕ تۆمەت بار بکا، وەکو ئەوە وایە کە کوشتویەتی، تەنها ئەو کەسە نەبێ کە ئایینی خۆی گۆڕیوە و لە ئیسلام هەڵگەڕاوەتەوە، هەر وەك پێغەمبەر (ﷺ) سەبارەت بەوە دەفەرموێ :

( من بدلَّ دينه فقتلوه ) بخاری .

واتە: ئەوەی ئایینی خۆی گۆڕیوە و لە ئاینی خۆی هەڵگەڕاوەتەوە ، کافرەو بیکوژن. وەرگێڕ.

**ئەهلی سوننە و جەماعە:** جیاوازی دەکەن لـەنێوان حـوکم بەسـەر دانێکـی ڕەهـا (مطلق) بەسەر خاوەن بیدعە چیە تاوانبارەکان و کوفری تەواو و بـێ پـەروا، وە لـە نێوان کەسێکی دیاریکراوکە ئیسلامی بە دڵنیاییەوە وەرگرتووە ، بەڵام بیدعەیەك لە بیدعەکانی لێ ڕوودەدا، جا ئەو بیدعەیە، یان یاخی (عاصی) بوونـە، یـا دەرچـوون (فاسق) بوونە، یا بێ باوەڕ (کافر) بوونە، تەنها بەوە حوکمی کافر بـوونی بەسـەردا نادەن، تا هەقیان بۆ روون نەبێتەوە، دیارە ئەو هەقەش بەبەڵگە (حجة) لەسەر بەرپا کردن و بەلادانی شوبهەکان یان بۆ رون دەبێتەوە، تەنانەت کەسێکی دیـاریکراویش کافر ناکەن، تەنها ئەگەر مەرجەکانی تێدا بێنەدی و بەربەستەکان (موانع) نەمێنن بۆ بێباوەڕکردنی .

ئەبی هورەیرە رەزاو رەحمەتی خوای گەورەی لەسەر بێ دەڵـێ گـوێم لـە پێغەمبـەری خوای گەورە بوو ﷺ دەیفەرموو :

کان رجلان في بني اسرائيل متؤاخيين ، فكان أحدهما يذنب ، والاخر مجتهد في العبادة ، فكان لايزال المجتهد يرى الاخر على الذنب ، فيقول : أقصر. فوجده يوما على ذنب ، فقال له ، أقصر. فقال : خلني وربي أبعث علي رقيبا ؟ فقال : والله ! لا يغفر الله لك - أولا يدخلك الله الجنة !- فقبض أرواحهما ، فاجتمعا عند رب العالمين ، فقال لهذا المجتهد : كنت بي عالما، أو كنت على مافي يدي قادرا؟ وقال للمذنب : اذهب فادخل الجنة برحمتي وقال للاخر: اذهبوا به الى النار . أبي هريرة .

واتە : لە نێو وەچەو رۆڵەکانی ئیسرائیل دوو پیاو هەبوون زۆر تەبا و برابوون ، یەکێکیان گوناهو تاوانی زۆری دەکرد ، یەکێکیشیان زۆر خواپەرستی دەکرد ، ئەوەی کە زۆر خواپەرستی دەکرد ئەوەی گوناهکاری دەدیت کە لەسەرگوناهکردنی هەر بەردەوامە ، رۆژێك پێی گووت بەسە واز لە گوناهو تاوان بێنە ، هێندە گوناهوتاوان مەکە ، رۆژێك لەسەر گوناهو تاوان دیتی ، پێی گووت : بەسە واز لە

گوناهو تاوان بێنە، هێندە گوناهوتاوان مەکە ، ئەویش گوتی: لێم گەڕێ خوای گەورە چاودێرێکی بۆ ناردووم کەچاودێریم ئەکات ، خواناسەکەش پێی گووت : کوڕە سوێند بەخوا خوای گەورە لێت خۆش نابیت، خوای گەورە نات باتە بەهەشت، کاتێك هەردووکیان مردن، لای خوای گەورە کۆبوونەوە، خوای گەورە بە خواناسەکەی گووت: ئایا تۆ بە من زانا بوویت کە لەو گوناهبارە خۆش نابم، ئایا تۆ لەسەر ئەوەی لە دەستی منە توانادارو خاوەن قودرەت بوویت تا وای پێ بلێیت ، دەرەنجام خوای گەورە بە گوناهبارەکەی فەرموو : تۆ برۆ بە رەحمەتی من بچۆ بەهەشت ، وەبە خواناسە کەشی گووت : بیبەنە ناو ئاوری دۆزەخ.

بێ باوەڕان لەروانگەی شەرعەوە دوو جۆرن :

بێ باوەرە ئەسلییەکان : ئەوانەی لە بنچینەدا کافرن و موسلمان نین ، واتە: ئەوانەی لە بنچینەدا نە هاتوونەتە ناو ئاینی پیرۆزی ئیسلام ، وەك دەهریەکان، فەلسەفەکان، جولەکەکان، گاورەکان، قورئان و سوننە و کۆدەنگی زانایانی ئیسلام لەسەر بێباوەڕی ئەوانە بەلگە و شاهێدن ، مردوەکانیان لە نێو ئاگری دۆزەخدا بە هەمیشەیی دەمێننەوە، ناچنە بەهەشت، وەك خوای گەورە دەفەموێ:

قَاتِلُواْ الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَلاَ بِالْيَوْمِ الآخِرِ وَلاَ يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللّهُ وَرَسُولُهُ وَلاَ يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ حَتَّى يُعْطُواْ الْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ {التوبة/٢٩}

واتە : لەگەل ئەو جولەکە و گاورانەدا بجەنگن و شەڕیان لەگەلدابکەن کە بڕوایان بـە خوای گەورە و بە رۆژی دوایی و بەوە نیە کە خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی ﷺ حەرام و یاساغیان کردووە، وە بڕوایان بەو ئاییـنە پیرۆزو هەقە نیە کـە خـوای گـەورە بـۆ ئادەمیزادی ناردۆتە خوارەوە ، تا باج وسەرانە دەدەنە دەولەتی ئیسـلامی و دەسـت بەدەس لێیان وەردەگرن ، لە جیاتی ئەوەی کە سەرو مالیان لە دەولـەتی ئیسـلامی

پارێزراوەو بەشداری لە شەروشـۆڕەکاندا ناکـەن ، ئەگەرچـی پێشـیان ناخۆشـەو زۆر ناشایستەو رەزیلن .

هەلگەڕاوەکان : ئەوانەی هاتونەتە نێو ئیسلام و پالیان داوە ئیسلام ، بـەلام لـەروی بیرو باوەرەوە لە ئیسلام دەرچوونە ، یا بیرو باوەڕو کـارو کـردەوەو کرداروگوفتـارو قسەیەکیان پێچەوانەی ئیسـلامەکەیانە ، بـەوەش کـافر دەبـن ، ئەگەرچـی هەنـدێ دروشمی ئیسلامیش ئەنجام بدەن،وەك: باتینیەکان و ڕۆچووەکانی ڕافیزە و قادیانیەکان و هاو شێوە کانیان .

بێ باوەڕی (کفر) دژ و پێچەوانەی ئیمانە، کوفریش لە زمان و ترازوی شەرعدا دوو جۆرە کوفرە: ئەگەر(کوفر) لە دەقەکانی قورئان و سوننە هات، زۆر جار مەبەستی پێ ئەو کوفرەیە کە پیاو پێی لە میللەتی ئیسلام دەردەچێ، وە زۆر جاریش مەبەستی پێ ئەوەیە کە پیاو پێی لـە میللـەتی ئیسـلام دەرناچـێ، بـەم شـێوەیە کـوفریش چـەند بەشێکی هەیە، هەروەکو ئیمان چەند بەشێکی هەیە، کوفریش خاوەنی چەند بەش و بنچینە (اصول) یەکی جیا جیایە (متفاوت)ە، کە هەندێك لەوانە کافر بوونی پیـاو پێویست (واجب) دەکەن و هەنـدێکیش یـان لـە سیفەت و ڕەوشـتەکان (خصـال) ی کافرەکانن،و ئینسانی پێ کافر نابێت .

یەکەمین : کوفری گەورە کە پێی لە میللەتی موسڵمان دەردەچێت، وە بە بێ باوەڕی بیروباوەڕ ( کفر الاعتقادي )ناودەبرێت .

ئەو جۆرەیان : ئەوەیە کە بەندەکانی ئیمانی پێ هەڵدەوەشێتەوە و، ئیسلام بوونی پێ پوچەڵ (باطل) دەبێتەوە، وە ئینکاری کردنی شتێکە کە ئیسلام بەبێی ئەو نابێ، ئەو جۆرەیان خاوەنەکەی هەتا هەتایە لەناو ئاگردا دیڵێتەوە، وە لە بازنەی ئیمـان دەری دێنێ، وە کوفرەکەش بە بیروباوەڕ و کردارو گوفتار ( إعتقاد وقول وعمل ) دەبێ، کە خۆی لە پێنج جۆردا کورت هەڵدێنێ .

## جۆرەکانی بێ باوەری ( کوفر ) :

١ - کوفری بە درۆ زانین (کفر التکذیب): بریتییە لەو بیروباوەڕەی کە پێغەمبەران (علیهم السلام) بە درۆ دەزانێ و بەدرۆیان دەخاتەوەو، پڕوپاگەندەی ئەوە دەکا کە پێغەمبەر (ﷺ) شتێکی ناهەقی هێناوە، وە لەوەدا پێغەمبەر (ﷺ) بە درۆ دەخەنـەوە کـە دەفەرموێ: خوای گەورە ئەوەی حەلاڵ کردوە و ئەوەی حەرام کردوە، گەرچی دەشزانن کەفەرمانی خوای گەورەیە، بەڵام هەر بەرهەڵستی دەکەن و دان بە هەق و عەدالەتی شەرعی دانانێن[١٠٧] وەك خوای گەورە دەفەموێ :

---

[١٠٧] . بەڵێ بێ باوەڕەکان پێغەمبەریان (ﷺ) بە درۆ دەزانی و جۆرەها بوهتانیان پێ دەکرد و ناو و ناتۆرەیان لی دەنا، بۆ وێنە: پێیان دەگوت: ( شێتە، درۆزنە، جادوکەرە، ....هتد) وەك لە ئایەتەکاندا هاتووە، یان دەیانگووت :

إِنْ هَذَآ إِلاَّ أَسَاطِيرُ الأَوَّلِينَ {الأنعام/٢٥}.

واتە: ئەو قورئانە ئەفسونەو پەندی پێشینانە و محمد ﷺ لە خۆیەوە دایناوە، بۆیە بە بانگهێشە و داخوازییەکانی ئەو بڕوایان نەکرد، بەڵام خوای گەورە تا هەتا وەڵامی هەموو ئەوانە دەداتـەوە و دەفەرموێ :

مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاء عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاء بَيْنَهُمْ تَرَاهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ السُّجُودِ {الفتح/٢٩}.

واتە : محمد ﷺ پەیامبەری خوای گەورەیە، کەواتە خوای گەورە بەسە کە گەواهی بـێ پـەروا بـۆ پێغەمبەری ئازیزمان دەدا کە بە پێغەمبـەر ناوی دەبا ، ئەوانەی کە لەگەڵ ئەون ، لەگەڵ کافران توندن ، وەلەگەڵ موسلمانان بەرەحمو بەسۆزن ، هەمیشە بە کڕنۆش بەرو روکوع بەریان دەبینی بۆ

**وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِالْحَقِّ لَمَّا جَاءَهُ أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَافِرِينَ {العنكبوت/٦٨}**

**واتە : ئایا کێ لەو کەسە ستەمکارترو خراپترە کە درۆ ودەلە سە بە زاری خوای گەورە هەلدەبەستێت و ، هاوەلی بۆ بڕیار دەدا ، یا بەرانبەر بە بەرنامەی خـوای گـەورە و ئایینی پیرۆزی ئیسلام بێباوەر دەبێ و بە درۆی دەزانێت کاتێ کە لەلایەن خوای گەورەوە**

---

خوای گەرورە ، هەمیشە داوای بەخشش‌و ڕەزامەندی خوای گەورە دەکەن ، وەلـە نێوچـەوانیاندا ڕەنگ‌و روخسارو شوێنی کڕنۆش‌و خوا پەرستی دەبینیت

وە دەفەرموێ : مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا{الأحزاب/٤٠}.

واتە: محمد باوکی هیچ کامێك لە ئێوە نیە، بەلکو پێغەمبەری خوایە و دوایین پێغەمبەرە کە بۆ بەشەریەتمان ڕەوانە کردوە، وە دەفەرموێ: مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَى {النجم/٢}

واتە: محمد گومڕا و سەرلێشواو نیە و لە ڕێی ڕاستی خوای گەروە نەترازاوە و لای نەداوە

وە دەفەرموێ: بِمَجْنُونٍ وَمَا صَاحِبُكُم {التكوير/٢٢}.

واتە : هاوڕێکەتان ( محمد ) ﷺ شێت نیە، بەلکو ئاقلە و لەسەر ڕێی راستی خوای بێ هاوتایـە، کەچی ئەوان دەیانگوت:

إِنَّ هَذَا لَسَاحِرٌ مُّبِينٌ {٢} یا دەیانگوت : هَذَا سَاحِرٌ كَذَّابٌ {ص/٤}.

واتە: محمد ﷺ ساحیر و درۆزنە، کەچی پێغەمبەر (ﷺ) سـەبارەت بـە بـەدرۆزانینی پێغەمبـەر دەفەرموێ:

(من تعمد عليَّ كذباً فاليتبوَّ مقعده من النار) بخاري .

واتە : هەر کەسێك بە ئەنقەست درۆیەك لەسەر من بکا، با لەنێو ئاوری جەهەنەمدا جێگایەك بۆ خۆی دیاری بکا. وەرگێڕ .

بۆ هاتووە ، ئایا لەنێو دۆزەخدا جێگەیەك بۆ ئەو جۆرە کەسانەو بۆ بێباوەڕەکان سازو ئامادەنەکراوە ، بێگومان بۆیان ئامادەکراوە

٢- کوفری یاخی بوون و خۆ بە گەورە زانین، وێـڕای دانپیاهێنـان و بەڕاسـت دانـان ( کفر الإباء والاستنكار مع التصديق ) :

بریتییە لەو بیروباوەڕەی کە: دان بەوە بنێ کە ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) لەلای خوای گەورە هێناوە، هەقە و لەلایەن خوای گەورەوەیە، بەڵام زۆریە ناشیرینی و خراپی و دەم درێژی بەدوکەوتن و پەیڕەوی لێکردن ( إتباع ) ی ڕەت دەکەنەوە و سوکایەتیش بە خەڵکەکەی دەکەن، وەك کوفری شەیتان (إبلیس)، کە ئینکاری فەرمانی خوای گەورەی نەکرد و بەرانبەری بێ باوەڕ نەبوو، بەڵکو خۆی بە زل زانی و یاخی بوو و کاری پێ نەکرد[١٠٨]

١٠٨ . وەك خوای گەورە لە چەند جێ باسی ئەو جۆرە کوفرە و باسی چۆنیەتی یاخی بوونی شەیتانی بەد دەکات، بۆ وێنە دەفەرموێ :

وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلاَئِكَةِ اسْجُدُواْ لآدَمَ فَسَجَدُواْ إِلاَّ إِبْلِيسَ أَبَى وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ {البقرة/٣٤}.

واتە: کاتێ کە بە فریشتەکانمان گووت سوژدەی ڕێز و حورمەت بۆ حەزرەتی ئادەم ببەن علیە السلام ، هەموو بە تێکڕا بە فەرمانی خوای گەورە سوژدەیان بۆ برد، تەنها شەیتان نەبێ کە کڕنۆشی بۆ نەبرد و خۆی بە گەورە زانی و لووت بەرزی کرد و لە خوای گەورە یاخی بوو، ئەوسا خـواش کـۆتی نەفرەتی لە گەردەن کرد، ئا ئەوە دەرئەنجام و چارەنووسی خۆ بەگەورە زانین و لووت بەرزی یە، بۆیە پێغەمبەری پێشەوا ﷺ سەبارەت بە لاف و گەزاف لێدان دەفەرموێ :

( لايدخل الجنة من كان في قلبه مثقالة ذرة من الكبر ) مسلم ج١، ص٩٣، رقم ٩١

واتە : ناچێتە بەهەشت ئەو کەسەی بە ئەندازەی تۆسقاڵە گەردیلەیەك کیبری لەدڵدا هەبێ . وەرگێڕ.

وەك خوای گەورە دەفەموێ : قَالُوا أَنُؤْمِنُ لَكَ وَاتَّبَعَكَ الْأَرْذَلُونَ {الشعراء/١١١}
واتە : هەندێ لە دەمڕاستانی گەلی نوح بە حەزرەتی نوحیان گووت : ئایا چۆن ئێمە لەبەر خاتری تۆ ئیمانت پێ بێنین لە کاتێکا ئەوانەی بەدوای تۆ کەوتوون خەلکی هەژارو نەدارو داماون .

٢- کوفری روو لێ وەرگێڕان و پشت تێ کردن (کفر الإعراض): بریتییە لەو بیروباوەڕەی کە: بە دڵ و گوێ ڕووی خۆی لە پێغەمبەر (ﷺ) وەردەگێڕێ و پشتی تێ دەکا، بە ڕاستی دانانیێ و بەدرۆی ناخاتەوە، وەپاڵپشتی و دۆستیەتی ناکاو، دژایەتی و دوژمنایەتیشی ناکا، هەرگیز ڕووی تێ ناکا، بەڵکو واز لە هەق دێنێ و فێری نابێ و کاری پێ ناکا، وە لەو جێ گایانەش ڕادەکا کە باسی هەقیان لێ دەکرێ، بۆیە ئەو کەسە بێ باوەڕ (کافر) ە و ، کوفری پشت هەڵکردن و ( إعراض ) ی پێ دەگوترێ[١٠٩] .

---

[١٠٩] . هەروەك خوای گەورە سەبارەت بەو کەسانەی کە پشت لە قورئان و ئیسلام دەکەن دەفەرموێ:
فَأَعْرِضْ عَن مَّن تَوَلَّى عَن ذِكْرِنَا وَلَمْ يُرِدْ إِلَّا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا {النجم/٢٩}
واتە: ئەی محمد ﷺ پشت بکە ئەو کەسانەی کە پشت لە بەرنامەی ئێمە دەکەن و لێی یاخی دەبن، گوێ یان پێ مەدە ، مەبەستیان تەنها ژیانی دونیایە، بەلاّم خوا ژیانی ئەوانە تەنگ و سەخت دەکات، وەك دەفەرموێ:
وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى {١٢٤} قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِي أَعْمَى وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا {طه/١٢٥}
واتە: هەر کەسێ پشت لە پەیام و بەرنامەی من بکاو واز لێ بێنێ ، من لە دونیادا ژیانی ئەو کەسە هەمیشە تەنگ و ناڕەحەت دەکەم، وە لە دواڕۆژیشدا بە کوێری کۆی دەکەمەوە و حەشر و حیسابی لەگەڵدا دەکەم ، بۆیە ئەو کەسانە لەو ڕۆژەدا دەڵێن :

وەك خوای گەورە دەفەموێ : وَالَّذِينَ كَفَرُوا عَمَّا أُنذِرُوا مُعْرِضُونَ {الأحقاف/٣} .
واتە : ئەوانەی کە بێباوەر بوون دەربارەی ئەوەی کە پێان راگەیندراو هۆشداریان پێدرا ، پشتیان هەلکردوو بێباوەر بوون .

٤- کوفری دوو ڕوویی و دوفاقی : (كفر النفاق): ئەو بیرو باوەڕەیە کە: بە ڕوالەت وا خۆیپیشان دەدا کە بەدوای پێغەمبەری خوا کەوتوە، کەچی بە دڵ ڕەتی دەکاتەوە و بڕوای پێی نیە، واتا بە ئاشکرا ئیماندارەو بە نەهێنی و پەنهانیش بێ باوەڕ (کافر) ە[110] .

وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ {الملك/١٠}
واتە: ئەگەر ئێمە لە دونیادا گوێمان لە پەیامبەر و مامۆستایانی ئایینی و قورئانی پیرۆز بگرتبایە و ئاقڵ باینە، تەنها بەدوای ڕێبازی پێغەمبەر کەوتباینە، ئەمڕۆ ئاوامان لێ نەدات و نابوینە ئەهل و نیشتەجێی دۆزەخ، دیارە دان بە هەڵەی خۆیان دادەنێن وەك خوای شکۆدار دەفەرموێ :
فَاعْتَرَفُوا بِذَنبِهِمْ فَسُحْقًا لِّأَصْحَابِ السَّعِيرِ {الملك/١١}
واتە : لەرۆژی دواییدا کافرو خوانەناسان بە ناچاری لەبەردەم دادگای خوای گەورەدا دان بە هەڵە و تاوانەکانی خۆیاندا دەهێنن ، خوای گەورەش پێیان دەفەرمووێ دەبڕێنە نێو ئاوری دۆزەخ و لەوێ نیشتە جێ بن و بهاڕدرێن .
لەبەر ئەوەی گەیشتونەتە ڕۆژێکی پڕ حەق و عەدالە ت ، ناتوانن سەر پێچی و نکوڵی لە ڕاستیەکان بکەن . وەرگێر.

[110] . وە ك خوای گەورە لە سورەتی (البقرە) لە (٧) ئایەتدا باسی ئەو دورووە بێ باوەڕانە دەکا کە دردۆنگ و دڵنەخۆشن بەرامبەر بە ئیسلام، بۆیە خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێ :
وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لاَ تُفْسِدُواْ فِي الأَرْضِ قَالُواْ إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ {١١} أَلا إِنَّهُمْ هُمُ الْمُفْسِدُونَ وَلَكِن لاَّ يَشْعُرُونَ { ١٢} وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ آمِنُواْ كَمَا آمَنَ النَّاسُ قَالُواْ أَنُؤْمِنُ كَمَا آمَنَ السُّفَهَاء أَلا إِنَّهُمْ هُمُ

وەك خوای گەورە دەفەموێ : أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَأُ الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ وَالَّذِينَ مِن بَعْدِهِمْ لاَ يَعْلَمُهُمْ إِلاَّ اللّهُ جَاءتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَرَدُّواْ أَيْدِيَهُمْ فِي أَفْوَاهِهِمْ وَقَالُواْ إِنَّا كَفَرْنَا بِمَا أُرْسِلْتُم بِهِ وَإِنَّا لَفِي شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَنَا إِلَيْهِ مُرِيبٍ {إبراهيم/٩}

---

السُّفَهَاء وَلَكِن لاَّ يَعْلَمُونَ {١٣} وَإِذَا لَقُواْ الَّذِينَ آمَنُواْ قَالُواْ آمَنَّا وَإِذَا خَلَوْاْ إِلَى شَيَاطِينِهِمْ قَالُواْ إِنَّا مَعَكْمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِؤُونَ {١٤} اللّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ وَيَمُدُّهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ {١٥} أُوْلَئِكَ الَّذِينَ اشْتَرُوُاْ الضَّلاَلَةَ بِالْهُدَى فَمَا رَبِحَت تِّجَارَتُهُمْ وَمَا كَانُواْ مُهْتَدِينَ {١٦} البقرة .

واتە: کاتێ کە بە مونافیقەکان دەگوترێ تۆوی گونـاه و تـاوان و خراپـەکاری و دوویـەرەکیو فەسادی لەنێو خەڵکولە زەوییدا بلاومەکەنەوەو مەڕوێنن، دەڵێن: وانیە ، ئێمە خەلکی بـاشو چاکسازین ، بەڵام ئاگاداربن ئەوانە تێکدەر و خراپەکارن، بەڵام بەهۆی بێ دینی و لووت بەرزیان دانی پێ داناهێننو هەستی پێ ناکەن، وە کاتێ کە پێیان دەگوترێ: وەکو ئەو خەلکە ئیمان بێنن کە ئیمانیان هێناوە ، دەلێن : ئایا ئێمە ئیمان بێنین وەکو ئەو خەلکە گێل و نەفامەی کە ئیمانیان هێناوە ،کەچی نازان ئەوان گێل و نەفامن ، چونکە ئیمان نایەنن ، بەڵام نازانن، وەکاتێ کە دەگەنە برواداران دەلێن ، ئێمە برپوامان هێناوە، کەچی کاتێ کە لەوان جیا دەبنەوە و بە تە نها لـەلای شەیتانە نەگرسەکانیان دەمێننەوە، دەڵێن: ئێمە لەگەڵ ئێوەین، ئەوانمان دەست هەلە دەدا . ئەوە سیفاتی مونافیقەکانە کە بە دوو سەر بۆ خەلکی دەچن و بە دوو ڕوو خۆیان پیشان دەدەن، بۆیە خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێ :

إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيراً {النساء/١٤٥}

واتە: لە ڕۆژی دوایی دووڕووەکان لە نـاو دۆزەخ لـە هـەرە ژێـرەوەن بـۆ عەزابـدانیان ، وە هـیچ پالپشتێکیان نیە تا ڕزگارو هاوکاریان بکا و سەریان بخاتن. وەرگێڕ.

واتە : ئایا ئێوە هەواڵ و سۆراغی گەل و نەتەوەکانی پێش خۆتان وەك گەلی حەزرەتی نوح و عادو سەمود و ئەوانەی کە لەدوای ئەوانیشەوە هاتوون پێتان نە گەیشتووە کە چۆن بوون و چیان بەسەر هات ، خوای گەورە نەبێ کەس نازانێ چیان بەسەر هات و چیان لێ هات ، پێغەمبەرەکانیان لەلایەن خوای گەورەوە بە بەلگەو پەیامی زۆر ڕون و ئاشکرا بۆیان هاتن و بێداریان کردنەوە ، کەچی خوانەناسانیان بەزاری خۆیـان دەستەکانیان رەتکردنەوە، لێیان لە هەلاو فیکە دان ، پێیان گووتن : ئێمە بەرانبەر بەوەی کە ئێوە پێی هاتوون بێباوەرین ، ئێمە لە گومان و دڕدۆنگی داین بەرانبەر بەوەی کە ئێوە بۆ لامانی بانگ دەکەن

٥- کوفری گومانو دڕدۆنگی و دوودڵی (کفر الشك): ئەو بیروباوەڕەیـە کـە بـە شێوەیەکی تەواوو بڕەو (جازم) پێغەمبەر (ﷺ) بە ڕاست نازانێ، وە بە درۆشی دانانی، بەلکو گومانی لە کار و فرمانەکانی دا هەیە، وە لە شوێن کەوتنی دڕدۆنگ و دوو دڵە، کەچی لە ڕووی بیروباوەرەوە دەبێ مرۆ بە دڵنیایی یەوە بڕوای تەواوی بەوە بێ کە هەرچی پێغەمبەر (ﷺ) هێناویەتی هەقە ولەلای خوای گەورە یە و هیچ گومانێکی تێـدا نیە[111] ، جا هەر کەسێك لە بەدواکەوتنی دا دوو دڵ و دڕدۆنگ (متردد و ممتری) بێ،

---

[111] وەك خوای گەورە و میهرەبان دەفەرموێ :

ذَلِكَ الْكِتَابُ لاَ رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ {البقرة/٢}

واتە: ئەو قورئانە هیچ گومانی تێدانیە کە لەلایەن خوای گەورەوە هاتوە و هیدایەتدەرە بۆخواناسان.

وە دەفەرموێ : وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى {٣} إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى {النجم/٤}

واتە: محمد هیچ شتێکی لە خۆوە نەگوتوە، بەلکو هەموو وەحی بوە کە لەلایەن ئێمەوە بۆی هاتوە، بۆیە:

یا وابزانێ کە پێغەمبەر (ﷺ) پێچەوانەی هەقی پێیە ، کوفرێکی گوماندار و بەشەکی کردوە.

وەك خوای گەورە دەفەموێ :

وَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ آمَنَّا بِاللّهِ وَبِالْيَوْمِ الآخِرِ وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ {البقرة/٨}

واتە : هەندێ لە خەلکی ئی واهەیە دەلێ بڕوامان بە خوای گەورە و بە ڕۆژی دوایی هەیە ، کەچی خوای گەورە دەفەرمووێ ئەوانە ئیماندارنین و ، ئیمانیان بە خوای گەورەو بە ڕۆژی دوایی نیە

٦-کوفری جنێو دان و گالتەکردن :

وەك خوای گەورە دەفەموێ : وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ قُلْ أَبِاللّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِؤُونَ {التوبة/٦٥} لاَ تَعْتَذِرُواْ قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ إِن نَّعْفُ عَن طَآئِفَةٍ مِّنكُمْ نُعَذِّبْ طَآئِفَةً بِأَنَّهُمْ كَانُواْ مُجْرِمِينَ {التوبة/٦٦}

---

وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ {الحشر/٧}

واتە: ئەوەی کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ پێتان دەگا و بۆتان دێ لێ وەربگرن، وە ئەویش کە ئەو نەهی لێ دەکا و ڕەتی دەکاتەوە، ئێوەش نەهی لێ بکەن و لێـی دوور بکەونـەوە، چونکەخوای گـەورە دەفەرموێ :

مَّنْ يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللّهَ وَمَن تَوَلَّى فَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا {النساء/٨٠}

واتە: هەر کەسێك بە گوێی پێغەمبەری خوای گەورە (ﷺ) بکا ، بە گوێی خوای پاك و بێگەردی کردوە، بۆیە دەبێ بە هەموو فەرموودە ڕاستودروستەکانی پێغەمبەر ﷺ بڕوا بکرێت، دەنا پیاو پێی کافر دەبێت. وەرگێڕ.

واتە : ئەی پێغەمبەری (ﷺ) ئەگەر تۆ لە بارەی کردارو گوفتـاری ناشایستـەیان لـە خوانەناسەکان بپرسی ئەوە خەریکی چین ، بۆ وا دەکەن ، لە وەلامدادەلێن : هیچ نیە ، ئێمە تەنها گالتە ویاری دەکەین ، تۆش پێیان بلێ : ئایا ئەوە بەرانبەر بە خوای گەورەو ئایەت و فرمایشەکان و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) گالتە دەکەن و بڕواتان پێیـان نیـە ، ئاگادار بن لەرۆژی دوایی قەت عوزرو پۆزشتان لێ قبول ناکرێ کەبەرانبەر بە خوای گەورەو میهرەبان بێباوەربوون دوای ئەوەی کە ئیمان تان هێناو خواتان ناسی ، بەلکو لەبری ئەوە خوای گەورە سزاو ئازارتان دەدات ، ئەگەر لە دەستەیەکیشتان خۆش بین بە هۆی ئەوەی کە تەوبە دەکەن و دەگەرێنەوە لای خوای گەورە ، وەلێ دەستەیەکتان هەر ئێش و ئازار دەدەین لەبەر ئەوەی کە لەسەر کوفرو گوناهو تاوان وبێباوەڕی خۆیان سور و بەردەوام بوونە ، ئەوانە ئینسانی خراپ و تاوانبارن .

٧-کوفری رق لێ بونەوە و بوغزاندن :

وەك خوای گەورە دەفەموێ: ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ كَرِهُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ {محمد/٩} .

واتە : ئەی پێغەمبەری (ﷺ) ئاگاداربە ، ئەوانەی کە بێباوەرن ، خەجالەتی وسەرشۆڕیان بۆ هەیەو، کارو کردەوەکانیان بەتال و مایە پوچە ، ئەوەش بەهۆی ئەوەی کە بڕوایان بەوە نەبوو کە لەلایەن خوای گەورە بۆیان دابەزی و دەیان بێزاندو رقیان لێی بوو ، بۆیە کاروکردەوەکانیان مایە پوچ و ناقبولە

وەك خوای گەورە دەفەموێ :

إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَالْمُشْرِكِينَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا أُولَئِكَ هُمْ شَرُّ الْبَرِيَّةِ {البينة/٦} . واتە : بێگومان ئەوانەی کە لە خاوەن پەیام و پەرتووکەکان و لە

هاوبەشی پەیداکەرەکان بێباوەڕ بوون لەبەر ئەوە لە ڕۆژی دواییدا لە نێو ئاوری دۆزەخدان و ، تیایدا دەمێننەوە ، ئەوانە تاوانبارترین و خراپترین خەلکی سەر گۆی زەوین .

وەك خوای گەورە دەفەموێ :

وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ {الزمر/٦٥}

واتــە : ئــەی پێغەمبــەری (ﷺ) بێگومــان خــوای گــەورە سروشــی بۆتــۆ و بــۆ ئــەو پێغەمبەرانەی لە پێش تۆش ناردووە ، جا ئەگەر هاوبەشی بۆ خوای گەورە بڕیار بدەیت، کاروکردەوەکانت مایە پوچ و ناقبول دەبن ، وە لە ڕەنج بەخەساران و لە زەرە مەندان دەبیت .

ئا ئەو جۆرە کوفرانە: پێویست دەکەن کە هەڵگر و خاوەنەکـەی لـە نێـو ئـاگردا بـە هەمیشـەیی بمێنێتـەوە، وە هەڵوەشـێنەرەوەی هـەموو جـۆرە کردەوەیـەکن، ئەگـەر خاوەنەکەی لەسەرئەو دۆخە (حالة) ە بمرێت .

دووەمین: کوفری گچکە کە پێی لە میللەتی موسڵمان دەرناچێت، کە بەبێ بیرو باوەڕی کرداری ( كفر العملي ) ناو دەبرێت.

دانەر گووتەی (کفر) بەکاردێنێ، بۆ سەرزەنشت و هەڕەشەکردنە، ئەو جۆرە بریتییە لە کردنی گوناهە گەورەکان، کە بکەرەکەی پێ شایستەی چوونە ناو دۆزەخ دەبێ، بەڵام بە هەمیشەیی لەناوی دا نامێنێتەوە، ئەوەش هەموو تاوان و سەرپێچییەکاندەگرێتەوە، چـونکە خەسـڵەتی کـوفرن، بـەڵام مەبەسـتی پـێ ئـەو کفـرە نییـە کـە ئیمـانی پـێ هەڵدەوشێتەوە، وە هەندێ لە نموونەکانیش لەسەر ئەوە ئەمانەن :

شەڕ کردنی موسڵمانان: یا سوێند خواردن بە غەیری خوا ی گەورە، یا حوکم کردن بە غەیری ئەوەی کە خوای گەورە ناردویەتی و، دان پیاهێنانی کە بـۆ سـزادان دەشـێ، ئەوەش لە ڕووی لوتبەرزی و یاخی بوونەوە، نەك لە ڕووی ئینکاری کردن و بڕوا پـێ نەبوو نەوەی بێت، یا چوونە لای جادوکەران (کهان) و کار پـێ کردنیـان و بەڕاسـت دانانیان، یا چوونە لای ئافرەت لە پشتەوە (لە قینگ) ڕا، یا ئەوە کە بڕوادار بە برای بڕواداری دەڵێ ئەی کافر، وە جگە لە وانەش لە شێوەکانی کوفری گچکە، وەك خوای بێ وێنە دەفەرمووێ :

وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِن بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَـى الْـأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِن فَاءتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ {الحجرات/٩

واتە: ئەگەر دوو دەستەوتاقم و کۆمەڵ لە ئیمانداران لەگەڵ یەکتری بەشـەڕ هـاتن و یەکتریان کوشت، ئاشتەوایی و تەبایی یان لەنێواندا بکەن ، ئەگەر یەکێکیان لەسەر ئەویکە یاخی بوو و نەهاتە ژێر باری دانوستان و ئاشتەوایی ، لەگەل ئەوەدا شەڕ بکەن کەیاخی بووە تا دەگەڕێتەوە لای حوکم و فرمانی خوای گەورە و رازی دەبێ ، ئەگەر گەرایەوە لای حوکمی خوای گەورە و پیێ ی رازی بوو ، بەدادگەریی ئاشتەواییان لـە نێواندا بکەن ، چونکە خوای گەورە دادگەرانی خۆش دەوێت . وەرگێڕ.

وە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ : ( سباب المسلم فسوق وقتاله كفر ) متفق عليه

واتە: جنێو دان بە موسڵمانان دەرچوون (فسق) ە و، شەڕ لەگەڵدا کردنیان بێ باوەڕی (کفر) یە.

وەپێغەمبەری خوای گەورە ش (ﷺ) دەفەموێ :

لاترجعوا بعدي كفارا يضرب بعضكم رقاب بعض .

واتە ئەی هاوەڵ و موسلمانینە ، ئاگاداربن لە دوامردنی من لە ئیسلام هەڵنەگەڕێنەوە و کافر نەبن ، بۆ جۆرێ کە هەندێکتان شەڕ لەگەڵ هەندێکتاندا بکەن و لە گەردەنی یەکتری بدەن .

وە دەفەرمووێ : ( من حلف بغير الله فقد أشرك أو كفر ) سنن ابی داود، البانی .

واتە: هەرکەسێ کە سوێند بە غەیری خوای گەورە دەخوا، شیرکی کردووە یا کـوفری کردوە[112]

وە دەفەرمووێ :

إثنتان في الناس هما بهم كفر ، الطعن في النسب ، والنياحة على الميت . مسلم

واتە : دوو جۆرە شت لە نێو خەڵکی داهەن کوفریان پێوەیە ، تانەدان لـە نـەژاد و ، لەسەر مردوو گریان .

---

[112] . وە پێغەمبەر ی خوای گەورە (ﷺ) سەبارەت بە سوێند خواردن دەفەرموێ :

( من كان حالفاً فاليحلف بالله أو ليصمت ) بخاری .

واتە: هەر کەسێك سوێند دەخوا، با سوێند بە خوای گەورە بخوا، دەنا بێ دەنگ بێت .

وە دەفەرموێ: (من حلف بغير ملة الإسلام، فهو كما قال) بخاری .

واتە: هەر کەسێك سوێند بە غیر ئەوە بخوا کە میللەتی ئیسلام سوێندی پێ دەخوا، سوێندەکە وەکو ئەوە وایە کە دەیڵێت و سوێندی پێ دەخوات . وەرگێڕ.

# بنچینەی چوارەم

## بڕوا هەبوون بەدەقەکانی
## وادەو بەڵێن پێدان و هەڕەشە لێ کردن بەدۆزەخ

# الأصل الرابع

## الإيمان بالنصوص
## الوعد و الوعيد

# بڕوابوون
# بەدقەکانی دان پێدانان و هەڕەشە لیٚ کردن

**لە بنچینەکانی بیروباوەری سەلەفی سالّح (ئەهلی سوننە و جەماعە) :**

بڕوا هەبوونە بەو دەقانەی کەلە قورئان و سوننەدا دەربارەی بەلّێن دان بەبەهەشت بۆ چاکەکاران و هەڕەشە لیٚ کردنی خراپەکاران بە بردنە ناو دۆزەخ ، پشتی تیٚ ناکەن و ، تەئویلی بۆ ناکەن ، وەحوکم بەدەقەکانی دەکەن ، وەك خوای گەورە دەفەرمویٚ :

إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاء وَمَن يُشْرِكْ بِاللّهِ فَقَدِ افْتَرَى إِثْمًا عَظِيمًا {النساء/٤٨}

واتە : خوای گەورە لەکەسێك خۆش نابیٚ کە هاوبەشی بۆ بڕیـارداوە ، بـەلاّم لەهـەر گوناهێکی تری لەخوار ( شرك ) خۆش دەبێت ، بۆ کەسیٚ کەبیەویٚ لیٚ ی خۆش بێت .

وەبیرو بڕوایان وایە کە چارەنووس و پاشە ڕۆژی بەندەکانی نادیار (مبهم) ە ، هـیچ کەسیٚ : نازانیٚ کەچیان بۆ دەنوسریٚ .

وە دەفەرمویٚ :

وَبَشِّرِ الَّذِين آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنْهَا مِن ثَمَرَةٍ رِّزْقاً قَالُواْ هَذَا الَّذِي رُزِقْنَا مِن قَبْلُ وَأُتُواْ بِهِ مُتَشَابِهاً وَلَهُمْ فِيهَا أَزْوَاجٌ مُّطَهَّرَةٌ وَهُمْ فِيهَا خَالِدُونَ {البقرة/٢٥}

واتە : ئەی پێغەمبەر (ﷺ) مزگێنی بدە بەوکەسانەی کە ئیمانیـان هێنـاوە و کـارو کردەوەی چاکەیان کردووە ، لەبری ئەوە لە دوارۆژدا چەند باخێکیان بۆ هەیە کە جۆ وڕوباریان بە ژێردا دەڕوات ، هەر کاتێك خواردن و خۆراك و میوە جاتێك یان لەو باخانە

دەر خۆرد دەدرێ ، دەڵێن : ئەوە ئەوە بوو کەتازە پێشتر خواردمان ، کەچی وانیە بەڵکو هاوشێوەی ئەوەیان پێدراوە و خواردویانە دەنا نام بۆ چێژیان جیایە ، وە ئافرەت و حۆری پاك و قەشەنگیان بۆ هەیە کەتەنانەت تف و بەلغەمیشیان نیە ، لەنێو ئەو نازو نیعمەت و بەهەشتانەدا دەمێننەوە

وەك پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێ :

( إن الرجل ليعمل عمل أهل الجنة ، فيما يبدو الناس ، وهو من أهل النار ، وإن الرجل ليعمل عمل أهل النار ، فيما يبدو للناس ، وهو من أهل الجنة ) بخاري و مسلم .

واتە : پیاوی واهەیە کەکارو کردەوەی ئەهلی بەهەشتیان دەکـات ، خـەڵك وادەزانـێ بەهەشتی یە ، کەچی کابرا ئەهلی دۆزەخە ، وەپیاوی وایش هەیە کەکار و کردەوەی وەك خەڵکی دۆزەخیان دەکـا ، خـەڵك وادەزانـێ نـاوبراو دۆزەخیـە ،کەچـی بابـا ئـەهلی بەهەشتە[113]

[113] وەك پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرموودەیەکی تری دەفەرموێ :

(... إن أحدكم ليعمل بعمل أهل النار حتى يكون بينه و بينها ذارع فيسبق عليه الكتاب فيدخلها ، وإن احدكم ليعمل بعمل أهل الجنة حتى يكون بينه و بينها ذراع فيسبق عليه الكتاب فيدخلها)

واتە : ئی واتان هەیە کەکار دەکا بەکارو کردەوەی ئەو کەسانەی کە پێی چوونەتە جەهەننەم تـا گەزێك لەنێوان ئەو کەسەو جەهەننەم دەمینێ بچێتە دۆزەخ ، کەچی کتابی کارو کردەوەکانی بۆ بەهشت وە پێش خۆی دەخا و دەردەکەوێ کەئەو کەسە بەهەشتیە ، وە پێچەوانەش ئی واتان هەیە کەکاروکردەوە دەکا وەکو کردەوەی ئەو کەسانەی کەپێی دەچنە بەهەشتەوە تا گەزێك لە نێوان ئەوو ئەهلی بەهەشتیەکان دەمێنێ ، ئەگەر بڕێ دەچێتە بەهەشت ،کەچی دواتر بابا هەڵدەگرێتەوە و روو لەخراپە و بێ دینی دەکا و دەچێتە دۆزەخەوە ، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ :

(... إن أحدكم ليعمل بعمل أهل النار حتى يكون بينه و بينها ذارع فيسبق عليه الكتاب فيدخلها ، وإن احدكم ليعمل بعمل أهل الجنة حتى يكون بينه و بينها ذراع فيسبق عليه الكتاب فيدخلها) . بخاري و مسلم .

واتە : ئی واتان هەیە کەکار دەکا بەکارو کردەوەی ئەو کەسانەی کە پێی چوونەتە جەهەننەم تا گەزێك لەنێوان ئەو کەسەو جەهەننەم دەمینێ بچێتە دۆزەخ ، کەچی کتابی کارو کردەوەکانی بۆ بەهشت وە پێش خۆی دەخا و دەردەکەوێ کەئەو کەسە بەهشتیە ، وە پێچەوانەش ئی واتان هەیە کەکاروکردەوە دەکا وەکو کردەوەی ئەو کەسانەی کەپێی دەچنە بەهشتەوە تا گەزێك لە نێوان ئەوو ئەهلی بەهشتیەکان دەمێنێ ، ئەگەر بڕێ دەچتە بەهەشت ،کەچی دواتر بابا هەڵدەگرێتەوە و روو لەخراپە و بێ دینی دەکا و دەچێتە دۆزەخەوە

---

(إنما الاعمال بخواتمها) بخاري .

واتە : شەرتی کارو کردەوە کۆتاییەکەیەتی کەچی دەکەیی و چۆن دەمری ، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ : ( يبعث كل عبد على مامات عليه ) مسلم، ج٤، ص٢٢٠٦، رقم ٢٨٧٨.

واتە : پیاو لەسەر ئەوە زیندو دەکرێتەوە کە لەسەری مردووە و دەفتەری ژیان و کردوەوەکانی لەسەر پێوەداوە، بۆیە پێغەمبەر (عليه السلام) هەمیشە لە ترسی ئەو رۆژە دەیفەرموو:

(اللهم اجعل خواتيم عملي رضوانك) مجمع زوائد / ج١٠/ص١١٠.

واتە: یاخوە خوایە ئاخیر کارو کردەوەی ژیانم خێر بکەی و لە کارو کردەوەکانم ڕازی بیت. بۆیە پێغەمبەر (عليه السلام) دەفەرمووێ

: ( أول ما يسألُ عنهُ العبد يوم القيامةَ ينظر في صلاته ) مجمع الزوائد، ج١، ص٢٩٢.

واتە: یەکەم کار و شت کە لە دوارۆژ لە ئینسان دەپرسرێتەوە نوێژە، چونکە ئەگەر نوێژەکانی چاك کردبن ، نوێژەکانی لە گوناه و تاوانی تری پاراستون و کارەکانی تریشی چاکن. وەرگێڕ.

خوای گەورە لە باس و پێناسەی بروادارانی راستەقینەو راستگۆدا دەفەرمووێ :
إِنَّهُـمْ كَـانُوا يُسَـارِعُونَ فِـي الْخَيْـرَاتِ وَيَـدْعُونَنَا رَغَبًـا وَرَهَبًـا وَكَـانُوا لَنَـا خَاشِـعِينَ {الأنبياء/٩٠}

واتە : حەزرەتی زەکەریاو خێزانەکەی لە خێرو چاکەکردندا پێشبڕکێ و پەلە یان دەکرد ، زۆر گورج و گۆل بوون ، هـاواری ئێمـەیان دەکـرد و لەبـەر ئێمـە دەپاڕانـەوە بـە هـەوبای ئەوەی کە بیان بەینە بەهەشت و لە ئاوری دۆزەخ بیان پارێزین ، بۆ ئێمە زۆر گوێڕایـەل و مل کەچ بوون

وَالَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ سَنُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِـدِينَ فِيهَـا أَبَدًا وَعْدَ اللّهِ حَقًّا وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللّهِ قِيلاً {النساء/١٢٢}.

واتە : بێگومان ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کارو کـردەوەی چـاکیان کـردووە ، لەمـەو دوا لە دوارۆژدا دەیان بەیەنە ناو باخاتێك کە چەندان جۆ و روباری بەژێردا دەڕوا ، لەبری ئەوە بەهەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە ، ئەوە بە لێنی خوای گەورەیە ، بەلێی خوای گەورە ش راست و ڕاوەوایە و دێتە جێ ، قسەی کێ لە هی خوای گەورە راسترە ، هی کەس

وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُوْلَئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَـالُهُمْ فِـي الـدُّنْيَا وَالآخِـرَةِ وَأُوْلَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدونَ {البقرة/٢١٧}

واتە : هەرکەسێك لە ئێوە لە ئاینیەکەی خۆی هەلگەڕێتەوە کە ئاینی پیرۆزی ئیسـلامە، وە بە کافریش بمرێت ، ئەوانە لە دونیاو دوارۆژدا کاروکردەوەیان مایە پـوچ و ناقبولـە و، ئەوانە دەچنە نێو ئاوری دۆزەخ و بە هەمیشە یی تیایدا دەمێننەوە

بەشێوەیەکی گشـتی گـەواهی خواناسـی و ئیمانـداریتی بـۆ کەسـێ دەدەن کـە بەروالّـەت لەسەر ئیسلام مردوە ، ئەو کەسە ئەهلی بەهەشتە إن شاء الله

وە پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێ : ( من مات وهو يعلم أنه لا اله إلا الله ، دخل الجنة) مسلم

واتە : ئەگەر کەسێك مردو دەشی زانی کە ( لاإلـە إلا الله ) چیە و، بـڕوای پـێ هـەبێ و کاری پێ بکا، چۆتە بەهەشتەوە [114]

---

[114] بەڵێ بێگومان گوتەی (لاإله إلا ألله) بەرنامەی ژیان و کلیلی بەهشتە ، وە پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێ :

( لا إله إلا الله مفتاح الجنة) . واتە :

لاإله إلا الله کلیلی بەهەشتە

بۆیە قورئان و سوننە زۆر گرنگیان پێداوە ، بەڵام ئەوەش چەند مەرجێکی هەیە تا دەتوانی بە (لاإله إلا الله) سەرفرازی دونیا دوارۆژ بی ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ بە قوریشیەکانی دەگووت :

( قولوا لا إلة إلا الله ، تفلحوا) ( المستدرك على الصحيحين، ج١، ص٦١، رقم ٢٩.

واتە : ئەگەر بڵێن (لا إله إلا الله) سەرفراز دەبن ، ئەوەیان نە دەگووت ، چونکە سەید قوتب دەڵێ : لەبەر ئەوەی موشریکەکان عەرەبزمان بوون ، دەیانزانی کە مانای لا إله إلا الله رەتی هەموو خوا و پەرستراوێکی ئەوان دەکاتەوە لە بەرانبەردا بوونی خوای کرد گاری بوونەوەر دەسـەلمێنێ ، بۆیـە ئـەو ووتە بەنرخ و پڕ بەها و سەنگینە بەلای کەم دەبێ ئەو مەرجانەی لێ بێنە دی ئەوسا پیـاو بەنرخـە و پێی سەر فراز و دەبێ دەچێتە بەهەشتەوە

١. بەماناکەی ئاگادار بێت ، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ : ( فـاعلم أنـه لا إلـه إلا الله) واتـە بزانە کە خوای گەورە تاك و تەنیایە و هیچ هاوبەشێکی لەهیچ شتێکدا نیە ، دیارە ئـەوەش هـەموو

پەرستراوێکی سەرگۆی زەوی رەت دەکاتەوە ، بەڵکو بێگومان دەبێ تەنها بروات بە خوای تاکو تەنیا هەبێت ، ئەوسا ئەو فەرموودەیە

(من قال لا إله إلا الله دخل الجنة) صحيح إبن حبان ج١، ص٣٦٤، دێتەدی

واتە: ئەوەی گووتی : لا إله إلا الله و دانی پێدانا چۆتە بەهەشتەوە

٢. دڵنیایی (یقین) واتە دەبێ بەدل لەو ووتەیە دڵنیا بێ و بڕوای تەواوی پێـی هـەبێت ، بـەبێ هـیچ گومانو دو دڵیەك، خوای گەورە دەفەرموێ :

إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ ورسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا وَجَاهَدُوا بِـأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِـهِمْ فِـي سَـبِيلِ اللَّـهِ أُوْلَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ {الحجرات/١٥}

واتە: بەراستی بڕوا دارانی تەواو راستەقینە ئەوانەن کە بڕوایان بەخوای گـەورەو بـە پێغەمبەرەکـەی ﷺ هێناوە ، وەهیچ شك و گومانێك یان لە دڵ و دەروونداپەیدا نابێت ، وەپێغەمبەریش دەفەرموێ:

( أشهد أن لا اله إلا الله ، وإني رسول الله لايلقى الله بهما عبد غـير شـاك ، فيحجب عنـه الجنّـة ) مسلم

واتە: هەر کەسێك بەگومانەوە ئەوە بڵێ و بڕوای پێی هەبێ ، خوای گـەورە بەهەشـتی لێ پـەنادەدا و ناچێتە نێویەوە.

٣. دڵسۆزی و نیاز پاکی : لەبەر ئەوەی مەرجی گیرابوونی خوا پەرسـتی دڵسـۆزیە ، ئەوەیـە بـەنیاز پاکی تەنها بۆ خوای بێ وێنە بکرێت بە بێ هیچ گومان و شەریکێك، وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاء وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ وَذَلِكَ دِيـنُ الْقَيِّمَـةِ {البينة/٥}

واتە: من فەرمانم بە ئێوە کردوە کە بە دڵسۆزی و نیاز پاکی خوای گەورە بپەرستن وبەندایەتی بکەن.

وە پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێ : ( اسعد النّاس بشفاعتي يوم القِيامـةَ مـن قـال لا الـه الا الـه خالصاً من قلبه أو نفسه) بخاری: ١/ ١٩٣

واتە: بەختیارترین کەس بە شەفاعەتی من لە ڕۆژی دوایی دا ئـەو کەسـەیە کـە لا الـه الا الله لـە دڵەوە بە پاکی دەڵێت .

٤. بەراست دانانی لا إله الا الله : چونکە خوای گەورە مەردوم تاقی دەکاتەوە ئاخۆ بەراستی ئیمانی هێناوە یا درۆ دەکەن وەك دەفەرموێ :

أَحَسِبَ النَّاسُ أَن يُتْرَكُوا أَن يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ {٢} وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ صَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ {العنكبوت/٣}

واتـە : ئایـە ئـەو خەڵکـە وا دەزانـێ کـە ئیمانیـان هێنـاوە و ، هـەروا لێیـان دەگـەڕێن و تاقییـان ناکەینەوە، بەڵێ بێگومان گەلانی بەر لەوانمان بەچەندەها جۆر و شێوە تاقی کردۆتەوە ، تا لە ئەرزی واقیع دا بۆ خوای گەورە دەرکەوێ کێ لەوانە راست دەکاو کێش درۆ دەکات ، وە پێغەمبەری خـوای گەورە ﷺ دەفەرموێ :

( ما من أحد يشهد ان لا اله الا الله وأن محمداً عبده ورسوله صدقاً مـن قلبـه إلا حرمـه الله علـى النّار)

واتە هەر یەکێ لە ئێوە بەراستی لەدڵ و دەروونی خۆیدا گەواهی بدا کە هیچ خوایەك نی یە تەنها ئەو نەبێ ، وەمحمدیش ﷺ پەیامبەر و بەندەی خوای تاکو تەنیایە ، بێ گومان خوای گەورە لە ئاگری دۆزەخی دەپارێزێ

٥. خۆ بەدستەوە دانی لا إله إلا الله : وەك خوا گەورە دەفەرموێ :

وَإِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَحْدَهُ اشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ وَإِذَا ذُكِرَ الَّذِينَ مِن دُونِهِ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ {الزمر/٤٥}.

واتە: کاتێك ناوی خوای تاكوتەنیا لـەلای بێبـاوەڕو دووڕوەکـان دێـت ، ئەوکەسـانەی کـە بێبـاوەڕنو بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نیە ،دلیان تێك دەچێت ، وەلێ کاتێ ناوی غـەیری خـوای گـەورەیان لـەلا دێ دلیان خۆش دەبێ

چونکە مەرجی وەرگرتنی ئیسلام خۆ بەدەستەوە دان نیەتی بەبێ مەرج

وەپێغەمبەری خوای گەورە ش (ﷺ) دەفەموێ :

من مات لا يشرك باالله شيئا ، دخل الجنة   مسلم

---

٦. تەکفیر کردنی تاغوتانە : وەك خوای گەورە بەمەرجی دانەوە بۆ هەبوونی ئیمان وەك دەفەرموێ :

لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىَ لاَ انفِصَامَ لَهَا وَاللّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ {البقرة/٢٥٦}

واتە : ئەی خەلکینە تۆبزی و زۆرە ملێی لە دیندانیە بۆ هاتنە ناو ئیسلام و بۆ موسلمان کردنی خەلکی ، خوای گەورە ڕێگای راست وپاکی کە ئیسلامە لە ڕێگای ناراست و خراپە جیا کردۆتەوە کە کوفرو بێدینیە ، جا هەرکەسێك بەرانبەر بەو ڕێبازو تاغوت و ملهورانەی کەلە غەیری خوای گەورە دەپەرسترێن و بە دین دادەنرێن بێباوەر بێ ، وە بروای تەواوی بە خوای گەورە هەبێ ، ئەوکەسە لەسەر ڕێ ی راستەو دەستی بە پەت و بەرنامەی خوای گەورە وە گرتووە ، جیابوونەوەو پسانی بۆ نیە ، خوای گەورە زۆر بیسەرو زانایە

وە پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێ: (من قال لا إله الا الله، وكفر بما يعبد من دون الله ، حرم الله ماله ودمه) مسلم

واتە: هەر کەسێ بلێ لا الـه الا الله و، بەرانبـەر بـەوە بێبـاوەڕ بـێ کـە لـە غـەیری خـوای گـەورە دەپەرسترێ ، ئەوکەسە سەر و ماڵ و خوێنی حەرام دەبێت لە موسلمانان کە بکوژرێت

٧. بونی خۆشەویستی بۆ لا اله الا الله: وەك خوای گەورە دەفەرموێ:

وَمِـنَ النَّـاسِ مَـن يَتَّخِـذُ مِـن دُونِ اللّـهِ أَنـدَاداً يُحِبُّـونَهُمْ كَحُبِّ اللّـهِ وَالَّـذِينَ آمَنُـواْ أَشَـدُّ حُبًّـا لِّلّـه {البقرة/١٦٥}

واتە : هەندێك لە خەلك هەندێ شت جگە لە خوای گەورە دەپەرشتن و شەریك بۆ خوای گەورە پەیدا دەکەن ، ئەوشتانەیان وەکو خوا خۆش دەوێن ، وەئەوکەسـانەی کـە بـڕوادارن خـوای گـەورەەیان زۆر خۆش دەوێت

وە چەندان لەلایەن و مەرجی  تر هەن بۆ لا اله الله  تا پیاو پێی دەچێتە بەهەشتەوە. وەرگێر.

واتە: هەر کەسێك لە ئوممەتی من مرد ، قەت هاوبەشی بۆ خوای گەورە بڕیار نەدا، ئـەوا چۆتە بەهەشتەوە.

وە گەواهی ئەوەش دەدەن کە بێ باوەڕان و هاوبەش پەیـدا کـەرانو دوو ڕووەکـان ئـەهلی دۆزەخن ، وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

وَالَّذِينَ كَفَرواْ وَكَذَّبُواْ بِآيَاتِنَا أُولَـئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ {البقرة/٣٩}.

واتە : وە ئەوانەی کە بێ باوەڕبوون وئایەتەکەی ئێمەیان بەدرۆ زانی ، ئەوانە ئـەهلی نـاو ئاگرن ، وە بەهەمیشەیی تێدا دەمێننەوە

وە خوای گەورەش دەفەموێ :

إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَالْمُشْرِكِينَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا أُوْلَئِكَ هُمْ شَرُّ الْبَرِيَّةِ {البينة/٦}

واتە : بێگومان ئەوانەی کە لە خاوەن پەیام و پەرتووکەکان و لە هاوبەشی پەیداکـەرەکان بێباوەڕ بوون لەبر ئەوە لە رۆژی دواییدا لە نێو ئاوری دۆزەخدان و ، تیایدا دەمێننـەوە ، ئەوانە تاوانبارترین و خراپترین خەلکی سەر گۆی زەوین

وە خوای گەورەش دەفەموێ :

إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا {النساء/١٤٥}

واتە: لە ڕۆژی دوایی دووڕووەکان لە ناو دۆزەخ لە هـەرە ژێـرەوەن بـۆ عەزابـدانیان ، وە هیچ پاڵپشتێکیان نیە تا ڕزگارو هاوکاریان بکا و سەریان بخاتن

وە خوای گەورەش دەفەموێ :

{ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَتَّخِذُواْ آبَاءكُمْ وَإِخْوَانَكُمْ أَوْلِيَاء إَنِ اسْتَحَبُّواْ الْكُفْرَ عَلَى الإِيمَانِ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ } {التوبة/٢٣}

واتە : ئەی ئەوکەسانەی ئیمانتان هێناوە ، باوكو باراکانتان مەکەنە دۆستو پشـتیوانی خۆتان ئەگەر کوفریان بەسەر ئیماندا هەلبژارد، کوفریان لـە ئیمـان زیـاترخۆش ویسـت ، هەرکەسێك لە ئێوە ئەوکەسانە بکاتە دۆستو پشتیوانی خۆی ئەوکەسانە ستەمکارن

وە خوای گەورەش دەفەموێ :

إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاء وَمَن يُشْرِكْ بِاللّهِ فَقَدِ افْتَرَى إِثْمًا عَظِيمًا {النساء/٤٨}

واتە خوای گەورە لەکەسێك خۆش نابێ کە هاوبەشی بۆ بڕیار داوە ، بەلام لـە غـەیری ئەوانە خـۆش دەبـێ لـە کەسێك کـە بیـەوێ ، هەرکەسێك هاوبەشـی بـۆ خـوای گـەورە پەیدابکا بەراستی تاوان و بوهتان و هە لبەستنێکی گەورەی کردووە.

إِنَّ الَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِاللّهِ وَرُسُلِهِ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُواْ بَيْنَ اللّهِ وَرُسُلِهِ وَيقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُواْ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلاً {١٥٠} أُوْلَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ حَقًّا وَأَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا {النساء/١٥١}.

واتە : ئەوانەی بەرانبەر بە خوای گەورە و پێغەمبەرەکانی ، سەلامی خوایان لەسـەر بـێ بێ باوەرن و، جیاوازی و ناکۆکی دەخەنە نێوان خوا و پێغەمبـەرەکانی ، بـە جـۆرێ کـە دەلێن : بڕوامان بە هەندێکیانە و بڕوامـان بـە هەنـدێکیان نیـە ، دەیانـەوێ لـە نێـوان ئەوەدا بۆ خۆیان ڕێگەیەك بگرنەبەر و پەیرەوی لێ بکەن ، ئەوانە بێبـاوەری ڕاسـتەقینەو

هەهیقین ، لەبری ئەودا ئێمـەش سـزایەکی زۆر سـەخت و دژوارو سـەر شـۆڕکەر مـان بـۆ بێباوەران ئامادەکردووە

وە خوای گەورە دەفەموێ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ {آل عمران/٨٥}

واتە : هەرکەسێك جگە لە ئاینی پـیرۆزی ئیسـلام داوای ئـاینێکی تریکـات و پێـی رازی بێت ، خوای گەورە لێی قبول ناکات و بەبەندەی خۆی نازانێ ، وەلەدوارۆژیشـدا لـەزەرەر مەندان و لە ڕەنج بەخەسارانە

وەپێغەمبەری خوای گەورە ش (ﷺ) دەفەموێ :

من مات يشرك باالله شيئا ، دخل النار مسلم

واتە: هەر کەسێك لە ئۆممەتی من مردو ، هاوبەشی بـۆ خـوای گـەورە بڕیـاردابوو ، ئـەوا چۆتە دۆزەخەوە

ئەهلی سوننە و جەماعە : شاهێدی بۆ هـەردە مـوژدە پێـدراوەکان دەدەن بـە بەهشـت ، هــەروەك پێغەمبــەر (ﷺ) شــاهێدی بــۆ هــەر دە لەهاوەلــەکانی دە بەبەهەشــت ، وەك دەفەرموێ :

( ئەبو بەکر لە بەهشتە ، وە عومـەر لـە بەهشـتە و عوسمـان لەبەهەشـتە ، وە علی لـە بەهەشتە ، وەتەلحە لەبەهشتە، وە زوبێر لەبەهشتە، وە سەعیدی کوری زەید لەبەهشـتە، وە ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاح لەبەهشتدایە) . سنن أبي داود / ألباني

وە بــۆ زۆر لەســەحابەکانی تــری پێغەمبــەر (ﷺ) گــەواهی دراوە بەبەهەشــت وەك لەفەرموودەی ڕاستودروستدا هاتوە ، بۆ وێنە وەك ئەمانەیش (عکاشـە کـوڕی محصـن ،

عبدالله کوڕی سەلام ، ئالی یاسیر ، بلال کوری رەباح ، جعفری کوری ئەبی تالب ، عمـر ، زەیدی کوری حاریسە ، عەبدوالله کـوری رەواحـە ، فاتیمـەی کچـی پێغەمبـەر (ﷺ) ، خەدیجەی کچی خویلد، عائیشە ، صفیە ، حفصە ، هەموو خێزانـەکانی تـری پێغەمبـەر (ﷺ) ، وەجگە لەو هەوالآنەش رەزای خوایان لەسەر بێت

وەهەر کەسێکیش کە دەقی لەسەر هاتوە لەبارەی ئـەوەی کەئـەهلی دۆزەخـە ، ئێمـەیش ئەو شاهێدیەیان بۆ دەدەین ، وەك لەوانە : (ئەبو لهـب عبـدالعزیزی کـوری عبـدالمتلب ، ژنەکەی دایکی جمیل و اروی کچی حربی [115] ، وە جگە لەوانەش کە دەقیان لـە بارەیـەوە هاتوە

**ئـەهلی سـوننەو جەماعـە:** بەشـێوەیەکی یـەکلا کـەرەوە و بـڕەو گـەواهی بەهەشـت و جەهەننەمی بۆ هیچ کەسێکی دیاریکراو نادەن ، با هەرکێ یەك بێ ، مەگەر پێغەمبـەر (ﷺ) بەشێوەیەکی بـڕەو گـەواهی بـۆ لەسـەر دابـێ ، بـەڵکو تکاکـارن کـە پیـاوی چـاك

---

[115] وەك خوای گەورە سەبارەت بە ئەبی لەهەب دەفەرموێ :

تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ {١} مَا أَغْنَى عَنْهُ مَالُهُ وَمَا كَسَبَ { ٢} سَيَصْلَى نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ {٣} وَامْرَأَتُهُ حَمَّالَةَ الْحَطَبِ { ٤} فِي جِيدِهَا حَبْلٌ من مَّسَدٍ {المسد/٥}

واتە بەشکان هەردوو دەستی ئەبو لەهەب بشکێن لەبەر خراپی خۆی ، ئەوەی کە کۆی کـردەوە و بەدەستی هێنا هیچ دەولەمەندی نەکرد ، لەرۆژی دوایی بەخۆ و بە ئافرەتەکەی دەچـێتە نێـو ئـاوری دۆزەخ ، لەبەر ئەوەی ئافرەتەکەی کۆڵە زی و درك و داڵـی دەکێشـان و لەسـەر رێگـەی پێغەمبـەری دادەنان تا ئازاری پێ بخوات ، بۆیە لە رۆژی دوایی پەتێکی ئاگرینی لە ئەستۆدەکرێت وەرگێر

بەهشتی بێ ، وەمەترسـی دارن کـە پیـاوی خـراپ (مسـيء ) یـش جەهەننـەمی بێـت ، بیروبڕوایان وایە کە بەهەشت بۆ هیچ کەس واجب نـاکرێ ، بـا کردەوەکانیشـی بـاش بـن ، تەنها کەسێك کـە خـوای گـەورە بەفـەزلی خـۆی دەیبەخشـێ و دەیخاتـە نـاو بەهەشـتەوە بەبەڵگەی ئەوەی کە خوای گەورە دەفەرمووێ :

وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ مَا زَكَا منكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا وَلَكِنَّ اللَّـهَ يُزَكِّـي مـن يَشَـاء وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ {النور/٢١}

واتە : ئەگەر فەزل و بەخشش ورەحمەتی خوای گـەورەو میهرەبـان نەبایـە لەسـەر تـان ، هەرگیز کەس لە ئێوە لـە گونـاهو تاوانـەکان پـاك نەدەبوونـەوە و هیدایـەت نـەدەدران ، خوای گەورە ئەوکەسە پاك دەکاتەو هیدایەتی دەدات کە شایسـتەیە و خـۆی دەیـەوێت ، خوای گەورە زۆر بیسەر و زانایە بە هەموو شتێکی بوونەوەر.

وە پێغەمبەریش ( ﷺ ) دەفەرمووێ : ( ما من أحد يدخله عمله الجنة )

واتە : هیچ کەسێك بە کاروکردەوەکانی خۆی ناچـێتە نـاو بەهەشـت (تـەنها کردەوەکـانی خۆی نایبەنە بەهەشت ) یەکێك گووتی تۆش ئەی پێغەمبەری خودا ؟ فـەرمووی : بـەڵێ ( ولا أنا) منيش ( إلا أن يتغمدني ربي برحمته )

واتە : تەنها ئەگەر پەروەردگارەکەم بە فەزل و رەحمـەتی خـۆی بم بەخشـێ و بم خاتـە نـاو بەهەشتەوە ، ئیمامی موسلم گێراویەتیەوە

**ئەهلی سوننەو جەماعە:** سزادان ( عذاب ) بۆ هیچ کەسێك واجب ناکـەن کـە هەڕەشـە لێ کردن روی تێ دەکا ، چونکە زۆر جار خوای گەورە لـە بەنـدەکانی خـۆی خـۆش دەبـێ بەهۆی ئەو کارو کـردەوە چـاکانەی کـە کردووینـی ، یـا بـەهۆی پەشـیمان بوونـەوەی لـە گوناهـەکان ، یـا بـەهۆی ئـەو دەرد و پـەتا و پەتـەر و بەسـەر هـات (مصـائب) انـەی کە خوای گەورە گوناهەکانی پێ داپۆشێ

وەك خوای گەورە دەفەرموێ:

قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوب جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيم {الزمر/٥٣}

واتە : ئەی ئەو بەندانەی مـن کەزێـدە رۆی تـان لـە گوناهوتـاوانکردن لـە خـۆدا کـردەوە وتێتان پەڕاندوە ، لەزەیی و بەخششی خوای گەورە بێ هیواوئومێد مەبن ، چونکە خوای گەورە بەزەیی و لێخۆشبەرەو ،، ئەگەر بیەوێ لەهەموو گوناهەکان تان خۆش دەبێت .

وە دەفەرموێ :

وَلِلّه مَا فِي السَّمَاوَات وَمَا فِي الأَرْضِ يَغْفِرُ لِمَن يَشَاء وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاء وَاللّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ {آل عمران/١٢٩}

واتە : ئەوەی لەئەرزو ئاسمان بێت هی خوای گەورەیە ، ئەوەی بیـەوێ خـوای گـەورە لێـی خـۆش دەبـێ، ئـەوەی بشـیـەوێ بـەئاگری دۆزەخ سـزاوئازاری دەدات ، خـوای گـەورە زۆر لێخۆشبەرو بەزەیی یە

وە دەفەرموێ : وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا ثُمَّ اهْتَدَى {طه/٨٢}

واتە : من زۆر لێخۆشبەرم لەو کەسەی کە لە گوناهو تاوانەکانی پەشـیمان دەبێتـەوەو ، بڕوای تەواوی بە خوای گەورە و میهرەبانـە و ، کـارو کـردەوەی چـاکی کـردووە ، پاشـان لەسەر هیدایە ت و ڕێبازی ئیسلام تامردن هەر بەردەوام دەبێت

وەپێغەمبەری خوای گەورە ش (ﷺ) دەفەموێ :

بینما رجل يمشي بطريق ، وجد غصن شوك على الطريق فأخره، فشكر الله له ، فغفر له . البخاري .

واتە : جارێك پیاوێك بەرێگایەکدا دەڕوات ، لەسەر ڕێگاکـە لقـە دڕکێـك دەدۆزێتـەوە و لەسەر ڕێگاکە لای دەدات ، خوای گـەورەو میهرەبـان لەبـەر ئـەوە سـتایش دەکـات ، وە لێی بورێ

ئەهلی سوننە و جەماعە بیروباوەڕیان وایە کە هەموو دروستکراوێك لەبوونەوەردا کاتێکی دیاریکراو (أجل) ی هەیە بۆ نەمان و لەنێو چوونی ، وە دڵنیا بە هیچ خود (نفس) ێکیش نامرێ ئەگەر بە روخسەت و مۆڵەتی ئەو نەبێ ، و خوای گەورەدەفەموێ:

وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَنْ تَمُوتَ إِلاَّ بِإِذْنِ الله كِتَابًا مُؤَجَّلاً {آل عمران/١٤٥}

واتە : هیچ کەسێك بۆی نیە بەبێ ئەمری خوای گەورە بمرێ ، مە ئەگەر بە روخسەت و ئاگاداری خوای گەورە نەبێ ، مردنەکەشی لە کاتێکی دیاریکراودا نوسراوو بڕیار لەسەر دراوە وە کاتێ ئەو کاتەش (أجل) یان هات ، کات (ساعة) تێك پێش و پاش ناکەوێ[١١٦] ، جا ئەگەر ئەو کەسە مرد یا کوژرا یان بەهەرشتێکی تر لەناو چوو ، ئەوە ئەجەلەکەیەتی

---

[١١٦] وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

**ئەهلی سوننەو جەماعە:** بڕوایان وایە : کە خوای گەورە بەڵێنی بەبەهشت بە بڕواداره خوا ناس و لە خوا ترسەکان داوه ، وەك لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێ :

**وَالَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ سَنُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا وَعْدَ اللّهِ حَقًّا وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللّهِ قِيلاً {النساء/١٢٢}.**

واتە : بێگومان ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کارو کردەوەی چاکیان کردووە ، لەمەو دوا لە دوارۆژدا دەیان بەیەنە ناو باخاتێك کە چەندان جۆ و روباری بەژێردا دەڕوا ، لەبری ئەوە بەهەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە ، ئەوە بە لێنی خوای گەورەیە ، بەڵێی خوای گەورە ش راست و ڕاوەوایە و دێتە جێ ، قسەی کێ لە هی خوای گەورە راسترە ، هی کەس وەبروایان وایە کە هەڕەشەی لە بەندەکانی کردوە کە بە ئاگری دۆزەخ سزای ئەو یەکتاپەرستانەی دەدا کە یاخی بوونە و تاوانیان کردوە ، وەسزای دوڕوو و بێ باوەڕەکان دەدا و شتێکی هەقە و بەڵێنی داوە و لە بەڵێنەکەشی پاشە کشەو موخالەفە نەکا ، بەڵام بەفەزل و کەڕەمی خۆی لەیەکتاپەرستە تاوانبارەکانی دەبورێ ، چونکە خوای گەورە بەڵێنی لێبوردن و لێخۆشبوونی پێ داون ، وەجگە لە وانیشی ڕەت ( نفي ) کردۆتەوە ، وەك دەفەرموێ :

---

وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ فَإِذَا جَاء أَجَلُهُمْ لاَ يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلاَ يَسْتَقْدِمُونَ {الأعراف/٣٤}

واتە : هەموو ئۆممەتێك بۆ نەمانو لەنێوچوونیان ماوەی دیاری کراوی خۆی هەیە ، هەرکاتێ کە ئەو ماوەیە (أجل) هات ، نەپێش دەکەوێ ونەپاش دەکەوێ

وەدەفەرموێ :وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَنْ تَمُوتَ إِلاَّ بِإِذْنِ الله كِتَابًا مُّؤَجَّلاً {آل عمران/١٤٥}.

واتە : هیچ کەسێك بەبێ روخسەت و ئاگاداری خوای گەورە بۆی نیە بمرێ و نامرێ ، ئەگەر بشیەوێ بمرێت ، ماوەی مردنیشی لەلایەن خوای گەورە دیارکراوە . وەرگێڕ

إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاء وَمَن يُشْرِكْ بِاللّهِ فَقَدِ افْتَرَى إِثْمًا عَظِيمًا {النساء/٤٨}

واتە   خوای گەورە لەکەسێك خۆش نابێ کە هاوبەشی بۆ بڕیار داوە ، بەلام لـە غـەیری ئەوانە خـۆش دەبـێ لـە کەسێك کـە بیـەوێ ، هەرکەسـێك هاوبەشـی بـۆ خـوای گـەورە پەیدابکا بەراستی تاوان و بوهتان و هە لبەستنێکی گەورەی کردووە.

# لە بیروباوەڕی ئەهلی سوننەوجەماعەدا

دۆستایەتی و دوژمنایەتی کردن لە بیرو باوەری ئەهلی سوننەو جەماعە لەبنچینەکانی سەلەفی سالّح (ئەهلی سوننەو جەماعە):

خۆشویستن بۆ خواو بێزاندن و ڕق لێبوونەوە بۆ خوایە،وەك پێغەمبەر ( ﷺ) دەفەرموێ :

( الحب في الله ، البغض في الله )

واتە : خۆشویستن و دۆستایەتی کردن و پالّپشتی کردنی بڕواداران و ڕق لیّ بوونەوە و بێزاندن و روو لیّ وەرگێڕانی بیّ باوەڕان و هاوبەش پەیدا کەران (برائة) لیّ کردنیانە[117]

وە خوای گەورەش سەبارەت بە دۆست و پشتیوانی یەکتری نێوان ئیانداران دەفەرمووێ :

وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللّهَ ورَسُولَهُ أُوْلَئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللّهُ إِنَّ اللّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ {التوبة/٧١}

[117] وە پێغەمبەر (ﷺ) لەفەرموودەیەکی تریدا دەفەرموێ :

( أفضل الأعمال الحب في الله والبغض في الله) . سنن أبي داود ج/٤ ، ص ١٩٨ ، رقم / ٤٥٩٩

واتە: بەخێرترین کاروکردەوە لەلایەن خوای گەورە ئەوەیە کە خۆشویستنو ڕق لێبوونەوە تەنها لە پێناو خوای گەورە بێت ، بۆیە دەبێ ئینسان ئیماندارانی خۆش بویّ بالەهەر کویّ یەك بن ، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) سەبارەت بەوان دەفەرمویّ: ( المؤمنون شهداء الله في الأرض) بخاری

واتە : موسلّمانان نمونە و بەلّگە و گەواهیدەر و چاودێر و بەندەی خوای گەورەن لەزەویدا

وە پێغەمبەر (ﷺ) بە ئەبی هورەیرەی فەرموو : (المؤمن لا ینجس) بخاری

واتە بڕوادار پیس نابێت وەرگێر.

واتە : ئیمانداران هەندێکیان پشـتیوانی هەنـدێکیانن ، فرمـان بەچـاکە دەکـەن‌و ڕێ لـە خراپەدەگرن ، نوێژ ئەنجام دەدەن و زەکات دەدەن ، بـەگوێ ی خـوای گـەورە و پێغەمبـەر ﷺ دەکەن ، ئەوانە خـوای گـەورە ڕەحمیـان پـێ دەکـات ، بەراسـتی خـوای گـەورە زاڵ و بەدەسەلات‌و زاناو دانایە

وە خوای گەورە سەبارەت بە وەی کە ئیانداران کافرەکـان بـە دۆسـت و پشـتیوانی خۆیـان ناگرن دەفەرمووێ :

لاَ يَتَّخِذِ الْمُؤْمِنُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاء مِن دُوْنِ الْمُؤْمِنِينَ وَمَن يَفْعَلْ ذَلك فَلَيْس مِنَ اللّه فـي شَيْءٍ {آل عمران/٢٨}

واتـە : ئـەی ئەوکەسـانەی ئیمانتـان هێنـاوە ، جگـە لـە ئیمانـداران بێبـاوەڕان مەکەنـە دۆست‌و پشتیوانی گیانی بەگیانی خۆتان ،هەرکەسێك ئەوە بکات لەلایەن خـوای گـەورە لەسەر هیچ شتێك نیەو ، بەرگری و پشتیوانی لێ ناکرێت

وە بڕوایان وایە کـە بـیرو بـاوەڕ و دۆسـتایەتی و دوژمنایـەتی (مـوالاة[١١٨] و معـاداة[١١٩] ) کردن لـە بنچـینە وبنـەما هـەرە سـەرەکی‌وگرنگەکانی بـیر و بـاوەڕی ئیسـلامی یـە و ،

[١١٨] موالاة : لەرووی زمانەوە واتە : خۆشویستن‌و خۆشەویستی ، خۆشەویستی هەر شتێك کە پشـتی پێ دەبەستی و پالپشتی دەکەی ، واتا خۆشویستن و سەر خستن و پەیرەوی لێ کردنی و ، هەستکردن بە نزیکایەتی و بەگوێکردن و سەربۆ شۆڕکردنی ویلایەت دژی عەداوەتە

[١١٩] معـاداة: سەرچـاوەی دوژمنـداری و دوژمنایـەتی کردنـە ، واتـە: دژایـەتی و ناحەزایـەتی و دورخبستنەوە، واتـا : بـەدڵ هەسـتکردن بـەزیان پـێ گەیانـدن وگیـانی تۆڵەسـەندنەوە ، دوژمـن دژو پێچەوانەی دۆستە ، بەکورتی واتا : دووری و دژایەتی کـردن و نـاکۆکی و دوبـەرەکی ، کـە بزیتییـە لەدژی دۆستایەتی کردن

لەشەرعی خودا پلەو پایە (مكانة) یەکی زۆر گەورە و گرنگی هەیە کەلـەم  رووانـە روون دەبێتەوە

**یەکەم :** ئەو بیرو باوەرە ( **موالاة و المعاداة** ) بەشێکە لە شـاهادەی (لا إلـه إلا الله) ) ، چونکە واتا : پاکانەکردن و خۆ بەری کردن لەهەموو شـتێك کەلـە غـەیری خـوای گـەورە دەپەرسترێ ، وەك خوای گەورە سەبارەت بە دەفەرمووێ :

وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ وَاجْتَنِبُواْ الطَّاغُوتَ {النحل/٣٦}

واتە : بێگومان  ئێمە لە هەر گەل و نەتەوەیەك چەند پێغەمبەر ێکمان رەوانە کـردوون ، بۆ ئەوەی ئاگاداریان بکەنە وە کە تەنها خوای گەروە بپەرستن و ، هەمیشە لە تـاغوت و پەرستراوەکانی تر دور بکەونەوە و خۆیان بپارێن

**دووەم :** ئەو جۆرە بیرو باوەرە توندترین پەتی ئیمانە ، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ :

---

مـوالات و معـادات  لـەرووی شـەرعەوە ، سەرچـاوەو بنچـینەوکرۆکی مـەوالات خۆشەویسـتی و خۆشویسـتن (حـب) ە ، سەرچـاوەو بنچـینەوکرۆکی مـەعاداتیش رقوکـینو بێزانـدن ( بغـض) ە ، وەکاروکردەوەی دڵودەرونو ئەندامەکانیش لەو دوانە وەردەگرنو پەیدادەبن ، بـۆ نمونـە ( سەرخسـتنو کۆچکردن) هەقیقەتی موالاتو موعاداتن .

کەواتە : موالات بریتی یە لە لێ نزیك بوونەوەی شتێكو سەر بۆ دانەواندنو مل بـۆ کەچـکردنی لـە رێگەی کرداروگوفتارو نیەتەوە ، موعاداتیش پێچەوانەو دژی ئەوەیە ، ئیتر دەزانین کـە جیاوازیـەکی ئەوتۆ نیە لە نێوان مانای زمانەوانی و واتای شەرعی ، چونکە خوای گەورە لەسەر بروادارانی واجب کردوە کەبە هەموو شێویەك پاڵپشـت و خۆشەویسـتی ئیمانـداران بکـەن و ، وە بەهـەموو شـێوەیەك لەکاتی خۆی دژایەتی و دوژمنایەتی بێ باوەران بکەن ، ، چونکە بیرو باوەری ئیمانداران تەواو نـەبێ ئەگەر پاکانەو بە رائەت لە موشریکەکان نەکەن

(أوثق عرى الإيمان : الموالاة في الله و المعادة في الله ، والحب في الله ، البغض في الله)

بنواڕە ( سلسلة الاحاديث ) ی البانی /٩٩٨

واتـە : تونـدترین و پتـەو تـرین پـەت و گورسـی ئیمـان ئەوەیکـە دۆسـتایەتی کـردن و دوژمنایەتی کردن لە پێناو خوا بێ ، وە خۆشویستن و ڕق لێبوونـەوە تـەنها بـۆ خوابـێ ، واتا لەبەر چی تر نەبێت

**سێیەم :** ئەوە دەبێتە هۆکـار بـۆ ئـەوەی دڵ و دەروون تـام و شـیرینایەتی ئیمـان و تـام و چەژەی دڵنیایی ( لذة اليقين ) بچەژێ ، وەك پێغەمبەری ئیسلام ( ﷺ) دەفەرموێ :

( ثلاث من كن فيه وجد حلاوة الإيمان : من كان الله و الرسول أحب إليه ، مما سـواهما ، وكان أحب عبداً لايحبه إلا الله ، ومن يكره أن يعود في الكفر ، بعـد إذ أنقـذه الله ، كمـا يكره أن يلقى في النار ) متفق عليه

واتـە : سـێ کـەس هـەن کـە تـام و شـیرنێتی ئیمانیـان تیادایـە : یـەکێك کـە خـواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) لە هەموو شتێك خۆش تر بوێ ، وەیەکێکیشـیان ئەوەیـە کـە پێـی ناخۆشە خوای گەوەرە بیگێڕێتەوە سەر کوفر دوای ئەوەی کـە رزگـاری کـردوە ، هـەروەك پێی ناخۆشە کە بیهاوێتە نێو ئاوری دۆزەخ

**چوارەمین :** بەهۆی هاتنە دی ئەو جۆرە بیروباوەرە **(موالاة و معـاداة)** یـە ئیمـان تـەواو دەبێ ، هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ

من أحب لله و أبغض لله وأعطى لله ومنع لله فقد إستكمل الايمان سنن أبى دواد البانى

واتە کەسێك کەسێکی بۆخوا خۆش بوێ وە بۆخوا رقی لە کەسـێك ببێتـەوە ، یـا بـۆ خوا شتێکی بداتێ ، یابۆ خوا لێنەگەڕێ کارێك بکا ، ئەوە ئیمانی تەواوە

پێنجـەمین : هەرکەسێك جگـە لـە خـوای گـەورە و ئـایین و خەلکەکـەی خـۆش بوێـت ، بەرانبەر خوای گەورە کافرو بێ باوەڕە ، وەك خوای گەورە سەبارەت بەوە دەفەرمووێ :

قُلْ أَغَيْرَ اللّهِ أَتَّخِذُ وَلِيًّا فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَهُوَ يُطْعِمُ وَلاَ يُطْعَمُ قُلْ إِنِّي أُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَسْلَمَ وَلاَ تَكُونَنَّ مِنَ الْمُشْرِكَينَ {الأنعام/١٤}

واتە : ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بە موشـریك و خوانـەناس و بـەو کەسـانە بلـێ کـە بانگیـان نەکەیت بۆلای ئیسلام ، ئایاچۆن مـن جگـە لـە خـوای گـەورە و میهرەبـان بـە دۆسـت و پشتیوانی خۆم دەگرم لە کاتێکدا کە هەر ئەو دروستکەری ئاسمانەکان و زەویی یە ، ئـەو خواردن و خۆراك و رزق و رۆزی بە خەلك و بە هەموو زیندەوەرانی سەرگۆی زەوی دەدا و کەس خواردن و خۆراك بەو نادا ، بەلکو ئەو خوایە لە هەموو شـتێکی سـەر گـۆی زەوی بێ نیازە و دەولەمەندە ، چونکە بۆ خۆی دروستی کـردوون ، وە پێیـان بلـێ مـن فرمـانم پێکراوەکە یەکەم کەس بم کە تەسلیمی خوای گەورە و بەرنامەکەی بـبم و موسـلمان بم ، ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئاگاداربە لە هاوبەشی پەیداکەران مەبە

شەشەم : ئـەو جـۆرە بیروبـاوەرە (مـوالاة و معـاداة ) ئـەو پەیوەندیەیـە کـە کۆمـەلگای ئیسلامی لەسەر بەرپا دەبێ وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ :

( لایؤمن أحکم حتی یحب لأخیه مایحب لنفسه ) بخاری.

واتە هەریەکێك لە ئێوە ئیمانی تەواو نـابێ تـا ئـەوەی بـۆ خـۆی پێـی خۆشـە بـۆ بـرا موسلمانەکەشی پێ خۆش نەبێ [١٢٠]

[١٢٠] ئەم فەرموودەیە ئەگەر تەتبیق بکرێ ، حەسادەت نامێنێ ، واتا تەواوی کێشە کۆمەلآیەتیـەکان حـەل دەبن . وەرگێر.

ئـەهلی سـووننە و جەماعـە : بـیرو باوەڕیـان وایـە کـە لـەرووی شـەرعیەوە مـەولات و مەعادات واجبێکـی شـەرعیە ، وە لەپێداویسـتیەکانی شـەهادەی (لا إلـە الا اللە) یـە ، وەمەرجێکـە لەمەرجـەکانی ئـەو شـەهادەیە ، وەبنچـینەیەکە لـە بنچـینە و بنـەماکانی بیروباوەڕو ئیمانی ئیسلامی کەواجبە و، دەبێ هەموو موسڵمانان هەمیشـە لەبـەر چاوی بگرن و کاری پێ بکەن ، وە دەقی زۆریش ئەو راستیە دووپـات دەکەنـەوەو دەسـەلمێنن ، وەك خوای گەورە سەبارەت بەوە دەفەرمووێ

{ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاء تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِالْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُوا بِمَا جَاءكُم مِّنَ الْحَقِّ يُخْرِجُونَ الرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ أَن تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ رَبِّكُمْ } {الممتحنة/١}.

واتـە : ئـەی ئەوکەسـانەی ئیمانتـان هێنـاوە ، قـەت دوژمنـانی مـن و خۆتـان مەکەنـە دۆستو پشتیوانی خۆتان ، سۆزو خۆشەویستی خۆتانیان پـێ مـەدەن ، لـەکاتێکا ئـەوان بێباوەڕ بوون دەربارەی ئـەو یاسـا و بەرنامـە هەقـەی کـە بـۆ ئێـوە هـات ، پێغەمبـەرو ئێوەش بەدەر دەنێن لەبەر ئەوەی کە بڕواتان بە پەروەردگارتان هەیە

وە خوای گەورە دەفەرمووێ

قُلْ إِن كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا ومسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ اللّهِ ورسولِهِ وجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُواْ حَتَّى يَأْتِيَ اللّهُ بِأَمْرِهِ وَاللّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ {التوبة/٢٤}

واته : ئەی محمد ﷺ پێ یان بڵێ : ئەگەر (باوك و منداڵ و براو ژن و تیرە و هۆز) ەکانتـان و ئەوماڵەی کـە پەیـداتان کـردەوە و ، ئـەو بازرگانیـەی کەلەکـەم بـوونو لـە نێوچـوونی دەترسن ، ئەو جێگـە خۆشـانەی کەهەتانـە ، لـەخواو پێغەمبەرەکـەی ﷺ لـەجیهادکردن

لەپێناوی خودا لەلاتان بەرێزتر و خۆشەویستره ، چاوەڕێ بن تا خوای گەوره فەرمان دەدا دەرد و بەلا ی خۆی بۆ ئێوه ڕەوانه دەکا

ئەهلی سوننه و جەماعـه : لـەبارەی وەلائـو بەڕائـەوه دابەشـی سـەر سـێ بـەش دەبـن : لەوانه

**یەکەم** : کێ شیاوی ئەوەیه کە پیاو وەلائی ڕەها (**مطلق** ) ی بۆ هەبێ : ئەو بڕوادارانـەی کە بڕوای تەواو و دامەزراویان هێناوه بەخوای گەوره و پێغەمبەرەکـەی (ﷺ) ، وەزۆربـه دڵسۆزی ئامانج و دروشمەکان (أهداف و شعائر) ی ئـایین بـەرپاوجێ بـەجێ دەکـەن وەك خوای گەوره دەفەرموێ :

إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ اللّهُ ورسولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُواْ الَّذِينَ يُقِيمونَ الصَّلاَةَ وَيُؤْتُـونَ الزَّكَـاةَ وَهُـمْ رَاكِعُـونَ {المائدة/٥٥}

واتـه : بەراسـتی گـەوره و سەرپەرشـتیار و پشـت و پـەناو سـەرداری ئێـوه تـەنها خـواو پێغەمبەرەکەی ﷺ و ئەو بڕوادارانەن کە نوێژه دەکەن و زەکـات دەدەن و لـه رکـوع دان ، وەهەر کەسێ بەپشت و پەناو سەرداریێتی خواو پێغەمبەرەکەی و ئەو بڕوادارانه رازی بـێ ، ئەوانه کۆمەڵ (حزب) ی خوای گەورەن، وه بێگومان کۆمەڵی خواش سەرکەوتوون.[121]

[121] وەك خوای گەوره دەفەرموێ : أُوْلَئِك حِزْبُ اللَّهِ أَلَا إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحونَ {المجادلة/٢٢}
واته : ئەو کەسانه کۆمەڵی خوان ، بێگومان کۆمەڵی خواش هەمیشه سـەرکەوتوو و سـەرفرازن وه خوای گەوره ئیمانـداران و کۆمـەڵی خـۆی خـۆش دەوێـن و هەمیشـه بـەرگریان لێ دەکـا وەك دەفەرموێ : اللّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُواْ يُخْرِجُهُم مِّنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّوُرِ {البقرة/٢٥٧}
واته : خوای گەورەو بێ هاوتا تاکه دۆست وپاڵپشتی ئیماندارانه ، لەتاریکایەکانیان دەردێنی بـەرەو ڕوناکایی

**دووەم : کـێ شایسـتەی ئەوەیـە کـە لـە لایەکـەوە وەلائـی بـۆ بکـرێ ، لەلایـەکی تـرەوە بەرائەتی لێ بکرێ :**

**ئەو موسڵمانە یاخی و گوناهبارەی کە هەندێ واجباتەکانی فەرامۆش دەکا ، وەئەو شتە قەدەغەکراو (محرمات) انە دەکا کە ناگەنە ئاستی کوفر ، بۆیە پێویست نیـە بـێ دەنگـی لەتاوانەکانی بکەی ، بەڵکو دەبێ لەسەر کارە خراپەکانی قەدەغـە بکـرێن ، وەفـەرمانی بەچـاکەکردن پـێ بکـرێ ، وەخراپـەکانی لێ یاسـاغو قەدەغـە بکـرێن ، وە تـەحزیرو سەرزنشـتو ئاگـادار بکرێتـەوە۰ ، وە حـەدەدەکانی لێ دەربکـرێن ، تـاواز بێنـێ لـە گوناهوتاوانەکان و لێ یان دور بکەوێتـەوە و لەخراپـەکانی پەشـیمان ببێتـەوە ، هـەروەك پێغەمبـەر (ﷺ) ئـەوەی لەگـەڵ (عبـدالله ی ناسـراو بـە حیمـار) کـرد ، کاتـێ کەمـەی خواردبۆوە هێنایانە لای پێغەمبەر (ﷺ) ، هاوەڵەکان نەفرەتیان لێ دەکرد ، فەرمووی :**

**( لا تلعنوه فوالله ما علمت إلا أنه يحب الله و رسوله ) البخاری**

---

وەدەفەرموێ : إِنَّ اللَّهَ يُدَافِعُ عَنِ الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ خَوَّانٍ كَفُورٍ {الحج/٣٨}

واتە : بێگومان خوای تاکو تەنیا هەمیشە بەرگری لە ئیمانداران دەکا . بەڵام ئەو ئیماندارانـەی کـە بەشەرت ئیمانداران وەك خوا خۆی دەفەرموێ :

وَلاَ تَهِنُوا وَلاَ تَحْزَنُوا وَأَنتُمُ الأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ {آل عمران/١٣٩}

واتە: دڵتەنگ مەبن،بەڵکو ئێوە سەربەرز و سەرفرازو سەرکەوتوون ، ئەگەر ئیمانداری راستەقینەبن. کەواتە دەبێ پیاو وەلائی تەواوی بۆ ئەو ئیمانـدارە راسـتەقینانە هـەبێت و ، بـەبرای دینـی خۆیـانی بزانێتو، لەهانایان بچێت و بەگرفتەکانیان دڵتەنگ بێت ، ئەوسا ئیماندارێکی تەواو و راستەقینەیە

وەرگێر

واتە : نەفەرەتی لێ مەکەن ، سوێند بە خوای گەروە ئەو کوڕە خـواو پێغەمبەرەکـەی ﷺ خۆش دەوێت ، لەگەڵ ئەوەیشدا، ئەوسا پێغەمبەر (ﷺ) حەددی لێ دەرکرد[١٢٢]

سێیەم : کێ شیاوی ئەوەیە کە بەڕاشـەتی تـەواوی لێ بکرێ و بەتـەواوێتی ڕقـت لـێ ی ببێتەوە

ئەو کەسانە ئەو کافرو بێباوەڕە ساف و دیارانەن کە کوفرو شیرك و بێدینیان بە راشکاوی دیارو ئاشکرایە ، بە جیـاوازی رەنـگ و رەگـەزو جـۆرە کانیـان لـە : جولەکـە و گـاورو موشریك و بێباوەڕ و بت پەرست و ئاگر پەرست و دوڕوو ەکان و یاخی بـووان لـە خـوای گەورە و شوێن کەوتوانیان لە ڕەوت و ڕێبازگە تێکـدەرو حزبـە عەلمانیـەکان[١٢٣] ئـەو

---

[١٢٢] خۆی لـە ئیسـلامدا دەبـێ ئینسـان هـەر کـەسو بابـەتێکی بـە ئەنـدازەی چـاکەو خراپـەکانی ، بەئەندازەی لە خوانزیك و دووری خۆش بوێ و رقی لێ بێتەوە ، نابـێ بـە گونـاه و هەڵەیـەك هێـل و چەوت بەسەر هەموو کەسێك دابنێت چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت :

( کل بني أدم خطاء ، وخير الخطائين التـوابين ) المسـتدرك علـى الصـحيح /ج ٤ ، ص/٢٧٢ ، رقـم /٧٦١٧.

واتە : هەموو رۆڵەیەکی ئادەم هەڵە و تـاوان دەکـا ، چـونکە بەشـەر تـاقی کـراوە ، وەك فریشـتە و پێغەمبەر بێ هەڵە و پاك نی یە وە هیچ کەسێکیش تەنها بەگوناهوتاوان کردن لە دین دەرناچـێ ، تەنانەت بە گوناهە گەورەکان ( سبع موبقات ) یش ، بۆیە دەبێ بە ئەندازەی ئەوە وەلائـو بـەڕامان بۆ خەلکەکە هەبێت وەرگێر

[١٢٣] چونکە خوای گەورە پاکانە ( براءة ) ی لە موشریکەکان کردوە ، چونکە شیرك دژو پێچـەوانەی تەوحیدی ئیسلامە ، خوای گەورە لە شیرك خۆش نابێ ، وەك دەفەرموێ :

إِنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَاء وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدِ افْتَـرَى إِثْمًـا عَظِيمًـا {النساء/٤٨}

**واتە :** خوای گەورە لەکەسێك خۆش نابێ کە هاوبەشی بۆ بڕیار بدا، هەرکەس و شتێك بکاتە شەریکی خوای گەورە ، بەلام لە غەیری ئەوانە خۆش دەبێ لە کەسێك کە بیەوێ ، هەرکەسێك هاوبەشی بۆ خوای گەورە پەیدابکا بەراستی تاوان و بوهتان و هە لبەستنێکی گەورەی کردووە.

واتە : خوای گەورە هەرگیز لە شیرکردن خۆش نابێ ، جا هەر شتێك بکەیتە شەریکی خوای گەورە ، بەلاّم لە گوناهوتاوانەکانی تری جگە لەوە خۆش دەبێ ، وەدەفەرمووێ :

ومن يشْرِكْ بِاللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ السَّمَاء فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ أَوْ تَهْوِي بِهِ الرِّيحُ فِي مَكَانٍ سحِيقٍ {الحج/٣١}

**واتە :** ئەو کەسەی کە هاوبەشی بۆ خوای گەورە بڕیاردەدا ، وەکو ئەوە وایە کەلە ئاسمان کەوتۆتە خوارەوە و ، بالە فڕە دەیفڕێنێ یاباوبڕ دەی هاوێتە شوێنێکی هاڕەرو فەوتێنەر.

وە شیرك هەموو کارو کردەوەکانی ئینسان بەتاڵ دەکاتەوە وەك دەفەرموێ :

وَلَوْ أَشْرَكُواْ لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ {الأنعام/٨٨}

**واتە :** ئەگەر ئێوە شیرك بۆ خوای گەورە پەیدا بکەن ، هەرچی بیکەن لە کاروکردەوەکانتان هەلدەوەشێتەوە

وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ {الزمر/٦٥}

واتە : ئەی پێغەمبەرﷺ بە ئێوە و بەخەلکی پێش ئێوەشمان راگەیاندوە ئەگەر شیرك بکەیت ، هەموو کارو کردەوکانت هەلّدەوەشێتەوە ، وە لە رۆژی دوایشدا زۆر زەرەمەند دەبی هەروەك جولەکە و گاورەکان بە زۆر جۆر شیرك یان بۆ خوای گەورە بریار دەدا ، بۆ وێنە پێغەمبەرانی وەك (عیسی و عوزیر) یان دەکردنە کوڕی خوا . وە لەسەحیحی بوخاری دا هاتوە کە کوری مسعود لە پێغەمبەر ی پرسی (ﷺ) چ تاونێك لەهەمووان گەورەترە ، فەرمووی : (أن تجعل لله ندا وهو خلقك).

**واتە :** ئەوە کەتۆ هاوبەشی بۆ خوای گەورە پەیدا بکەی لە کاتێك کە تۆی دروست کردوە ، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ :إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ {لقمان/١٣}.

حوکمە لەسەر ئەو موسـڵمانانەش جـێ بـەجێ (تطبیـق) دەکـرێ کـە کـارو کردەوەیـەکی کافرانە دەکەن وەك :

پاڕانەوە لەغەیری خوای گەورە ، یا هانا بۆ بردن و داوای دادو فریاکردن لە غەیری خوای گەورە ، یا پشت بەستن بەغەیری ئەو یا جنێودان بە خـواو بـە پێغەمبەرەکـەی (ﷺ) و بە ئاینەکەی ، یا جوێ کردنەوەی ئاین لەژیان و بروا بوون بەوەی کە ئاین بۆ ئـەمرۆ (بـۆ ئەم سەردەمە) گونجاو نیەو دەسـت نـادات . یـا هەرشـتێکی تـری هاوشـێوەی ئەوانـە ،

---

**واتە** : بەراستی شیرك بۆ خوا بریار دان زوڵم و تاوانێکی ئێجگار گەورەیە دەرهـەق بـەخوای گـەورە دەکرێت ، بۆیە خوای گەورە پاکانەی تەواو و رەهای لە موشریکەکان کردوە وەك دەفەرموێ:

بَرَاءةٌ مِّنَ اللّه ورسُولِهِ إِلَى الَّذِينَ عَاهَدتُّم مِّنَ الْمُشْرِكِينَ {التوبة/١}

**واتە:** خواو پێغەمبەری خوا پاکانەی تەواو یان لە موشریکەکان کردوە ، بۆیـە هـەر کەسـێ دەیـەوێ بگاتە خوای گەورە و خوای لێ رازی بێت با کارو کردەوەکانی چاك بکات و شـیرك بـۆ خـوای گـەورە بریار نەدا ، وەك خوای گەورە دەفەرموێ:

قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاء رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا {الكهف/١١٠} . وەرگێر.

واتە : ئەی پێغەمبەرﷺ بەو خەڵکە بڵێ : منیش وەکو ئێوە ئادەمیزادو بەندەم ، وەڵێ سروشم لەلایەن پەروەردگارم بۆ دێت ، ئاگاداربن خواتان یەك خوایە کە خوای کردگاری بوونەوەرو جیهانە ، جا هەرکەسێك دەیەوێ لەرۆژی دوایی بەسەلامەتی و بەپاکی بە خوای خۆی بگات و رەزامەندی خوای خۆی بەدەست بێنێ با کارو کردەوەی چاك ئەنجام بدات ، با لەرووی خواپەرستی و خواناسی و خوایەتییەوە هیچ شتێك نەکاتە هاوبەشی خوای گەورە و میهرەبان .

جادوای ئەوەی کە بەڵگە و بیانو (حجة) ی لەسەر بەرپا و تۆمار دەکەین ، واجبە لەسەر هەمی موسڵمانان کە بەرهەڵستی و تەنگە تـاوی بکـەن و جیهـادی لەگەڵـدا بکـەن ، وە وازیان لیّ مەیەنن تا لە زەوی خۆیان دەریان دەکەن ، وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

يَا أَيُّهَا النَّبِي جَاهِد الْكُفَّارَ وَالْمُنَافِقِينَ وَاغْلُظْ عَلَيْهِمْ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وبِئْس الْمَصِيرُ {التوبة/٧٣}

واتە : ئەی پێغەمبەر ﷺ لەسەر خوای گـەورە و بەرنامەکـەی لەگـەل کـافرو بێبـاوەر و دوڕووەکاندا بجەنگەو لە کاتی خۆیدا شەریان لەگەلدا بکە و ، لەسـەریان تونـدو رەق بـە، لە دوارۆژدا جێگای ئەوانە دۆزەخ و، خراپترین چارەنووسە

وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

لَا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّه وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءهُمْ أَوْ أَبْنَاءهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ {المجادلة/٢٢}

واتە : هیچ گەلێك نی یە کە بڕوای بەخواو بەرۆژی دوایی هەبێ کەچی ئەو کەسانەیان خۆش بوێ کە دوژمنایەتی خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەکەن ، بە ئەوانەش باوکانیان یا براکانیان یا رۆڵەکانیان یاخەڵکی تیرەو هۆزەکانی ئەوان بن

**ئـەهلی سـوننه و جەماعـه** : وادەزانـن کـه ( **مـوالاة** ) چـەند هەقومـەرجێکی هەیـه کەدەبێ تیادا بێنه دی لەوانه

یەکەمین : کۆچکردن (الهجرة) : کۆچکردن لەشارەکانی کوفر بـۆ شـارەکانی موسـڵمانان ، بەڵام پەککەوته و چەوساوەکان که ناتوانن لەبەر چەند هۆیەکی شەرعی کۆچ بکەن لـەو قاعیدەیه بەدەرن

دووەمین : سەرسەختی موسڵمانان و یارمەتی دانیـان بـه خـۆو بـەماڵ و بـه زوبـان ، وە بەشداری کردن لە خۆشی و ناخۆشیو خەم و پەژارەکانیان [124]

[124] بێگومان لە بیرو باوەری تەواو و رەسەنی ئیسلامی ئەوەیە که دەبێ ئینسان هـەموو ئیمانـداران بە بروا و خوشکی خۆی بزانێت ، وە بەدۆست و خۆشەویـست و پشـتیوانی خۆیـان بزانێـت ، چـونکە خوای گەورە دەفەرموێ :

وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ أُوْلَئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللّهُ إِنَّ اللّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ {التوبة/71}

واتە : ئیمانداران هەندێکیان پشتیوانی هەندێکیانن ، فرمان بەچاکە دەکـەنو رێ لـە خراپـەدەگرن ، نوێژ ئەنجام دەدەن و زەکات دەدەن ، بەگوێ ی خوای گەورە و پێغەمبـەر ﷺ دەکـەن ، ئەوانـە خـوای گەورە رەحمیان پێ دەکات ، بەراستی خوای گەورە زاڵ و بەدەسەلاتو زاناو دانایە

وە پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێ :

( المسلم أخو المسلم لا يظلمه ولا يسلمه ) بخاري

**واتە** : موسڵمان برای مسوڵمانە، لەسەریەتی کەستەمی لێ نەکا و سەرشۆروزەبوونی نەکا

وەدەفەرموێ :

المؤمن مرآة المؤمن إذا رأى فيه عيبا أصلحه سنن أبي داود ، ج/٤ ، ص / ٢٨٠ ، رقم ٤٩١٨

**سێیەم :** دەبێ ئەوەی کە بۆ خۆی پێی خۆشە لە چاکەو لە زەرەروزیانو لەلادانی خراپـە ، بۆ هەموو موسوڵمانانیشی پێ خۆش بێـت [125] وەنابـێ گەمـەو گاڵتـە یـان پـێ بکـا، وە دەبێ سوور بێ لەسەر خۆش ویستنیان ، سور بێ لەسەر لەگەڵدانیشتن یان لە کۆبونـەوە و بۆنەکان [126] ، وە دەبێ مکورِ بێ لەسـەر پرس پێ کردن و را وەرگرتنیان [127]

---

**واتە :** ئیماندار ئاوێنەی ئیمانداره ، هەر کاتێ نەنگێکی لێ دیت بـا راسـت و چـاکی دەکـات نـەك خراپ و خواری بکا

وەدەفەرموێ : (أنصر أخاك ظالما أو مظلوماً) بخاري + مجمع الزوائد /ج ٧ ، ص ٢٦٤

**واتە :** براکەت سەر خە و یارمەتی بدە ، ستەمکار بێ یا ستەملێکراو، سـەحابەیەك گـوتی : چـۆن دەبێ یارمەتی ستەمکار بدەین ، فەرموی : دەستی بگرە لێمەگەرێ ستەمبکا ، ئەوە یارمەتی دانو سەرخستنیەتی ، دەبێ بەشداری لە خۆشی و ناخۆشیەکانی بکەی وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ : من ترك دعوة فقد عصى الله . بخاري

**واتە :** هەقی موسلمان لەسەر موسلمان ئەوەیـە ئەگـەر بـانگی کـردی بەدەمیـەوە بچـی . وەلەگـەل تەرمی برۆی و بینێژی ، وەك ﷺ پێغەمبەر دەفەرموێ : من تبع جنازة فله قراط بخاري .

**واتـە :** هەرکەسێك لەگەل مردو بێ تا دە ناشترێ ، خێری قیراتێکی بۆ هەیە ، قیرات بە قـەد چیای ئوحدە کە لەشاری مەدینەیە

وەلەکاتی نە خۆشبوونیدا سەردانی بکەیت ، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ :

أمرنا بعيادة المريض واتباع الجنازة بخاري

**واتە :** فرمانمان پێکراوە سەردانی نەخۆش بکەین ولەگەل مردو برۆین تا دەناشترێ .

١٢٦ وەپێغەمبەری خوای گەورە (ﷺ) دەفەرموێ : (عدوا المريض)

**واتە :** سەردانی نەخۆش بکەن وەرگێر

[126] چونکە پێغەمبەری خوای گەورە دەفەرموێ (ﷺ) :

لایحب أحدکم حتی یحب لأخیه ما یحب لنفسه

واتە : هەر یەکێك لە ئێوە ئیمانی تـەواو نـابێ و دانامـەزرێ تـا ئـەوەی بـۆ خـۆی پێـی خۆشـە بـۆ براموسلمانەکەشی پێ خۆش نەبێت

وەدەفەرموێ : المسلم من سلم المسلمون من یده ولسانه

واتە : موسلمانی تەواوو راستە قینە ئەو کەسەیە کە موسلمانان تەواو لـە زوبـانو دەسـتی ئـەمین و دلنیا بن

- يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَسْخَرْ قَومٌ مِّن قَوْمٍ عَسى أَن يَكُونُوا خَيْرًا مِّنْهُمْ {الحجرات/١١}

واتە : ئەی ئیماندارینە با هیچ کەس و گەلێك لە ئێوە گاڵتە و گەمە بەکەس و گەلێکی تر نەکات ، رەنگە گەمە پێکراوەکە لەگاڵتە پێکەرەکە باشتر و چاکتر بێ لەلای خوای گەورە

وە پێغەمبەر یش(ﷺ) دەفەرموێ :

( لا تحقرن من المعروف شیئاً ) مسلم / ج٤، ص ٢٠٢٦ ، رقم /٢٦٢٦

واتە : هەرگیز (قەت) گاڵتە بەهیچ شتێك مەکەن لە چاکە باکەمیش بێ

وەدەفەرموێ:لیس المؤمن بطعان ولا اللعان ولا فاحش و البذي. المستدرك/ ج/١،ص ٥٧، رقم / ٢٩.

واتە : بڕوادار هەرگیز تانە و تەشەر لێدەر و نەفرەت لێکەر و زمان شڕو وڕ نی یە٠.

وە دەفەرموێ : المؤمن للمؤمن کالبنیان یشد بعضه بعضا .ج/ ١ ص ١٨١ ، رقم / ٤٦٧

واتە : ئیماندار بۆ ئیماندار وەکو قەلاو بناغی وایە کە هەندێکیان هەندێکیان بەهێز و پتەو دەکـەن و پێکەوە گرێ دەدەن وەرگێر

[١٢٧] چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ سـەحابەکان دایمـە بەیـەکتریان دەگـووت : دەورن بـا سـاتێك پێکەوە کۆببینەوە ئیمانمان پێکەوە نوێ و زیـاد بکـەین ، وەدەفـەرموێ بەشـداری ناشـتنی جـەنازە و نەخۆشو ناخۆشیەکانی یەکتری بکەن وەرگێڕ.

- چونکە پرس پێکردن و ڕاوەرگرتن لە ئیسلامدا گرنگە، وەك خوای گەورە دەفەرمووێ

**چوارەمین :** دەبێ مافەکانی ( موسڵمانان ) جێ بەجێ بکا ، وەك سەردانی کردن لـەکاتی تەنگانە وناخۆشی دا ، وەلەگەڵ رۆیشتنی مردویان ، وەلەگەڵ نەرم و نیان و بەزەیی بوون ، وە دوعا بـۆ کردنیـانو داوای لێخۆشـبوون بـۆ کردنیـان لـەخوای گـەورە ، وەسـەلام لێ کردنیان ، وە فڕوفێڵ لێ نەکردنیان لەکاتی مامەڵە و بازرگانی لەگەڵ کردنیاندا

**پێنجەم :** سیخوریوکلۆگری ( تجسس ) لەسەر نەکردنیان[128] ، وەنابێ راز و نیاز و هـەواڵ و نهێنیەکانیان بـۆ دوژمنانیـان نـەقڵ بکرێـت[129] ، وە دەبـێ ئەزیـەت و ئازاریـان لەسـەر لابدرێ[130] ، وەدەبێ چاکساز ( إصلاح ) یان لەنێواندا بکرێت[131]

---

وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللّهِ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ {آل عمران/١٥٩}

واتە : هەمیشە لەکاروبارەکانتاندا پرسو راوێژ بەیەکتری بکـەن ، وەکاتـێ ویسـتان کارێـك بکـەن ، پشت بەخوای گەورە ببەستن و ئەنجامی بدەن ، خوای گەورە ئینسانی بە تەوەکولی خۆش دەوێت

وەدەفەرموێ : وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ {الشورى/٣٨}

واتە: کاروبارەکانتان لە نێوە خۆ بە ئاگاداری و بەپرس و ڕای یەکتر بکەن ، رای یـەکتری وەربگرن

وە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ :

(ما خاب من إستشار ولانديم من استخارة ) رواه الطبارانی / ضعیف

واتە: ئەو کەسە زەرەر ناکا کە پرس و ڕا بە خەلکی دەکا، چونکە بە زۆری ڕەیی زۆران لە هی یەکێك باشترە وەرگێڕ.

[128] چـونکە خـوای گـەورە دەفـەرموێ ئێـوە جاسوسـی و سـیخوری لەسـەر یـەکتر مەکـەن ( ولا تجسسوا...) الحشر/١٢

وە پێغەمبەری ئازیز مان (ﷺ) دەفەرموێ : ( ولا تجسـسوا ولا تحسـسوا ) بخاری .

واتە : سیخوری لەسەر یەکتر مەکەن و بەدوای هـەواڵ و شـەرمگەو نـەنگاکانی یـەکتری مەکـەن و هەست لە یەکتری رامەگرن ، وەك دەفەرموێ : ( ولا تتبع عورات المسلمين )

واتە : بەدوای هەواڵ و شەرمگەو نەنگاکانی برا موسڵمانەکانتان مەکەون وەرگێر.

[129] چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ : ( من ستر أخاه في الدنيا ، ستره الله في الـدنيا و الاخـرة) المستدرك على الصحيحين / ج /٤ ، ص ٤٢٥ ، رقم /٨١٥٩

واتە : هەرکەسێك نەنگاکانی برای موسڵمانی داپۆشی ، خوای گەورە نەنگەکانی دادەپۆشێ لـەدونیا و لە دوارۆژدا

وە دەفەرموێ : (من ستر مسلما ستره الله)

واتە هەر کەسێك نەنگی موسڵمانێك داپۆشێت ، خوای گەورە نەنگەکانی دادەپۆشێت . وەرگێر

[130] چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ : ( والله في عون العبد ماكان العبد في عون أخيه ) مسـلم / ج/٣ ، ص ٢٠٧٤، رقم ٢٦٩٩

واتە : خوای گەورە لە هاناو هاواری بەندەکەی خۆی دێ و هاوکـاری ئـەکا ، مـاتو بەنـدە لـە هانـاو هاواری براکەی دەچێ و هاوکاری دەکات

وە دەفەرمووێ : ( من كـان في حاجـة أخيـه كـان الله في حاجتـه ) بخـاري ج ٢ ، ص ٨٦٢ ، رقـم ٢٣١٠ واتە : هەرکەسێك ئاتانج و پێویستی براکەي خۆی جێ بەجێ بکا ، خوای گەورە ئاتانج و پێویستی ئەوجێ بەجێ دەکات

وە دەفەرموێ : من فرج عن مسلم كربة فرّج الله عنه كربة من كربات القيامة بخاري

واتە : هەر کەسێك ناخۆشیو تەنگانەیەك لەسەر موسڵمانێك لابدات ، خوای گـەورە ناخۆشـی رۆژی دوایی لەسەرلادەدا وەرگێر

[131] چونکە خوای گەورە دەفەرموێ :

إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ (الحجرات: ١٠)

واتە : هەموونیمانداران بران ، هەمیشە چاکە و ئاشتەوایی لە نێوان براکانتاندا بکەن

**شەشەمین : چوونە ناو کۆمەڵی موسڵمانان و لێ جیابوونەوەیان ، دەبێ دەسـبارو هاوکـار یـان لەگەڵـدا بکـرێ لەسـەر خێـرو چـاکە و خـوا پەرسـتی و خواناسـی و فەرمانکردن بەچاکە و ڕێگرتن لەخراپە [١٣٢]**

---

وە دەفەرموێ : وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِن بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّـهِ فَـإِن فَـاءَتْ فَأَصْـلِحُوا بَيْنَهُمَـا بِالْعَـدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ {الحجرات/٩

واتە: ئەگەر دوو دەستەوتاقم و کۆمەڵ لە ئیمانداران لەگەڵ یەکتری بەشەڕ هاتن و یـەکتریان کوشت، ئاشتەوایی و تەبایی یان لەنێواندا بکەن ، ئەگەر یەکێکیان لەسەر ئەویکە یاخی بوو و نەهاتە ژێـر بـاری دانوسـتان و ئاشـتەوایی ، لەگـەڵ ئـەوەدا شـەڕ بکـەن کـەیاخی بـووە تـا دەگەڕێتەوە لای حوکم و فرمانی خوای گەورە و رازی دەبێ ، ئەگـەر گەڕایـەوە لای حـوکمی خوای گەورە و پێ ی رازی بوو ، بەدادگەریی ئاشتەوایییان لە نێواندا بکـەن ، چـونکە خـوای گەورە دادگەرانی خۆش دەوێت . چونکە ( والصلح خیر ) . سـولح چـاکە و خێـری تێدایـە وەرگێر .

[١٣٢] چونکە خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) زۆر گرنگیان بە کۆمەڵبوون (جماعـة) داوە ، بـۆ وێنە وەك خوای گەورە دەفەرموێ : ( يد الله مع الجماعة ) .

واتە : دەستی خوای گەورە لەگەڵ کۆمـەڵبوندایە ، وە ك خوای گەورە دەفەرموێ : ( يـد الله فـوق أيدهم )

واتە : دەستی خوای گەروە لەسـەروی دەستی ئەوانە، لەسەرتانە کە هەمیشە کۆمـەڵ و یەك بن .

وە دەفەرموێ : عليكم بالجماعة ، وإياكم والفرقة ، فإن الشيطان مع الواحد ، وهو مع الاثـنين أبعد ، ومن أراد بحبوحـة الجنـة ، فليلـزم الجماعـة . امـام احمـد / ج /٥ ، ص ٣٧٠ ، رقـم / ٢٣١٩٤

**ئەهلی سوونەو جەماعە : وادەزانن کە دوژمنایەتی و مەعادات لـەپێناو خـوا چەند شتێك دەگرێتە خۆ لەوانە :**

---

واتە : هەمیشە کۆمەل و یەك بن ، خۆتان لە پارچەپارچەیی و دوبەرەکی و ناکۆکی بپارێزن ، چونکە شەیتان لە گەل تاك ریەکە ، لە کۆ و دوان دورترە ، هەرکەسێك دەیەوی رەزامەندی خواو بەهەشتی نەبراوە بە دەست بێنێ ، با دەست بە کۆمەلەوە بگرێ .

واتە : لەسەر تانە هەمیشە لەسەر بەرنامەی خوای گەورە کۆمەل و یەك بن .

وە دەفەرموێ : (إنما يأكل الذئب من الغنم القاصية) . المستدرك /ج ١ ، ص ٣٣٠ ، رقم ٧٦٥

واتە : گورگ هەمیشە ئەو مەڕە دەخوا کە لەمێگەل دادەبڕێ و یاخی دەبێ .

وەدەفەرموێ : ( الجماعة رحمة والفرقة العذاب ) . مسند شهاب / ج ١ ، ص ٤٣ ، رقم / ١٤

واتە : کۆمەڵبوون خێر و بەرەکەت و رەحمەتە ، پارچە پارچەیش ئێش و ئازاروژانە

وەکاتێ کە پێغەمبەر (ﷺ) باسی ئەوە دەکا کە موسڵمانان دەبنە (٧٣) فرقە، لەوانە حەفتاو دویان بەهیلاك دەچن تەنها یەك کۆمەڵ نەبێ ، ئەویش دەفەرموێ : إلا ما أنا عليه وأصحابي. المستدرك /ج ١ ، ص ٢١٨ ، رقم ٤٣٤

واتە : تەنها ئەوکەسە بەهەشتیە کەمن لەسەریە ، ئەویش بریتییە لەکۆمەڵو جەماعە

بۆیە خوای گەورەش دەفەرموێ : وَاعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ اللّهِ جَمِيعًا وَلاَ تَفَرَّقُواْ {آل عمران/١٠٣}

واتە : دەست بە پەت و رێباز و بەرنامەو پەیمانی خوای گەورەوە بگرن و هەرگیز ناکۆك و دوبەرەك و پارچە پارچە مەبن و لێ ی لا مەدەن ، بەڵکو کۆك و یەك .

وە عبداللە ی کوڕی مەسعود دەفەرموێ : (الجماعة ما وافق الحق ولو كنت وحدك )

واتە : جەماعەت ئەوەیە کە تۆ لەگەڵ هەق داکۆك بی بابە تەنیاش بیت .

وە خوای گەورە دەفەرموێ : وَلاَ تَنَازَعُواْ فَتَفْشَلُواْ وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ{الأنفال/٤٦}

واتە : هەمیشە کۆك‌و کۆمەل بن ، هەرگیز ناکۆکی و دوبەرەکی تان تێ نەکەوێ ، دەنـا هـەرەس دێنن و هێز و پێزتان نامێنێ ، بۆیە کوردیش دەڵێ : هێز لەیەکێتی‌و یەکگرتندایە . وەرگێڕ

یەکەمین : رق لێ بوونەوە و بێزاندنی شیرك و کوفر و خەڵکە کەیەتی ، وە دەبـێ لە دڵەوە دوژمنیان بێت و ، بڕوای بەشەڕلەگەڵداکردنیان هەبێ و ، شەڕگە ( میدان القتال ) یان لێ بخوازیت .

دووەمین : نابێ هەرگیز بێ باوەڕان بە دۆستو پەنابگیرێن و ، دۆستایەتی بەدلیان بکرێو خۆش بویسترێن ، بەڵکو دەبێ لێیان جیابن باخزمو ناسیاوی نزکیش بن .

سـێیەمین : جـێ هێشـتن و پشـتکردنە ولآتـی کـوفرو سـەفەر بـۆ نـەکردن بـەبێ زەرورەتوهۆی شەرعی ، ئەگەر زەرور نەبێ وێڕای ئەوەی کەدەبێ پیاو توانای جێ بەجێ کردن و دەرخستنی دورشمە ئایینیەکان (شعائر الدین) و خۆپاراستنی هەبێت.

چوارەم : نابێ پیاو لە تایبەتمەندیەکانی دین و دونیادا خۆی وەوان بچوێنێ لەشتە ئایینیەکان ، وەك دورشمەکانی ئاینی ئەوان ، وەلە شتە دونیایەکانیش وەك رێگاو دەستوری خواردن و خواردنەوەو جل و بـەرگو هەنـدێ داب و نـەریتی تریـان لـەو شتانەی کەلە نێو موسڵماناندا ناشەرعیو باونین [١٣٣] چونکە ئەو بەکارهێنان و خۆ

---

١ وەك خودای گەورە دەفەرمووێ قەت دوژمنانی خوای گەورە بە پشت و پەنای خۆتان مەگرن وەك لە هەندێ لەم ئایەتانە باس دەکات :

{ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَتَّخِذُواْ بِطَانَةً مِّن دُونِكُمْ لاَ يَأْلُونَكُمْ خَبَالاً وَدُّواْ مَا عَنِتُّمْ قَدْ بَدَتِ الْبَغْضَاء مِنْ أَفْوَاهِهِمْ وَمَا تُخْفِي صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ الآيَاتِ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ } {آل عمران/١١٨}.

واتە : ئەی ئەوکەسانەی ئیمانتان هێناوە ، جگە لەخۆتان کەسێکی تر مەکەنە دۆستو پشتیوانی گیانی بەگیانی تان ، دەنا لەهیچ کات و شەڕو خراپەیەك درێغی و قسوری تان پێ ناکەن ، ناخۆشی و نارەحەتی ئێوەیان زۆر پێ خۆشە ، رق و کینەو خراپەیان لە زارو لەدەم دیارە ، ئەوەی لە نێو دڵو

دەروون و سینەشیاندا دەیشارنەوە گەورەترە لەوەی بەزار ئاشكرای دەكەن ، ئیتر ئێمە بەڵگە و نیشانەكانی خۆمان بۆ ئێوە ئاشكراو ڕوون كردۆتەوە ئەگەر ئێوە ئاقڵتان هەبێ و تێ بگەن .

{ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَتَّخِذُواْ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاء مِن دُونِ الْمُؤْمِنِينَ أَتُرِيدُونَ أَن تَجْعَلُواْ لِلّهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَانًا مُّبِينًا } {النساء/١٤٤}

واتە : ئەی ئەوكەسانەی ئیمانتان هێناوە ، جگە ئیمانداران بێباوەڕان مەكەنە دۆستو پشتیوانی گیانی بەگیانی خۆتان.

{ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَتَّخِذُواْ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاء بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ إِنَّ اللّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ } {المائدة/٥١}.

واتە : ئەی ئەوكەسانەی ئیمانتان هێناوە ، جولەكەو گاور مەكەنە دۆستو پشتیوانو خۆشەویستی خۆتان ، ئەوان هەندێكیان دۆستو پشتیوانی هەندێكیانن ، هەركەسێك ئەوان بكاتە دۆستو پشتیوانی خۆی ، ئەوە لەوانە ، خوای گەورە ڕێنمای گەلی ستەمكاران ناكات .

{ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَتَّخِذُواْ الَّذِينَ اتَّخَذُواْ دِينَكُمْ هُزُوًا وَلَعِبًا مِّنَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ مِن قَبْلِكُمْ وَالْكُفَّارَ أَوْلِيَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ } {المائدة/٥٧}

واتە : ئەی ئەوكەسانەی ئیمانتان هێناوە ، ئەوكەسانەی كە گەمەو گاڵتەیان بە ئایینی ئێوە كرد لە خاوەن پەرتووكەكان كە لە پێش ئێوە پەرتووكی خوای گەورەیان بۆ هاتوە ، وە بێباوەڕەكان ، مەیانكەنە دۆستو پشتیوانی خۆتان ، لە خوای گەورە بترسن ئەگەر ئێوە ئیماندارن .

{ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَتَّخِذُواْ آبَاءكُمْ وَإِخْوَانَكُمْ أَوْلِيَاء إَنِ اسْتَحَبُّواْ الْكُفْرَ عَلَى الإِيمَانِ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ } {التوبة/٢٣}

واتە : ئەی ئەوكەسانەی ئیمانتان هێناوە ، باوكو باراكانتان مەكەنە دۆستو پشتیوانی خۆتان ئەگەر كوفریان بەسەر ئیماندا هەڵبژارد، كوفریان لە ئیمان زیاترخۆش ویست ، هەركەسێك لە ئێوە ئەوكەسانە بكاتە دۆستو پشتیوانی خۆی ئەوكەسانە ستەمكارن .

{ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاء تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِالْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُوا بِمَا جَاءكُم مِّنَ الْحَقِّ يُخْرِجُونَ الرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ أَن تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ رَبِّكُمْ } {الممتحنة/١} ، وەرگێڕ.

واتە : ئەی ئەوکەسانەی ئیمانتان هێناوە ، قەت دوژمنانی من و خۆتان مەکەنە دۆستو پشتیوانی خۆتان ، سۆزو خۆشەویستی خۆتانیان پێ مەدەن ، لەکاتێکا ئەوان بێباوەڕ بوون دەربارەی ئەو یاسا و بەرنامە هەقەی کە بۆ ئێوە هات ، پێغەمبەرو ئێوەش بەدەر دەنێن لەبەر ئەوەی کە بڕواتان بە پەروەردگارتان هەیە .

[٢] لێرەدا مەبەست لەخواردن و بەکارهێنانی جل و بەرگو ئامرازی حەرام و ناشەرعیە ئەگەر نا زۆر شت هەیە ، هی ئەوانیشە ، بەکارهێنانی (موباحە) و حەرام نیە .وەرگێڕ .

[٣] چونکە پێغەمبەر (ﷺ) نەهی لەوە کردوە کە لەهەندێ شتو عادەتی یاساغ و حەرام خۆمان وە کافرەکان بچوێنن. چونکە دەفەرمووێ :

(من تشبه بقوم فهو منهم) أبو داود / ج [٤] ، ص ٤٤ ، رقم / ٤٠٣١

واتە : هەر کەسێك خۆی وە گەلێك بچوێنێت ئەوە لە وانە .

بۆیە دەفەرموێ : (خالفوا المشركين) بخاري .

واتە: پێچەوانەو دژایەتی موشریکەکان بکەن .

دەفەرموێ : (خالفوا اليهود و النصارى ..)

واتە: لە دابو نەریتو شتەخراپو ناشەرعیەکانی ژیانتاندا موخالەفەی جولەکە و گاورەکان بکەن . وەرگێڕ.

[٤] چونکە خوای گەورە دەفەرمووێ: لَوْ تُدْهِنُ فَيُدْهِنُونَ{القلم/٩}

واتە: هەرگیز خۆ بۆ بێ باوەران شل و خاو مەکەن و مەیلیان مەکەن .

دەفەرموێ : فَلاَ تَمِيلُواْ كُلَّ الْمَيْلِ {النساء/١٢٩}.

واتە : هەمو جۆرە مەیلێك بەلای بێ باوەراندا مەکەن ، خۆیان بۆ شۆڕو شل مەکەن .

هاوشێوەکردنە (تشبّه) ەش ، جۆرێ : لـە دۆسـتایەتی کـردن و خۆشەویسـتی لـە ناوەوەی پیاو دا گەلالە و بەمیرات دەکا ، وە خۆشەویستی ناوەوەش دەرئەنجام خۆی لە روالّەتدا دەدرەوشێنێتەوە

---

وەدەفەرمووێ : وَلاَ تَرْكَنُواْ إِلَى الَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ النَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ اللّهِ مِنْ أَوْلِيَاء ثُمَّ لاَ تُنصَرُونَ {هود/١١٣}.

واتە: هەرگیز بەلای ستەماکاراندا مەچن و مـەیلو هاوکاریـان مەکـەن ، چونکە بـە هـۆی ئـەو ئاگردەتان گرێ ، ئەوسا جگە لە خوای گەورە و میهرەبان هیچ کەس و شتێك بەهاناتانەوە نایێ و دادتان نادات ، ناتوانێ سەرتان بخاو رزگارتان بکات. وەرگێڕ

[5] لەبەرئەوەی حوکم تەنها بۆ خوایە وەك خوای گەورە دەفەرمووێ :

إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلّهِ أَمَرَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَعْلَمُونَ {یوسف/٤٠}.

واتە : حوکم و دادوەری تەنها بۆ خوای گەورەیە و هی خوای گەورەیە ، واتە دەبێ خەلك لەسەر گۆی زەوی سەبارەت بە کاروبارەکانی ژیانیان حوکم تەنها بە یاساو بەرنامەی خوای گەورەومیهرەبان بکەن ، وە فرمانیان پێ کراوە تەنها خوای گەورە بپەرستن ، ئا ئەوە ئایینی بـە هێـزو بـە پێـزو راسـتو دروستی خوای گەورەیە ، وەلێ زۆربەی خەلکی ئەو راستیە نازانن و دانی پیا نانێن .

وە دەفەرمووێ : ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ ﴾

واتە: هەر کەسێك حوکم بەو قورئانە نەکا ، بێ باوەڕە بەرانبەر بە خوای بێ هاوتا. چونکە خـوای گەورە دەفەرموێ: إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللّهِ الإِسْلاَمُ {آل عمران/١٩}

واتە : ئایینی پەسندکراو لەلای خوای گەورە تەنها ئیسلامە . وەرگێڕ.

[6] چونکە کاتێ سەلامیان لە پێغەمبەر دەکرد ، بەو شێوەیە وەلامی دەدانەوەو دەیگوت ( وعلیکم). واتە : لەسەر ئێوەش . یا دەیگووت : (وعلیکم السام ). واتە: مردن لەسەرتان بێت ، لەبەر ئەوەی ئەوانیش وایان بە پێغەمبەر دەگووت ﷺ.

پێنجەمین : نابێ پاڵپشتی بێ باوەڕان بکاو سەریان بخا ، نابێ مـەدحیان بکـا، نابێ لەدژی موسڵمانان هاوکاریان بکا و ، نابێ بەسەر موسڵمانانیاندا زاڵ بکـا و سەریان بخا ، نابێ مەیل یان بکا ، بەڵکو دەبێ بیان کاتە دۆستو هاوەڵی خۆی ، دەبێ پشت لە کۆڕو کۆبوونەوەکانیان بکا ، نابێ بیان کاتە دۆستو پشت و پەناوو ناوپۆش (بطانية) ی خۆی کە پارێزگاری لە رازو نیازەکانیان بکات .

شەشەمین : نابێ بەشداری لە (بۆنە و جەژن و خۆشی) یەکانیانـدا بکـرێ ، نابـێ پیرۆز باییان لێ بکرێ ، نابێ بە گەورە (سید) و سەرپەرشتیار و سـەردار و پشـت وپەنا (مولى و موالي ) و گەورە (تعظيم) بکرێن وبلوێنلرێن .

حەوتەم : نابێ لەلایەن خوای گەورە داوای لێبوردن و لێخۆشبوون یان بۆ بکـرێ ، نابێ رەحمیان پێ بکرێ .

هەشتەمین : نابێ لەسەر حسابی ئاین لەگەڵیان شل و نەرم و نیان و بە گفتوگـۆ بیو لەگەڵیان هەڵبکرێ .

نۆیەم : نابێ لەسەر موسڵمانان بکرێنە دادوەر و فەرمانڕەوا و ، نابێ بە حوکم یان ڕازی بن ، وەنابێ لەهیچ کارێکدا پـەیڕەوی لـە ئـارەزوو و یاسـایەکانیان بکـرێ ، چونکە پەیرەوی کردنی ئەوان ، وازهێنان و پشتکردنە لـە حـوکمی خـوای گـەورە پێغەمبەر .

دەیەمین : نابێ سەلامـیان لێ بکرێ بەسـەلامی ئیسـلام بەدارشـتە ( صـيغة ) ی (السلام عليكم ) .

# بنچینە و بنەمای شەشەم

# دان پێدا هێنـان و بەڕاست دانانی خەلات و ڕێزلێنانی دۆستان و پیاوچاکانی خوا

# ( ألاصل السادس )

# التصديق بكرامات الأولياء

# بەڕاست زانینی
# کەڕامەتی وەلیەکانی خوای کردگار

## لەبنچینەکانی بیرو باوەڕی پێشینە چاکەکان ، ئەهلی سوننەوجەماعە :

بەراست زانینی کەڕامەتی وەلیەکانە ، کە زۆر جار خوای گەورە وەك یاسایەکی سەیر و نەریت شکێن ( خارق العادة ) لەسەر دەستی هەندێ لە پیاو چاکانی خۆی ڕودەدا، وەك خەلات و ڕێزو ( إكرامية ) یەك بە بەندە چاکەکانی خۆی دەبەخشێ [134] ، هەروەك لەسەر ئەوە بەڵگە لە قورئان و سوننتەوە هاتوە ، وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

أَلا إِنَّ أَوْلِيَاء اللّهِ لاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ {يونس/٦٢}

واتە : ئەی خەڵکینە ئاگادار بن ، بێ گومان دۆستانی راستەقینەو رەسەنی خوای گەورە ترسیان لەسەر نی یە ، وە خەمباروخەمناك نابن ، ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوە و لەخوا دەترسن ، لەژیانی دونیا و لە دوارۆژدا موژدەیان بۆ هەیە ، گۆرانکاری بەسەر وشەکانی خوای گەورەدا نایێ ، ئا ئەوە سەرکەوتنێکی گەورەیە

وە پێغەمبەر یش (ﷺ) دەفەرموێ :

( إن الله تبارك و تعالى قال : من عادى لي ولياً فقد آذنته بالحرب ) بخاري .

---

[134] وەلی : چەندەها جۆرو پلەوپایەی هەیە ، مەرج نیە خوای گەورە لەسەر دەستی هەموو وەلیەکی ، یا لەهەموو کاتێك شت رووبدات ، یا هەرکەسێك شتی لێ ڕوونەدا وەلی نەبێت . وەرگێر.

**واتە : خوای گەورە و دەسەڵاتدار دەفەرموێ : هەر کەسێ دوژمنایەتی دۆستێکی من بکا ، ئەوا مەیدانی لێخوازتووم وئیعلانی شەڕی لەگەڵدا کردووم [135]**

---

[135] کەرامەت : کارێکی نەریت شکێن (خارق العادة) یە ، بەڵام پەیوەندی بە تەحەدداو بە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی یەوە نی یە ، خوای گەورە لەسەر دەستی هەندێ لەو بەندانەی کە پەیوەستن بە خوای گەورەو حوکمە شەرعیەکان دەری دەخا ، وەك خەڵات و رێزلێنانێکی خوای گەورەیە بۆ بەندەکانی ، لەنەتەوە پێشینەکانیش رویداوە هەروەك لە سورەتی کەهف وهی تریشدا هاتوە ، وەلەسەردەمی ئەو ئۆممەتەش لە هاوەڵەکان و شوێن کەوتوانیان روویداوە ، هەروەك (عومەری کوری خەتاب) لەشاری مەدینەوە لەسەر مینبەر قسەی لەگەڵ سەرکردەیەکی سوپای سەحابەکاندا کرد کە لە نەهاوەند بوو، فەرمووی : ( یا سارية الجبل الجبل ) واتە : ئەی ساریە ی سەرکردەی موسڵمانان ئاگاداربە دوژمنەکان پشتیان لێگرتوون ، جگە لەوەش نمونە زۆرن ، هەروەك لەکتێبەکانی سوننە سەحیحەکان و ئاسارە نەقڵ کراوەکان شتی زۆر لەو کەرامەتانە هاتوون کەخوای گەورە لەو بارەیەوە هەزاران زانا و خەڵکی جێی متمانە ئەوەیان دیتوە و ئەو شتانەیان گێراوەتەوە ، کە شتێکی متەواتیر و مەوسوق و مەوجودە لەو ئۆممەتەو ، هەردەشێنێ تێیدا تا خوای گەورە حەزدەکا ، لە راستیدا رودانی کەرامەت بەدەست ناهێنێ ، ئەگەر بەبەرەکەتی بەدواکەوتنی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) خۆی نەبێ ، بەرۆیشتنی لەسەر ئەو رێبازو شەریعەتە نەبێ نابێ، ئەوەش لە رووی ئەقڵەوە کارێکی راست و دروستە ، چونکە خوای گەورە وەك بەخشینێك بەبەندە برواداڕەکانی خۆی دەدا ، لە رووی کردنەوەی دەروی ئاسۆی زانست لەبەردەمی ئەو پیاوانە کەلە هەموو ئەو ماددە شکێن ( خوارق العادية ) انە باشتر و گەورەترە ، کەگوێ مان لێ یان دەبێ یا لە بارەیانەوە دەخوێنینەوە ، وەیەکێك لەو کەرامەتانە کە پێشینەکانمان دەقیان لەسەر هێناوەتەوە بریتییە لە : خۆڕاگری و بەردەوام بوون لەسەر کتاب و سوننە و پەیرەوی لێ کردنیان و رازی بوون بەحوکم یان ، وەبریتییە لە سەرکەوتن لەزانست و کردار دا، وە پەیدا نە بوون رونەدانی کەرامەت لەهەندێ موسڵمان بەڵگە نی یە لەسەر لاوازی ئیمانیان ، چونکە کەرامەتیش لەبەر چەند هۆیەك روودەدا لەوانە: بۆ بەهێز کردنی بیرو

باوەڕی بەندە، بۆیە زۆر لە سەحابەکان هیچ شتێکیان نەدیتوە لەبارەی کرامەتەوە، چونکە بیروباوەڕ ویەقین یان زۆر تۆکمە و تەواوو بە هێزو پتەو بووە ، هەروەها کەرامەت بـۆ بـەرپا کردنـی بەڵگـە لەسەر دوژمـنان روودەدات ، وەنابێ تەنها لە رووی ئەقڵەوە کەرامەت بروای پـێ بکـرێ ، چـونکە کەرامات لەرووی شەرعی یەو بەندە بە چەندان رێککارو دیسپلینێکی شەرعی و ، چەند مـەرجێکی تایبەتی خۆی هەیە ، لەوانە : نابێ حوکمێکی شـەرعی و قاعیدەیـەکی دینـی حـەرام بکـا ، ئـەو کەرامەتە دەبێ بۆ زیندوان بێ نەك بۆ مردوان، دەبێ لەبـەر پێویسـتیەك بـێ ، ئەگـەر هـەرکاتێ کەرامات ئەو مەرجانەی تێدانەبوون ، کەرامات نی یە ، بەڵکو ئەندێشە ( خیال ) ە یا وێرنە ( وهم) یە یا لەشەیتان وەرگرتنە ، کەڕامات حوکمێك لە ئەحکامـەکانی شەرعی پێ ناسەلمێندرێ و کاری پێ ناکرێ ، وەهەروەها هیچ حوکمێکیشی پێ ڕەت و پوچەڵ ( نفي وباطل ) نابێتەوە ، چـونکە حوکمە شەرعیەکان سەرچاوە ناسراوەکانی خۆیان هەیە ، وەك ( قورئان و سوننە و إجماع و... هتد) جا ئەگەر خوای گەورە کەراماتێکی لەسەر دەستی موسڵمانێکی خواناسی خـۆی کـرد ، پێویسـتە لەسەر ئەو کەسە زۆر سوپاسی خوای گەورە بکات لەسەر ئەو خەڵات و بەخششەی کە پێی داوە ، وە دەبێ بیشارێتەوە و نابێ بیکاتە هۆکاری لوت بەرزیو خـۆیێ هەڵکێشـان لـە پـێش خـەڵکی ، چونکە ئەوە دووچاری گرفت و هەلاکەتی دەکا، وە چەندان خـەڵکی وا هەیـە کەشـەیتان پـەلکێش (إستدراج) ی کردوون کەچی ئەوان بە کەڕامەتیان زانیوە، پاشان بەهۆی ئەوەوە زەرەمـەندی دونیا و دوارۆژ بوونەو، بەسەرخۆیاندا شکاوەتەوە، بۆیە بزانن کە خوای گەورە لە چەندان ئایەتدا لە قورئانی پیرۆز باسی سیفەتەکانی وەلیەکانی خۆی کردوە کە هەندێ لەوانە لە سورەتی فورقـان لـە ئایـەتی (٦٣ – ٧٤) دا کۆبونەوەتەوە، هەروا پێغەمبـەرانی خوای گەورەش (سەلامی خوای گەورەیان لەسەر بێت ) باس لە هەندێ لەم سیفەتانە دەکەن ، بۆ وێنە وەك ( برو ا هەبوون بە خوا و فریشـتەکان و پێغەمبـەران و کتێبەکانی خوا و بە رۆژی دوایی و لە خوا ترسان و کارکردن بە سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) و خۆ ئامادەکردن بۆ رۆژی بە خوا گەیشتن ، وە خۆشویستن بۆ خوا و ڕق لێ بوونەوە بۆ خوای گەورە، وە لەسەر زەوی بە گران و ویقار دەڕۆن، وە ئەگەر نیقاش و قسەی ڕەقیان لەگەڵدا کـردن

سەلامیان لێ دەکەن، بۆ خوای گەورە لە ڕاوەستان و کڕنشدا دەمێننەوە، وە دەڵێن: ئـەی خوایـە سزای دۆزەخمان لەسەر لادە، وەکاتێ کە خێر دەکەن زێدە ڕۆیی و ڕژدی تیادا ناکەن، وە هاوبەش بۆ خوا پەیدا ناکەن، وە هیچ کەسێك بە ناهەق ناکوژن کە خوای گەورە حەرامو یاساغی کردوە، وە زینا و داوێن پیسی ناکەن ، وە گەواهی بە درۆ نادەن ، وە کاتێ کە بەلای کۆڕ و کۆبونەوەی چەقە و هەرا ( لغو) دا دەڕۆن، بەسەر پێ یی دەڕۆن و لەگەڵیاندا دانانیشن، وە کاتێ کە ئایەتەکانی خوایان لەلا دەخوێنرێ و بەبیریان دێتەوە بە کەڕوکوێری و بەبێ دەنگی بەسـەری دانـا ڕۆن، بـەڵکو بـیری لێ دەکەنەوە، وە لە نزا و پاڕانەوە یان دا دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان لە ژنەکان و لەبەرەو وەچەکانمان ، لەگلێنەی چاو ( قرة العين ) مان پێ ببەخشە، وە بمانکە بە پێشەوای ئیماندران و خواناسان... وە جگە لەوانەش چەندان سیفاتی تر لە قورئان و سوننەدا هاتوون .

[3] وە پێغەمبەریش (ﷺ) سەبارەت بە خەون دەفەرمووێ :

( الرؤيا الصالحة من الله والحلم من الشياطن ) بخاري .

واتە: خەونی چاك و ڕاست لە خواوەیە و، خەونی پڕ و وێوچ و تێکەڵ و پێکەڵ (أضغاث الأحلام) یش لە شەیتانەوەیە. وەرگێڕ.

[4] ئبن قودامـەی مـەقدیسی ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ : (جادوو: گرێدان و نوشتە و قسەکردنە کە قسەی پێ دەکەی، یا پێ ی دەنوسی ، یاکارێك دەکەی کە تەئسیری پێ لە لاشەی جاد و لێکراوەکە یاله دڵی یا لە ئەقڵی دەکـەی بـە ناڕاسـتەوخۆ، وە هەقیقەتیشـی هەیـە، بـۆ وێنـە: ئـی وا هەیـە دەکوژرێ، یا نەخۆش دەکەوێ، یا پیاو لە ژنی خۆی دەگیرێتەوە، لەگەڵی کۆنابێتەوە، نێـوان ژن و مێرد لێك دەکرێ، یەکێك رقی لە یەکێك دەبێتەوە، دووکەس زۆر یەکتر یان خۆش دەوێ و هەموو ئەوانە و چەندان کاری تری بەد بەهۆی سەحرەوە دەکرێن. وە ئیمامی شافیعی فەرموویەتی: مـاتو ساحر ئەو شتانەی تێدایە، کەوا تا فێربوون و فێرکردنی سەحر حەرامە، وە نەشمان زانیوە کەلە وەدا هیچ ڕاجیاییەك لە نێوان ئەهلی علم دا هەبێت ، وە ئەسحابەکانمان دەڵێن: ساحر بە فێربوون و بـە کردنەوەی بە کافر دادەنرێ، جا چ بە حەرامی بزانێ یـا بـە حـەلال، وە پاشـان لـە بـارەی راسـتی

ئەهلی سوننە چەند دیسپلین و ڕێککارێکی شـەرعی یـان هەیـە لـەرووی بەراسـت دانانی کەڕاماتی پیاوچاکان، چونکە هەموکارێکی لە نەریت بەدەر (خارق العادة) کەڕامات نیە ، بەڵکو زۆر جار پەلکێش کردن ( إستدراج ) ی شەیتانە ، یادەچێتە بازنەی نوشتەو کاری جادوگەری و شەیتان و دەججالەکان .
جیاوازی رونو ئاشکرا لە نێوان کەڕامەت و جادوگەری دا ( شعوذة ) چی یە .؟.

---

سەحرەوە گووتویانە: ئەگەر سەحر هەقیقەتی نەبایە، بۆ خۆی گەورە فەرمانی پیێ دەکردین خۆی لیێ دوربگرین، وەك خوای گەورە دەفەرمووێ :

فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِ بَيْنَ الْمَرْءِ وَزَوْجِهِ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ بِإِذْنِ اللّهِ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلاَ يَنفَعُهُمْ {البقرة/١٠٢} . بنوارە كتێبی مغنی/ بەرگی ٨ / ل ١٥٠.
واتە : هەندێ کەس لەو دووفریشتەی بابل فێری شتێك بوون کە ژن و مێردیان لێك جیا دەکردەوە کە بریتی بوو لە سیحر، ئەوانە( جادوگەران ) ناتوانن بەبێ روخسەت و خواستی خوای گەورە زەرەروزیان بە هیچ کەسێك بگێنن ، شتێك فێر دەبن زیانی هەیە ، هیچ سودو قازانجی نیە

[1] بیدعە: لێرەدا لەرووی شەرعی یەوە، بەشتێك دەگوترێ کە لە بـواری عەقیـدە و یاسـا دانـان ( تشریع ) ەوە تازە و داهێنراوە، نەك لە بواری مامەلەو داهێنانو کارگێڕی و خزمەتگوزاری و ... هتدەوە، بە مەرجێ کە پێچەوانەی شەرع نەبێ، بەو بیدعەیە دانانرێ، ئیتر بـواری رونکردنـەوەی زیاترمان نی یە. وەرگێڕ.
٢ وەك خودای گەورە دەفەرمووێ :
﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا﴾ (المائدة : ٣)
واتە: ئەمرۆ رۆژێکە کە (من) ئایینی ئێوەم بۆ ئێوە تەواو کردوە، بۆیە پێویست بە قسە و خستنە سەر ( إضافة ) ی هیچ کەسێکی تر ناکات ، تا لەسەری زیاد بکەن، وەرگێڕ.

**کەرامەت : بەهۆی گوێڕایەڵی و لەخواترسان و خواپەرستی پەوەدەبێ ، تایبەتـە بەخەڵکی خۆڕاگر و هۆگر بەئیسلام ، وەك خوای گەورە دەفەرموێ :**

**وَمَا كَانُواْ أَوْلِيَاءهُ إِنْ أَوْلِيَآؤُهُ إِلاَّ الْمُتَّقُونَ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ {الأنفال/٣٤}**

**واتە : وەلیەکانی خوای گەورە تەنها ئەو کەسانەن کە لەخوای گەورە دەترسن وئەو دەپەرستن ، بەلام زۆربەیان ئەوە نازانن .**

**شەعوەزە : بەهۆی کاری خراپ و گوناه و تاوان و بێ باوەڕی ڕوودەدا ، وەك خوای بێ هاوتا دەفەرموێ :**

**وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ {الأنعام/١٢١}**

**واتە: بێگومان شەیتانەکان نیگاوسروش ( وحي ) بە گوێ ی دۆستەکانیاندا دەکەن و شتی نهێنی یان فێر دەکەن، بۆ ئەوەی قسـە و گفتوگۆ لەگـەل ئێـوەدا بکـەن و بەسەرتاندا زاڵ بن، جا ئەگەر ئێوە بەوان بڕوا بکەن و بە گوێ یان بکەن ، بەڕاستی ئێوە دەبنە هاوبەش پەیداکەر ( مشرك )**

**ئەهلی سوننە و جەماعـە: هـەرگیز پیاوچـاکان بەسـەر پێغەمبەرانـدا ( علیهم السلام ) هەڵنابژێرن ، بەلکو لای ئەوان پێغەمبەرێك سەلامی خوای گەورەی لەسەر بێ ، لە هەموو پیاوچاکان باشترە**

**وەك خودای گەورە دەفەرمووێ :**

**اللَّهُ يَصْطَفِي مِنَ الْمَلَائِكَةِ رُسُلًا وَمِنَ النَّاسِ {الحج/٧٥}**

**واتـە: خـوای گـەورە پێغەمبـەران لـە فریشـتەکان و لـە خـەلکی سـەرگۆی زەوی هەڵدەبژێرێت.**

**ئەهلی سوننە و جەماعـە:** خەونی چـاکە ( رؤیـا الصـالحة ) کـە بـە شـێکە لـە پێغەمبەرایەتی ( نبوة ) و، دوربینی ( فراسة ) ی ڕاستی پیاو چاکان ، بە هەق و بە ڕاستی دەزانن .

وەك خوای گەورە لەسەرزاری حەزرەتی یوسف علیە السلام دەفەرمووێ :

{ إِذْ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَا أَبتِ إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِي سَاجِدِينَ {٤} قَالَ يَا بُنَيَّ لاَ تَقْصُصْ رُؤْيَاكَ عَلَى إِخْوَتِكَ فَيَكِيدُواْ لَكَ كَيْدًا إِنَّ الشَّيْطَانَ لِلإِنسَانِ عَدُوٌّ مُّبِينٌ {٥} وَكَذَلِكَ يَجْتَبِيكَ رَبُّكَ وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأْوِيلِ الأَحَادِيثِ وَيُتِمُّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ وَعَلَى آلِ يَعْقُوبَ كَمَا أَتَمَّهَا عَلَى أَبَوَيْكَ مِن قَبْلُ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْحَقَ إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ {٦} لَّقَدْ كَانَ فِي يُوسُفَ وَإِخْوَتِهِ آيَاتٌ لِّلسَّائِلِينَ {يوسف/٧}

واتە : کاتێك کە حەزرەتی یوسف علیە السلام بە حەزرەتی یەعقوبی باوکی گوت سەلامی خوای گەورەی لەسەر بێت ، ئەی باوکی بەڕێزم من لە خەومدا بینیم کە یازدە ئەستێرە و مانگ و رۆژ کڕنۆشیان بۆ دەبردم ، حەزرەتی یـەعقوبیش علیـە السلام لە وەلامیدا بە حەزرەتی یوسفی کوری گوت : ئەی رۆلەکەم خەونەکەت لای براکانت مەگێڕەوە ، مەبادا ئیرەییـت پـێ ببـەن وپـیلان و فێلێکـت لـێ بکـەن ، دوچـاری دەردو بلایـەکت بکـەن ، چـونکە شـەیتان دوژمنێکـی سەرسـەخت و ئاشـکرایە بـۆ ئینسـان ، هەمیشـە ئینسـان لـە خشـتە دەبـات ، بـەو شـێوەیە پەروەردگارت بۆ پێغەمبەرایـەتی هەلتدەبـژێرێت ، وەفێـری لێکدانـەوەی خـەونت دەکـات ، وە نـازو نیعیمـەتی خـۆی بەسـەر تـۆدا ، وەبەسـەر وەچـە و نـەوەکانی یەعقوبیش تەواو دەکات ، هەروەك نازو نیعمەتەکانی خۆی بەسەر باب و باپیرانتدا

تەواو کرد لە پێش حەزرەتی ئیـبراهیم و حـەزرەتی ئیسـحاق ، پـەروەردگارت زۆر زاناو دانایە ، بەراستی لە ژیـان و چیرۆکی حـەزرەتی یوسـف و براکانیـدا بەلگـە ونیشانە و پەندو ئامۆژگاری زۆر هەن بۆ پرسیارکەران .

وە خوای گەورە لەسەرزاری حەزرەتی ئیبراهیم علیه السلام دەفەرمووێ :

قَالَ يَا بُنَيَّ إِنِّي أَرَى فِي الْمَنَامِ أَنِّي أَذْبَحُكَ فَانظُرْ مَاذَا تَرَى قَالَ يَا أَبَتِ افْعَـلْ مَـا تُؤْمَرُ سَتَجِدُنِي إِن شَاء اللَّهُ مِنَ الصَّابِرِينَ {الصافات/١٠٢}

واتە: دوای ئەوەی کە ئیسماعیلی کـوڕی پێغەمبـەر إبـراهیم ( علـیهم السـلام ) لەگەڵ باوکی دا گەیشتە هەرەتی هەوڵ و لاوێتی ، رۆژێ حەزرەتی ( إبراهیم ) ی باوکی پێ ی فەرموو: ئەی رۆلەکەم من لە خەومدا دیتم کە سەرت ئەبڕم ، سەیرکە ئاخۆ تۆ لەو بارەیەوە چی دەڵێیت؟ ، إسماعیلیش وتی: ئەی باوکە ئەوە جێ بە جێ بکە کە فەرمانت پێ کراوە، ئەگەر خوا بیەوێ لە ئارامگران دەبم .

وە پێغەمبەریش (ﷺ) فەرموویەتی : (لم يبق من النبوة الا المبشرات )

واتە : لەبارەی پێغەمبەرایەتی یەوە هیچ شتێك نەماوە و کۆتایی پێ هاتوە، تەنها مزگێنی دەرەکان ماون، هەندێك گوتیان ئەو مزگێنی دەرانـە چـین؟ ، فـەرمووی (رؤيا الصالحة ) خەونی چاك و راستە (١)

وە هـاوەلی شـکۆدار ئـەبو دەرداء رەزاو رەحمـەتی خـوای گـەورەی لەسـەر بـێ لـە پێغەمبـەری خـوای گـەورەی پرسـی دەربـارەی فـەرموودەی خـوای گـەورە کـە دەفەرمووێ:

{ لَهُمُ الْبُشْرَى فِي الْحَياةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ {يونس/٦٤}

واتە : لەبارەی ژیانی دونیاو دوارۆژ هەوال و مزگێنی خێـرو خۆشـیان بـۆ هەیـە ئەمە مەبەستی لە چیە

**پێغەمبەری خوای گەورە ش (ﷺ) لە وەلامیدا دەفەمووی :**

**ما سألني أحد عنها غيرك منذ أنزلت ، هي الرؤيا الصالحة يراها المسلم ، أو ترى له . (صحيح سنن الترمذي) صحيح سنن الترمذي / للألباني .**

**واتە : لەوەتەی ئەم ئایەتە دابەزیووە ، جگـە لـەتۆ هـیچ کەسـێکی تـر پرسـیاری لەبارەیەوە لیّ نەکردووم ، ئەوە مەبەستی پیّ خەونی چاکە کە ئینسانی موسلمان دەیبینێت ، یا پێیەوە دەدیترێت .**

**ئەهلی سوننە و جەماعە** : بڕوایان وایە کە لە دونیادا جادوو و جادوگەری هەیە (۲) ، جا هەندیّ لەوانە بە ئاگاداری و بە روخسەتی خوای گەورە زیان و کاریگەریان بۆسەر ئینسان هەیە و ، هەندێکیشیان تەنها خەیال و ئەندێشە و ، نا هەقیقیین شەیتانەکانی جین پالپشتی و سەرخەری جادوو و جادوگەرین ، بەجۆریّ کە خـوای گەورە وەکو تاقی کردنەوە هێزو توانایەکی پێداون کە بە ئادەمیزادی نەداوە ، وەلیّ دەبیّ بزانین کە شەیتان و ئەجینەکان زەرەرو زیان بە هیچ کەسێك نـاگێنن بـە بـیّ روخسەت و توانای خوای گەورە ، ئـیتر هـەرکاتیّ جادوکـەر جادوەکـەی لـە ڕووی گالتەو کوفرکردن بە خوای گەورە توندترو تۆختر دەکاتەوە ، شەیتان زیاتریە گویّ ی دەکاو کاری پیّ دەکرێت . وەك خوای گەورە دەفەرمەرمووێ :

**وَاتَّبَعُواْ مَا تَتْلُواْ الشَّيَاطِينُ عَلَى مُلْكِ سُلَيْمَانَ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَانُ وَلَكِنَّ الشَّيْاطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ النَّاسَ السِّحْرَ وَمَا أُنزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَارُوتَ وَمَارُوتَ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّى يَقُولاَ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلاَ تَكْفُرْ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِ بَيْنَ الْمَرْءِ وَزَوْجِهِ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ بِإِذْنِ اللّهِ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلاَ**

يَنفَعُهُمْ وَلَقَدْ عَلِمُواْ لَمَنِ اشْتَرَاهُ مَا لَهُ فِي الآخِرَةِ مِنْ خَلاَقٍ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْاْ بِهِ أَنفُسَهُمْ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ {البقرة/١٠٢}

**واتە:** شەیتانەکان بێ باوەڕن و خەڵکی فێری جادوو و جادوگەری دەکەن . بەڵام ناشتوانن کە زیان بە هیچ کەسێك بگەینن، بەبێ ڕوخسەتی خوای گەورە، واتا ئەگەر خوا ویستی لەسەر نەبێ با ئەوانیش هەوڵ بدەن ، ناتوانن زیان بە هیچ کەسێك بگەیەنن.

ئەو (شەیتان و جنۆکانە) بەبێ فەرمانی خوای گەورە ناتوانن زیان بە هیچ کەسێك بگەیەنن، شتێك فێر بوونە کە هیچ سوودی بۆ ئەوان نی یە، بەڵکو زەرەرو زیانی بۆ ئەوان هەیە و زەرەریان پێ دەگێنێ .

وەخوای گەورە دەفەرمەرمووێ : وَجَاءوا بِسِحْرٍ عَظِيمٍ {الأعراف/١١٦}

**واتە :** حەزرەتی موسا سەلامی خوای گەورەی لەسەر بێت ، کاتێ کەلەگەڵ جادوگەرانی فیرعەون رووبەروو بوویەوە ، پێی گوتن : ئێوە سەحری خۆتان بکەن ، ئەوانیش سیحرێکی گەورەیان لە چاوی خەڵکەکە کرد

وەخوای گەورە دەفەرمەرمووێ :

فَلَمَّا جَاءَ السَّحَرَةُ قَالَ لَهُم مُّوسَى أَلْقُواْ مَا أَنتُم مُّلْقُونَ {یونس/٨٠}

**واتە :** کاتێ کە جادوگەرانی فیرعەون هاتن و رووبەرووی حەزرەتی موسا بوونەوە ، حەزرەتی موسا سەلامی خوای گەورەی لەسەر بێت پێی گوتن : ئێوە سەحری خۆتان بکەن ، ئەوەی لە لاتانە بیهاوێنە ساحەکە ، ئەوانیش ئەو سەحرەی لایان بوو هاویشتیانە عەردو ، سیحرێکی گەورەیان لە چاوی خەڵکەکە کرد

**ئەهلی سوننە و جەماعە** : بڕوایان وایە کە بەهۆی دوعاو نوشتەی شەرعی بەهۆی قورئان و سوننە بە روخسەتی خوای گەورە شیفا دەربارەی جادو لێکردن دێت چونکە قورانی پیرۆز شیفای تیایە .

وەخوای گەورە دەفەرمەرمووێ :

وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاء وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلاَ يَزِيدُ الظَّالِمِينَ إَلاَّ خَسَاراً {الإسراء/٨٢}

**واتە** : ئەو ئایەتانەی کە لە قورئانی پیرۆزدا بۆ ئێوە دادەبەزێنین ، هەمووی شیفاو چارەسەر و رەحمەتن بۆ دل و دەروون و لاشەی ئیمانداران لەبەر ئەوەی بڕوایان پێیەتی ، وەلێ : بۆ ستەمکارە خوانەناسەکان تەنها زەرەرن لەبەر ئەوەی بروایان پێ نیە

وەپێغەمبەری خوای گەورە ش (ﷺ) دەفەموێ :

اجتنبوا السبع الموبقات. واتە : خۆتان لە حەوت گوناهو تاوانە گەورەکان بپارێزن. سەحابەکانیش گوتیان ئەی پێغەمبەری خوای گەورە ئەوانە چین : ئەویش فەرمووی: الشرك بالله والسحر . بخاري ومسلم .

**واتە** : هاوبەشی پەیداکردن بۆ خوای گەورە و جادوو کردن .

هەرکەسێك بیرو باوەری وابێ جادوکردن بێ روخسەتی خوای گەورە سود یا زیان دەگێنێت ، کوفری کردووە

وەهەرکەسێك جادوکردن بە حەلال و رەوا بزانێ ، پێویستە بکوژرێت ، چونکە موسلمانان لەسەر حەرامێتی سەحر یەکدەنگن .

هەر کەسێ بڕوای وابێ کە جادوکەر (ساحر) سود یا زیان بە کەسێك دەگێنێ بە بێ ڕوخسەتی خوای گەورە، کوفری کردوە، وە هەر کەسێ کە بە حەلالی بزانێ، واجبە بکوژرێ، چونکە موسڵمان هەموویان لەسەر حەڕام بوونی سەحر کۆڕا و یەکدەنگن، چونکە جادوکەر دەبێ داوای تەوبەی لێ بکرێ ، ئەگەر تۆبەی کرد ئەگینا دەبێ لە گەردەنی بدرێو بکوژرێ .

**ئەهلی سوننە و جەماعە** : بڕوایان وایە کە ئێرەیی و چاولێدان هەقـە و هەیـە ، ئەگەر خوای گەورە بیەوێ دوچاری بەندەکانی دەبێت ، جاری واهەیە چاو لێدراو و ئێرەیی پێبراوەکە دەکوژێت .

وە بڕوایان وایە کە پێویستە ئینسـان بـە خـوای گـەورە و میهرەبـان ، بـە دوعـاو ئەزکاری شەرعی خۆیان لە شەڕو خراپەی چاو پیسی و ئێرەیی بپارێزێت .

بۆیە خوای گەورە دەفەرمەرمووێ : وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ {الفلق/٥}

واتە : خوایە بەتۆی کردگار خۆمان لە شەڕو خراپەی ئینسانی حەسود دەپارێزین کاتێ کە ئێرەیی بە خەلك دەباو ، چاوی پیسیان لێ دەدات .

وَإِن يَكَادُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَيُزْلِقُونَكَ بِأَبْصَارِهِمْ لَمَّا سَمِعُوا الذِّكْرَ وَيَقُولُونَ إِنَّهُ لَمَجْنُونٌ {القلم/٥١}

واتە : ئەی پێغەمبەر ﷺ خەریکە کەکافرەکان کاتێ گوێیان لە قورئانی خوای گەورە دەبێ لە حەسودی و پیسیان بە چاوەکانیان هەڵتخلیسکێنن و، دەڵێن محمد ﷺ شێتە

أَمْ يَحْسُدُونَ النَّاسَ عَلَى مَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ فَقَدْ آتَيْنَآ آلَ إِبْرَاهِيمَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَآتَيْنَاهُم مُّلْكًا عَظِيمًا {النساء/٥٤}

واتە : یا هەر ئەوەیە کەئێرەیی و بەخیلی بە خەلکی ئیماندار دەبەن لەسەر ئەو فەزل و بەخششەی کە خوای گەورەو میهرەبان پێیداون کە پێغەمبەری لە نێودا هەلبژاردوون ، بێگومان ئێمە کتێب و دانایی و دارو دەسەلاتێکی زۆرو گەورە و بەهێزمانمان بە خانەوادەو نەوەی حەزرەتی ئیبراهیم بەخشیووە

وەپێغەمبەری خوای گەورە ش (ﷺ) دەفەموێ :

العين حق ، ولو كان شيء سابق القدر سبقته العين ، واذا استغسلتم فاغسلوا مسلم .

واتە : چاوپیسی و چاو زارو چاو لێدان شتێکی راستە و بۆی هەیە ، ئەگەر هەر شتێك وەپێش قەدەری خوای گەورە بکەوتبایەو کاری تێکردبایە ، ئەوا چاوپیسی وەپێش قەدەر دەکەوت ، بۆیە ئەگەر ویستان خۆتان بشۆن ئەوا خۆتان لە چاو پیسی بشۆن .

وەپێغەمبەری خوای گەورە (ﷺ) دەفەموێ :

لا يجتمع في جوف عبد ، الايمان والحسد. الألباني .

واتە : دوو شت پێکەوە ، ئیمان و ئێرەیی پێبردن لە نێو دل و دەروونی ئینسانی ئیماندار دا کۆ نابنەوە .

**ئەهلی سوننە و جەماعە** : بڕوایان وایە کـە خـوای گـەورە شـەیتانە جنۆکـەکانی دروستکردووە، کە خوتخوتە دەخەنە ناو دڵ و دەروونـی ئادەمیزادەکـان و، هەمیشـە بۆیان لە بۆسەو سیپەدان و، خۆیان بۆیان دەکوتن، خوای گەورەش دەفەرمووێ :

﴿ وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ ﴾ {الأنعام/١٢١}.

واتە: بێگومان شەیتانەکان نیگاوسروش ( وحي ) بە گوێ ی دۆستەکانیاندا دەکەن و شتی نهێنی یان فێر دەکەن، بۆ ئەوەی قسـە و گفتوگـۆ لەگـەل ئێـوەدا بکـەن و بەسەرتاندا زاڵ بن، جا ئەگەر ئێوە بەوان بڕوا بکەن و بە گوێ یان بکەن ، بەڕاستی ئێوە دەبنە هاوبەش پەیداکەر ( مشرك ) .

وە خوای گەورە ئەو شەیتانانە زاڵ دەکا بەسـەر هەنـدێ لـەو بەندانـەی کـە خـۆی دەیەوێ . وەك دەفەرموێ :

﴿ وَاسْتَفْزِزْ مَنِ اسْتَطَعْتَ مِنْهُمْ بِصَوْتِكَ وَأَجْلِبْ عَلَيْهِم بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ وَشَارِكْهُمْ فِي الأَمْوَالِ وَالأَوْلادِ وَعِدْهُمْ وَمَا يَعِدُهُمُ الشَّيْطَانُ إِلاَّ غُرُوراً ﴾ {الإسراء/٦٤}.

واتە : هەرکەسێ لەوانـە دەتـوانی و پـێ یـان دەوەسـتی بـە دەنگـی خـۆت بیـان خڕۆشێنە، وە بە سوپای سوار و پیـادەت هانـا و بـەرگریان لێ بکـەو، لـە مـاڵ و منالّیاندا بەشداری بکە، وە بە لێن یان پێ بدە و بەوە هـەلیان خەڵەتێنـە، بـەلام ئاگادارین ( بەلێن ) ەکانی شەیتان تەنها فریودان و درۆ و دەلەسەیە.

وە بە پێچەوانەش، خوای گەورە هەندێ لە بەندەکانی خۆی، ئەوانەی دەیـەوێن لـە پـلان و فـڕو فێـڵ و گزیـەکانی شـەیتان دوریـان بخاتـەوە دەیـان پارێزێـت . وەك دەفەرمووێ :

﴿ إِنَّهُ لَيْسَ لَهُ سُلْطَانٌ عَلَى الَّذِينَ آمَنُواْ وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴾ {النحل/٩٩}.

واتە: بێگومان شەیتانی بـەد و نـەفرەت لێکـراو هـیچ دەسـەلاتێکی بەسـەر ئـەو بڕوادارانەدا نی یە کە هەمیشە دۆستی خـوان و پشـت بـە خـوا دەبسـتن ، بـەڵکو دەسەلاتی بەسەر ئەوکەسانەدا هەیـە کـە دۆسـتی ئـەون ، وەبەسـەر ئەوانـەی کـە هاوبەشی بۆ خوا پەیدا دەکەن و دژی خوان ، کە واتا دۆستی شەیتانن .

# بنچینە و بنەمای حەوتەم

## بنەمای ئەهلی سوننە و جەماعە
## لەبارەی سەرچاوەی لێ وەرگتن و بەڵگە پێ هێنانەوە

## ( ألاصل السابع )

## منهج أهل السنة و الجماعة في التلقي والإستدلال

# مەنهەج و بەرنامەی ئەهلی سوننە و جەماعە لەبارەی وەرگرتن و بەڵگە پێ هێنانەوە

## لە بنچینەکانی بیرو باوەری پێشینە چاکەکان ( ئەهلی سوننە و جەماعە ) لەبارەی وەرگرتن و و بەڵگە هێنانەوە :

بریتییە : لە : بەدوا کەوتن و پەیڕەوی کردنی هەرچیەکی کەلە قورئان و فەرموودەی راستەوە هاتوە ، لەرووی ئاشکراو نادیار ، وە بریتییە لە خۆ بەدەستەوە دانـی ئـەو دوو سەرچاوانە کە قورئان وسوننەتن ، وەك خوای گەورە دەفەرمویٚ :

وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُّبِينًا {الأحزاب/٣٦}

واتە : هیچ پیاو و ئافرەتێکی ئیماندار بۆیان نیە ئەگەر خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بڕیارێکیان دا ، قسە لە بریارو فرمـانی ئەوانـدا بکـەن و ، سـەبارەت بـە بریـارو فرمانی ئەوان سەرپشـكو یـاخیو سـەرپێچ بـن ، هەرکەسـێك بـە گـوێ ی خـواو پێغەمبەر (ﷺ) نەکاو ، سەرپێچیان لیٚ بکا، لە گومراییەکی ئاشکرا دایە

وەك پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێ :

( ترکت فیکم أمرين ، لن تظلوا ما تمسكتم بهما كتاب الله و سنة رسوله ) حاكم لە (مستدرك ) دا هێناویەتیەوە .

واتە : من دووشتم لە نێو ئێوەدا جێ هێشتوە ، ئەگەر دەستی پێوە بگـرن و پـێ یانەوە پابەندو پەیوەست بن هەرگیز گومڕاو سەرگەردان نـابن ، ئەوانـەش کتێبـی خوای گەورە و سوننەتی پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ.

وەرگێڕ : سوننە واتە رەوتو رێبازو فەرمودەکانی پێغەمبەرﷺ .

**ئەهلی سوننە و جەماعە** : نالێن کتابی خوا، پاشان سوونەتی پێغەمبەر، بەڵکو دەلێن: کتێبی خوا و سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) پێکەوە، چونکە سوننە لەگەڵ قورئان پێکەوە لکاون و لێك جوێ نابنەوە ، بۆیە خوای گەورە بەگوێ کردن پێغەمبەرەکەی (ﷺ) فەرز کردوە لەسەر موسڵمانان، وە واشی کردوە کە سوننەتەکەی ئەو ببێتـە ڕونکەرەوەی ئەو مەبەست و مانایەی خوای گەوە، کـە کۆچـکەر و پشـتیوانەکان لەسەری بوینە، بە تایبەتی جێ نیشینە چاك و سەر ڕاستەکان( خلفاء الراشدين)، وە پاشان بەدوای ڕێبازی ئەو سەردەمە چاك و ناوازە یە دەکەون کە یەکسەر لـە دوای ئەوانەوە هاتووە، وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ {النحل/٤٤}

واتە : ئەی محمد (ﷺ)، ئێمە قورئانمان بـۆ تـۆ نـاردووە تـا ئـەوەی کـە بـۆ ئـەوان دابەزیوە ، بۆ خەڵکیشی ڕون بکەنەوە ، بـەڵکو ئـەو خەڵکـە بـەهۆی ئـەوەوە بـیر بکەنەوە و تێ بگەن و بڕوا بێنن .

وە خوای گەورە دەفەرموێ :

وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَالَّذِينَ هُم بِآيَاتِنَا يُؤْمِنُونَ {الأعراف/١٥٦}

واتە : ڕەحمەت وبەرکەتی من هێندە زۆرو فراوانـە هـەموو شـتێکی گتـی زەوی و بوونەوەری گرتۆتەوە ، جا لێرە بەو لاوە بڕیـار لەسـەر ئـەو ڕەحمـەت و بەرەکەتـە دەدەم بۆ ئەو کەسانەی کە ئیمانـدارن و لـە خـوای گـەورە دەترسـن و زەکـات لـە سەروەت و سامانی خۆیان دەدەن لە پێناو خوای گـەورە ومیهرەبـان ، وە بـۆ ئـەو کەسانەی کە بڕوایان بە فەرمودەو بەڵگەو نیشانەکانی ئێمە هەیە .

وەك پێغەمبەر یش ( ﷺ) دەفەرموێت :

( عليكم بسنتي ، وسنة الخلفاء المهديين الراشدين تمسكوا بها، وعضوا عليها بالنواجذ واياكم ومحدثات الأمور ، فإن كل محدثة بدعة ، وكل بدعة ضلالة ، وكل ضلالة في النار ) سنن ابي داود/ الباني .

واتە: لەسەر تانە لەسە رێبازو رەوشتی من بن و پێ یەوە پابەندو پەیوەست بـن ، وە لەسەر تانە کە لەسەر رێبازی خەلیفە سەر راست و رێنمایی کراوەکانی من بن ، چونکە ئەو خەلیفانە دەستیان بە رێبازی منەوە گرتووە وپێیەوە پەیوەستن ، بۆیـە ددان و خرێنەکان ( نواجذ) تان لەسەر رێبازی منو ئەوان دابگرن و بەری مەدەن، ئاگادار بن لەکاری تازە و داهێنراو دوربن ، چونکە هەموو شتێکی تازەو داهێنراو و داهاتوو لەبارەی خواپەرستی و بیروباوەڕەوە بیدعیـە و، هـەموو بیدعیـەکیش سەرلێشوان و گومراییە .

وە پێغەمبەر ( ﷺ) دەفەرموێت :

( أوصيكم بأصحابي ، ثم الذين يلونهم ، ثم الذين يلونهم ) صحيح سنن الترمذي / للالباني .

واتە : ئاگادار بن ، ئامۆژاگاریتان دەکەم کەبەرانبەر بە هاوەڵـەکانی مـن بـاش و بەرێز بن و ، گاڵتەوو سوکایەتیان پێ نەکەن ، پاشان بەرانبەر بەو خەڵکانە باش و بەرێز بن کەبەدوای سەردەمی ئەوانەوە دادێن ، پاشان لەگەڵ ئەوخەڵکانە کەبەدوای ئەوانەوە دادێن .

وە عـبداللە ی کوری عـەمر رەزاو رەحمەتی خوای گەورەی لەسەر بێ دەفـەرمووێ : پێغەمبەر ( ﷺ) فەرموویەتی :

( تفرق أمتي على ثلاثٍ و سبعين ملةً كلهم في النار ، إلا ملة واحدة ).

واتە : ئۆممەتی من دەبێتە (٧٣) پارچە و کۆمەڵ ، لەوانە هەموویان لەناو ئاگرن (دۆزەخـین ) ، تـەنها یـەك کۆمـەڵ و میللـەت نـەبێ ، هاوەڵـەکان گوتیـان ئـەی پێغەمبەری خوای گەورە (ﷺ) ئەو کۆمەڵە کامەیە ؟ کەلەناوئاگرنی یە، فەرمووی:

( ما أنا عيله و أصحابي )[136]

واتـە : ئـەو سـوننەت و ڕێبازەیـە کـەمن و هاوەڵـەکانم لەسـەرینە بۆیـە دەسـتی پێوەبگرن.

بۆیە هەر لەو بارەیەوە سەرچاوەی بۆ گەڕانەوە ( مرجعية ) لەلای ئەهلی سوننە، لەکاتی پەیدا بوون و هاتنە کایەی هەرگێروگرفت و دوبەرەکی و کێشە و ناکۆکیەك، قورئان وسوننەیە، وەك خوای گەوورە لەو بارەیەوە دەفەرموێ :

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً {النساء/٥٩}

واتە : ئەی خەڵکینە بەگوێ ی خوای گەورەو پێغەمبەرەکـەی و ئـەو سـەرکردە و براگەورانە بکەن کەلە خۆتانن ، ئەگەر ئێوە بڕاواتان هێناوە بەخوای گـەورە و بـە ڕۆژی دوایی ، هەرکاتێ لەهـەر شـتێك دا نـاکۆکی و دوبـەرەکی تـان تێکـەوت ، بیگێڕنەوە لای خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ئەگەر ئێوە ئیماندارن ، چونکە ئەوە بۆ ئێوە باشترین شتە و خێری تێدایە .

هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) سەرچاوەی بۆ گەڕانەوەی ئەهلی سوننە و جەماعەن لە ڕووی تێگەیشتن لە قورئان و سوننەتەوە ، وەلای ئەوان لە قورئان و سوننەدا هـیچ

---

[136] صحيح سنن الترمذي و الباني .

شتێك تێك ناگیرێت و دژایەتیان نیە ، نەبە (قیاس نـە بـەزەوق نـە بـە کەشـف و کەرامەت ، نەبە گوتەی شێخێك نەبە قسەی پێشەوایەك) چونکە ئـاییـنی پـیرۆزی ئیسلام لە سەردەمی ژیانی پێغەمبەردا (ﷺ) تەواو بووە

وەك خوای گەورە لەو بارەیەوە دەفەرموێ :

وَمَن يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَى وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّى وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ وَسَاءتْ مَصِيراً {النساء/١١٥}

واتە : هەر کەسێ نەیارێتی پێغەمبەر (ﷺ) بکا ، دوای ئەوەی کە رێگای راست و دروستی بۆ رون بۆتەوەو ، بەدوای رێبازێك دەکەوێ کەجیایە لەهی ئیمانداران ، لە دونیادا رووی دەکەینە ئەو رووگەیەی کە رووی تێ کردوەو بەرەو ئەوێ ئاراستەو رێنمای دەکەین ، وەلە دوا رۆژیشدا دەیخەینە نێو دۆزەخەوە کە چارەنووسێکی زۆر سەخت و دژوارو سامناکە .

**ئەهلی سووننە و جەماعە** : قسە و رەیی هیچ کەسێك وە پێش فەرموودەی خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ناخەن ، لەبەرئەوەی خوای گەورە دەفەرموێ :

الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا {المائدة/٣}.

واتە: ئا ئەمڕۆ ئایینی ئێوەم بۆ ئێوە تەواوو تۆکمە کردوە ، وە نـاز و نیعمـەتی خۆشم تەواو بەسەر ئێوەدا دارشتوە ، وەبەوەش لێتان رازیم کەتەنها ئیسلام ئاین و رێبازی ژیان تان بێت .

وە خوای گەورە دەفەرموێ :

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ {الحجرات/١}.

واتە: ئەی ئەوکەسانەی کەبڕواتان هەیـە، وەپـێش خـواو پێغەمبـەر(ﷺ) مەکـەون (لەڕەی داندا) ، لەخوا بترسن ، خوای گەورە بیسەر و زانایە و ، ئاگای لەهـەموو شتێکە کە ئێوە دەیکەنو دەیلێن ، یـا لـە نێـو دڵو دەروونـی خۆتانـدا بـیری لـێ دەکەنەوەو پەنای دەدەن .

وە خوای گەورە دەفەرموێ :

أَفَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَهَهُ هَوَاهُ وَأَضَلَّهُ اللَّهُ عَلَى عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَى سَمْعِهِ وَقَلْبِهِ وَجَعَلَ عَلَى بَصَرِهِ غِشَاوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِن بَعْدِ اللَّهِ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ {الجاثية/٢٣}

واتە : ئایا نابینی ، ئایا نەتبینییوە ئەوکەسەی کە هەواو ئارەزووی خۆی لێ بۆتە خوای خۆی ، ئەوەندە بە گوێ ی دەکا دەیپەرستی ، لەبـەر ئـەوە خـوای گـەورەو میهرەبانیش ئەوکەسەی گومڕاو سەرگەردانکردووە ، چونکە خوای گەورە دەیزانی کە ئەو کەسە شایستەی ئەوەیە ، وە مۆری بێباوەری و بێدینی لەسەر گوێ و دلی داوە ، وە پەردەیەکی لەسەر چاوی داناوە ، جـا کـێ هەیـە لـەپاش خـوای گـەورە هیدایەتی بدات ، ئایا ئێوە بیرناکەنەوە و تێناگەن و پەند وەر ناگرن .

**ئەهلی سـووننە و جەماعـە** : دەزانـن ئەگـەر قسـەی خۆیـان وەپـێش هـی خـواو پێغەمبەرەکەی بخەن ، بێ بەڵگەو زانستە و، شەیتانە بۆیان ڕادەزێنێتەوە ، ئـەقڵی سەلیمو ساڵحو صریح لای ئەوان ئـەو ئەقڵەیـە کـە لەگـەڵ دەق و نـەقڵی راسـت و دروستدا کۆك بێ ، ئەگـەر گیروگرفـت و کـەم و کوڕەکیـان هـەبێ ، دەق و ئـەقڵ وەپێش گیرو گرفتەکە دەخەن ، چونکە هیچ کاتێـك نـەقڵ بەشـێوەیەکی ئەسـتەم (محال ) بەسەر ئەقڵ دا نایێ تا پێی قەبوڵ نەکرێ ، بەلکوبەو شێوەیە دێ کە ئەقڵ تیایدا سەرسام بێ ، چوونکە تێی ناگا یا لەئەقلی ئەو بەدەرە ، ئەقڵیش هەمیشە

ئەوشتە بەراست دادەنێ کە لەقورئان وسوننە هەواڵی پێ درابێ و هاتبێ نەك بە پێچەوانەوە

وەلەپلە و پایە ( شأن ) ی ئەقڵ کەم ناکەنەوە ، ئەگەر چی پێیان وایە ئەقڵ جێی کەم و کوڕی و تانە و تەشەر لێدانە ، بەڵام بار ( تکلیف ) ێکیشی لەسەرە بۆیە دەڵێن ، ئەقڵ هەرگیز وەپێش شەرع ناکەوێ ، تەنانەت لەمەو دواش هەرگیز دروستکراوەکان لە پەیامبەران بێ نیازو پێویست نابن ، بەلکو لەو بازنەیەکاردەکەن و دەخولێنەوە، هەمیشە خەلك پێویستی بە پێغەمبەران هەبووە ، سەلامی خوای گەورەیان لەسەر بێت ، تا پەیامی خوای گەورەیان پێبگێنن و ڕاستەڕێی ڕێبازی خوای گەورەیان بکەن ، بۆیە بەئەهلی سوننە ناودەبرێن چونکە تەواو بەدوای ڕێبازی پێغەمبەر (ﷺ) کەوتونەو پەیڕەوی تەواوو ڕەهای لێ دەکەن و خۆیان تەسلیمی کردوە ، وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

فَإِن لَّمْ يَسْتَجِيبُوا لَكَ فَاعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَاءهُمْ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِّنَ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ{القصص/٥٠}

واتە : ئەگەر وەڵامیان نەدایتەوەو داوەکەی تۆیان وەرنەگرت ، بزانە ئەوانە تەنها بەدوای هەواو ئارەزووی خۆیان کەوتوون و پەیڕەوی لێ دەکەن ، کێ لەو کەسەگومڕاو سەرگەردانو لاڕێ ترە کە بەدوای هەواو ئارەزووی خۆی دەکەوێ بەبێ ئەوەی کە لەلایەن خواوە ڕێنمایی کرا بێ ، بۆیە ئاگادار بن خوای گەورە ڕێنمایی گەلێکی ستەمکارناکا تا نەگەڕێنەوەسەر هیدایەت .

وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ {النور/٥١} وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَخْشَ اللَّهَ وَيَتَّقْهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَائِزُونَ {النور/٥٢}

**واتە : حوکم و بڕیارو هەڵوێست وقسەی ئیمانداران لەبەرانبەر پێغەمبەری خوای گەورەدا کاتێ کە بانگی لای خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکرێن بۆ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە کێشەکاندا حوکم یان لە نێواندا بکات ، تەنها ئەوەیە کە دەڵێن : ئەی پێغەمەری خوای گەورە گوێمان لێت بوو و بە گوێمان کردی ، شەرعی خوای گەورە چی دەڵێت جێ بەجێی دەکەین ، لەراستی دا ئەوانە سەر بەر زو سەر فرازن ، بۆیە هەر کەسێك بە گوێ ی خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی بکاو ، لە خوای گەورە بترسێ و پارێزکاری لێ بکات ، ئەو کەسانە سەربەرزو سەر فرازن .**

**ئەهلی سوننە و جەماعە : دوای کتاب وسوننە کار بەوە دەکەن و پشتی پێ دەبەستن کە زانایانی ئوممەت لەسەری کۆبونەتەوە ، وەپێغەمبەریش (ﷺ) فەرموویەتی :**

**( إن الله لا يجمع أمتي على ضلالةٍ ، ويد الله على الجماعة ، ومن شذ شذ في النار) سنن الترمذي / الباني .**

**واتە : خوای گەورە هەموو ئوممەتی من لەسەر گومرایی کۆناکاتەوە، دەستی خواش لەسەرووی کۆمەڵە ( لەگەڵ کۆمەڵە ) ، هەر کەسێ لەکۆمەڵ دەرچێ و ریز پەرِ بێ، بۆ ناو ئاگری دۆزەخ دەرچووە**

**ئوممەتی ئیسلامی لەسەر گومرایی و شتێکی پوچ و بێ هودە و وازهێنان لەحەق کۆنابێتەوە**

## ئەهلی سوننە و جەماعە :

بڕوایان وایە ئەو پاکی و بێ گوناهیەش جگە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ هیچ کە سێکی تر نیە ، بڕوایان وایە هەوڵ و کۆششـکاری ( إجتهـاد ) بـە پێـی پێویـست لەکارێکدا دەکەن کە شاراوەیە ، وێرای ئـەوەی دەمـار گیریشـیان بـۆ رەیـی هـیچ کەسێك نی یە تا قسەکانیان لەگەڵ قورئان و سوننەدا تەواو هاوتاوو کۆك نەبێت . بڕواشیان وایە کە کۆششکار ( مجتهد ) یش هەڵە دەکا و راستیش دەکا و دەپێکێ ، ئەگـەر راسـتی کـرد ، دوو پاداشـتی بـۆ هەیـە ، پاداشـتی ئیجتهـاد و پاداشـتی پێکانەکە ، ئەگەر هەڵەشی کرد تەنها یەك خێری بۆ دەنووسرێ .

خوای گەورە وەك رەخنەو تێبینی لەسەر هەندێ هەلوێستی ئیمانداران دەفەرموێ : وَإِذَا جَاءهُمْ أَمْرٌ مِّنَ الأَمْنِ أَوِ الْخَوْفِ أَذَاعُواْ بِهِ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى الرَّسُولِ وَإِلَـى أُوْلِـي الأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ الَّذِينَ يَسْتَنبِطُونَهُ مِنْهُمْ وَلَوْلاَ فَضْلُ اللّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ لاَتَّبَعْتُمُ الشَّيْطَانَ إِلاَّ قَلِيلاً {النساء/٨٣}

واتە : هەندێ لە ئیمانادران ، هەرکاتێ دەربارەی ئەمن وئاسایش و ترس و بیمەوە هەوالێکیان بۆ بێت ، بێ ئەوەی بیر لەسەر ئەنجامی بکەنەوە خێرا بلاوی دەکەنەوە ، وەلێ ئەگەر ئەو مەسـەلەیان بگێرابایـەوە لای پێغەمبـەری خـوای گـەورەو لای کاربەدەست و براگەورەکانیان کە لە خۆیانن‌و ، پرسیان پێ بکردبانایە ، ئەوکاتـە ئەو کەسانەی کە لە هەوال و نهێنیەکە باش تێدەگە یشتن و باش لێیان دەکۆلیەوە ، باش دەیان زانی کە ئەم هەوال و رازو نهێنی یە چیەوچۆنە ، ئـیتر ئەگـەر فـەزل و بەخشش ورەحمەتی خوای گەورەو میهرەبان نەبایە لەسەر تان ، تەنها کـەمێکتان نابایە دەنا هەرهەمو تان بەدوای شەیتان دەکەوتن

ئەگەر ئەو جیاوازیەی لەنێوان ئەواندا هەیە لەسەر مەسەلە ئیجتیهادیەکان بێ ، بەڵام لەسەر ئەوە دژایەتی و دوژمنایەتی یەکترناکەن و دەنگ لێك ڕاناگرن‌و پشت تێك ناکەن ، بەلکو بە پێچەوانەوە هەندێك هەندێکیان خۆش دەوێ و ، هەنـدێك پاڵپشتی هەندێکیانن‌و ، نوێژ لە پشت یەکتری دەکەن ، وێرای ئەوەی کە راجیایی ( إختلاف ) یان لەسەر چەند مەسەلەیەکی لاوەکی ( فرعی ) هەیە

وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً {النساء/٥٩}

واتە : ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان هەیە ، بەگوێ ی خوای گەورەو پێغەمبـەری خواو ئەو برا گەورە بڕیار بەدەستانە بکەن کە لەرووی ئاین‌و ئیمانەوە لەخۆتانن ، وەك خۆتـان ئیمانـدار و لەسـەر ئیسـلامن ، ئەگـەر لەسـەر شـتێك لێ تـان بویـە کێشەوناکۆکی بیگەڕێنەوە لای خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ ئەگـەر ئێـوە خۆتـان بـە موسلمان دەزانن‌و، بڕواتان بەخوای گەورەو بەرۆژی بـەرێ هەیـە ، ئـەوە بـۆ ئێـوە باشترە وخێری تێدایە

وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

إِنَّ الَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمْ وَكَانُواْ شِيَعًا لَّسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ إِنَّمَا أَمْرُهُمْ إِلَى اللّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ {الأنعام/١٥٩}

واتە : ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەوانەی کە ئایینی خۆیان پارچە پارچـە کـردو، بوونـە کۆمـەڵ کۆمەڵ، بڕوایان بە هەندێکی هەبوو و بڕوایان بە هەندێکی نـەبوو، تـۆ لـە

هیچ شتێکدا وەکو ئەوان نیت ، تۆ لـەوان بـەریت ، ئاگاداریـە کاروبـاروکردەوەی ئەوان دەگەڕێتەوە لای خوای گەورە بۆ ئەوەی تۆڵەیان لـێ بکرێتـەوە و ، لەسـەر ئەوە موحاسەبەیان بکرێت ، ئەوسا هەواڵیان پێ دەدرێت بەرانبەر ئەو بیرو باوەڕەی کە هەیان بووە و ئەو کاروکردەوەی کە کردویانە .

**ئەهلی سوننە و جەماعە** : هیچ کەسێك لە مسوڵمانان بەوە پەیوەست ناکەن کـە کۆت و پابەند بێ ڕێبازو بەمەزهەبێکی فیقهی دیاریکراو و کاری پێبکا ، هەروەها بەهیچی دانانێن ئەگەر لە ڕووی بەدواکەوتن و پەیڕەوی لێ کردنەوە بـێ نـەك لـە ڕووی لاسایی کردنەوە ( تقلید ) ی کوێرانە بێ ، [137] لەسەر مسوڵمانان پێویستە

[137] تەقلید : واتا چونە ژێر باری حوکمی شەرعی مەزهەبێك لە مەزهەبەکان ، یا بریتییە لە وەرگتنی قسەی کە سێك بەبێ ئەوەی کە بەڵگەکەی بزانێ ، یا گەڕانەوە بۆ سـەر قسـەی یـەکێك لـە قسـە کەرەکان کەبەڵگەی نیە .

مقلید: ئەو کەسەیە کە بەتایبەت لاسای کە سێك دەکاتەوە بەڵگەی بزانێ یا نا ، لەقسەی دەرناچێ ئەگەر پێچەوانەی ئەوەش بەڵگەی بۆ بهێنرێتەوە و بۆی بسەلمێنرێ ، هیچ ناکۆکیەك لەنێوان زانایان لەوە دانی یە کە دەڵێن : لاسای کردنەوە زانست نیـە ، بۆیـە لاسـاییکەرەوە (مقلیـد) یـش پێـی ناگوترێ زانا (عالم) ، خوای گەورەش لە زۆر ئایەتدا زەمی لاسایی کردنەوەی کردوە، وەك خـوای گەورە دەفەرموێ :

وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ إِلَى مَا أَنزَلَ اللّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ قَالُواْ حَسْبُنَا مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءنَا أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ شَيْئًا وَلاَ يَهْتَدُونَ {المائدة/١٠٤}

واتە: کاتێ کە پێیان دەگـوترێ وەرنـەلای ئـەو شـتەی کـە خـوای گـەورە نـازڵی کردوە و، وەرنـە لای پێغەمبەری خوا ، لەوەڵامدا دەڵێن : ئەوەی کە لە باوکەو باپیرانمانەوە بۆمان جێ ماوە و دەستمان کەوتوە

بەسەمانە و چیکە مان ناوێ ، ئەگەر چی باوکو باپیرانیش یان هیچ یان نە دەزانی و ڕێنمایی نەکرا بوون ، ئەگەر ئەوانە وابکەن ، لەسەر ڕێی ڕاست نین .

وە زانا پێشینە چاکەکان و پێشەوا کۆششکارەکان ( أئمة المجتهدين ) لاسایی کردنەوەیان قەدەغە کردوە، چونکە لاسایی کردنەوە هۆی لاوازی و ناکۆکی نێوان ڕیزەکانی موسڵمانانە، وە یـەکێتی و یەکبوونیش لەوەدایە کە خەڵکی لە کاتی دوبەرەکی و ناکۆکی بگەڕێتەوە لای فـەرموودەی خـوای گەورە و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) و تەنها پێڕەوی لەوە بکا، بۆیە نەمان دیت کە هاوەڵـەکان لاسـایی هیچ کەسێکی تایبەت و دیاریکراو بکەنەوە لە هەموو مەسەلەکاندا جگە لە خواو پێغەمبەر (ﷺ)، وە هەروەها هەر چوار پێشەواکانیش ڕەحمەتی خوایان لێ بێ دەمارگیریان تەنها بۆ ڕەییەکانی خۆیان نەبوە، بەڵکو لەبەر فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) وازیان لە ڕەییەکانی خۆیان دەهێنا، وە قەدەغەی ئەو کەسەشیان کردوەکە بەبێ زانینی بەڵگە بەدوایان بکەون ، هەروەك ئیمامی ئەبو حەنیفە دەفەرموێ :

( إذا صح الحديث فهو مذهبي ) .

واتە : ئەگەر هەر حەدیسێکی ڕاستتان دیت ئەوە لە مەزهەبی منە، واتا مەزهەبی من هیچ شتێکی تێدا نی یە کە پێچەوانەی دەقەکانی قورئان و سوننە بێ، وە دەڵێ :

( لايحل لأحد أن يأخذ بقولنا مالم يعلم من أين أخذناه ) .

واتە: بۆ هیچ کەسێ نی یە کە قسەی ئێمە وەربگرێ و کاری پێ بکا ماتو نـەزانێ لـە کـوێ مـان وەرگرتوە و هێناوە.

وە ئیمامی مالك دەفەرمووێ :

(منیش بەشەرم ، ڕاست دەکەم و هەڵەش دەکەم ، جا سەیری ڕەییەکانم بکەن ، ئەوەی کەکۆك بوو لەگەڵ کتاب و سوننە وەری بگرن ، ئەویش کە پێچەوانەی کتاب و سوننە بوو ، وەری مەگرن .

وە ئیمامی شافیعی دەفەرموێ :

( هەر مەسەلەیەك کە دەرکەوت کە پێچەوانەی فەرموودەی ڕاستی پێغەمبەر (ﷺ) گوتومە، من لێ ی پەشیمان و بەریم ، لە ژیانم و لە دوای مردنم ) .

کەلەمەزەبێکەوە بچێتە سەرمەزەبێکی تر لەبەر بەهێزی بەڵگە ، وەلەسەر قوتابی و داواکاری زانستیش پێویستە ، ئەگەر ئەو شایستەییەی هەبێ کە بەڵگەی پێشەواکانی پێ بناسرێ ، کاری پێ بکا ، بۆشی هەیە لەمەسەلیەکدا لەمەزەبی ئیمامێکی تردا بچێتەسەر مەزەبێکی ئیمامێکی تر ، لەبەر بەهێزی بەڵگەی ، یا قسەی کەسێك وەربگرێ بەبێ ئەوەی کە بەڵگە کەی بزانێ ، بەهۆی ئەوەوە دەبێتە لاساییکار ( مقلد ) ی کوێرانە، وەلەسەر یەتی بە پێ ی توانا چاوێك بەمەسەلەکان دابخشێنێ و بەڵگەکانی بزانێ ، تا لەم نێوانەدا شتێکی بۆ بەهێزتر دەبێ و بۆی دەرکەوێ ، جا ئەگەر نەی توانی لە نێوانیاندا تەرجیح بدا ، ئەوا حوکمەکەی وەکو گشتی ( عام ) لێ دێ ، ئەوسا پرسیار لە زانایان دەکا ، وە ئەو بۆرە پیاوە ( عامی و عوام ) یەی کەبە چاکی چاوبە بەڵگە داناخشێنێ ، هیچ رێبازگەیەکی نی یە ، بەڵکو مەزەبی ئەو مەزهەبی موفتیەکەیەتی ، بۆیە لەسەری پێویستە پرسیار لەو کەسانە بکا ، کەخاوەن زانستن و لەقورئان و سوننە شارەزان . وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

---

وە ئیمامی ئەحمەد دەفەرمووێ :

( بەدوای من مەکەون ، وە بەدوای مالك و شافعی و ئەوزاعی و سەوریش مەکەون ، بەڵکو لەو شوێنە وەرگرن کە ئەوان لێ یان وەرگرتوە) ، وە لەو بارەیەوە فەرموودەی ئەوانە زۆر و زەوەندە، چونکە ئەوانە لەمانای ئەو فەرموودەیەی خوا ی گەورە تێ گەیشتوون، کە دەفەرمووێ :

﴿ اتَّبِعُواْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ وَلاَ تَتَّبِعُواْ مِن دُونِهِ أَوْلِيَاء قَلِيلاً مَّا تَذَكَّرُونَ {الأعراف/٣} ﴾

واتە: بەدوای ئەوە بکەون کە لە خوای گەورەوە بۆ ئێوە نازل بوە، جگە لەوە بەدوای هیچ شتێکی تر مەکەون و مەیکەن بە دۆست و خۆشەویستی خۆتان ، چونکە جگە لە قورئان و سوننە بە بیروباوەڕ نایێتەوە و پەیڕەوی لێ ناکرێ .

فَاسْأَلُواْ أَهْلَ الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ {النحل/٤٣}

واتە ئەگەر شـتێکتان نـەزانی ئاگـادار بـن لـە خۆوە ( بـەبێ بەڵگـە ) مـەیلێنو مەیکەن، بەڵکو پرسیار لەخەڵکی خـاوەن زانسـتو زانیـاری بکـەن،تافێری بـن و لەسەر ڕۆشنایی بن.

**ئەهلی سوونته و جەماعە** بەدوا کەوتنی روخسەت بە بێ بەگەی شەرعی بە هێز یا لاساییکردنەوەی زانایەکی بڕوا پێکراو بە دروست و ڕەوا نازانن .

**ئەهلی سوونته و جەماعە** دەلێن بێگومان شارەزابوون لە ئایین دا بەبێ زانست و کردار (علم و عمل) پێکڤە نەبێ نابێ ، راستیش نابێ ، بۆیە هەرکەسێك ئەگەر زانست و زانیاریەکی زۆری پەیدا کرد ، بەلاّم کاری پێ نەکرد، یا بـەدوای ڕێبـازو ڕێنمایی پێغەمبەر (ﷺ) نەکەوتووە و، کاری بە سوونەتی ئەو نەکروە ، ئەو کەسە شارەزاو شەرعزان ( فقیە) نیە و بە شوێن کەوتەی پێغەمبەرﷺ دانانرێت .

وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

یَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ {الصف/٢} كَبُرَ مَقْتًا عِندَ اللَّهِ أَن تَقُولُوا مَا لَا تَفْعَلُونَ {الصف/٣}

واتە : ئەی ئیمانداریـنە ، بۆ ئەوە دەلێن کـە نایکـەن ،گـەورەترین گونـاهو تـاوان لەلای خوای گەورە ئەوەیە کە شتێك بۆ خۆت بلێ یت بەلام بۆ خۆت نەیکەیت .

یا دەفەرموێ : أَتَأْمُرُونَ النَّاس بِالْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ الْكِتَابَ أَفَلاَ تَعْقِلُونَ {البقرة/٤٤}

واتە : ئایا فرمان بەخەلك دەکەن کە کاری چاك بکەن ، بەلام خۆتان لەبیر دەکەن و نای کەن ، تاکەی ئاقل نابن .

**ئەهلی سووننە و جەماعە** : بە پێ ی توانـا وەرگـرتن و شـوێنکەوتنی زانسـت و زانیاری شەرعی و بەسود بە واجب و پێویست دەزانن لەسەر هەموو موسڵمانێك ، ئەو زانست و زانیارییەی کە ئینسان خوای خۆی و ئاینەکەی پێ دەناسێت ، چونکە زانست و زانیاری شەرعی شتێکی گرنگە . بۆیە خوای گەورە دەفەرموێ :

قُلْ هَـلْ يَسْـتَوِي الَّـذِينَ يَعْلَمُـونَ وَالَّـذِينَ لَـا يَعْلَمُـونَ إِنَّمَـا يَتَـذَكَّرُ أُوْلُـوا الْأَلْبَـابِ {الزمر/٩}

واتە : ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بە خەڵك بڵێ ئایا ئەو کەسانەی دەزانن و ئەو کەسانەی نازانن وەکو یەکن ، بێگومان وەکو یەك نـین . ئـەو کەسـانەی کـە بیردەکەنـەوە و تێدەکەن خاوەن ئەقڵەکانن .

وە خوای گەورە دەفەرموێ :

إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَى مِـن بَعْـدِ مَـا بَيَّنَّـاهُ لِلنَّـاسِ فِـي الْكِتَابِ أُولَئِكَ يَلعَنُهُمُ اللّهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ {البقرة/١٥٩}

واتە : ئەو کەسانەی کە ئەوەی دامان بەزاندووە لە و قورئانە رونکەرەوەو بەلگەدارو رێنماییی کەرەی کە ناردومانەتە خوارەوە دەیشارنەوە دوای ئەوەی کە لە پەرتوکی خوای گەورەدا بۆ خەڵکی روونمان کردۆتـەوە ، خـوای گـەورە و نـەفرەت لێکـەران نەفرەت لەوکەسانە دەکەن .

# بنچینە و بنەمای هەشتەم

# پێویستی پەیڕەوی کردنی
# سەردارانی فەرمان بەچاکەکردن

# ( الأصل الثامن )

# وجوب طاعة ولاة الأمر بالمعروف

# پەیڕەوکردنی ئەو سەردارانەی
# فەرمان بەچاکە دەکەن واجبە
# ( وجوب طاعة ولاة الأمر بالمعروف )

لە بنچینەکانی بیرو باوەری پێشینە چاکەکان ، ئەهلی سوننە و جەماعە : ئەوەیە کە بەگوێی ئەو سەردارو کار بەدەستانە بکرێ کـە لـەخۆتانن، کاروبـاری مسوڵمانان بەرێوەدەبەن ، بـەگوێکردنیان واجبـە ، ماتوفـەرمان بـەگوناهکردن و سەرپێچی فەرمانەکانی خوای گەورە نەکەن ، ئەگەر فرمانیان بەئەنجامدانی گوناهو تاوان کرد ، نابێ بە گوێ یان بکرێ ودروست نیە ، چونکە بە گوێکردن تەنها لـە خێروچاکەو شەرعی (معروف) یە[١٣٨] ، خوای گەورەش دەفەرموێ :

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً {النساء/٥٩}

---

[١٣٨] وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ :

( إنما الطاعة في المعروف ) بخاري .

واتە : بە گوێکردن لە چاکەولەشەرعە ، نەك لەگوناهو تاوانو خراپەو لە ناشەرعی

وە دەفەرموێ :

( لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق ) مصنف ابن أبي شيبه /ج ١ ، ص ٥٤٥ ، رقم / ٣٣٧١٧.

واتە : گوێڕایەڵی دروستکراوەکان ناکرێ ، ئەگەر پێچەوانەی بڕیارەکانی خوای کردگاربێت .

وە دەفەرموێ :

( لا طاعة في معصية ) بخاري .

واتە بەگوێکردنو گوێڕایەڵی لە گوناهو تاواندا نی یە

واتە : ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان هەیە ، بەگوێ ی خوای گەورەو پێغەمبـەری خواو ئەو برا گەورە بڕیار بەدەستانە بکەن کە لەرووی ئاین‌و ئیمانەوە لەخۆتانن ، وەك خۆتـان ئیمانـدار و لەسـەر ئیسـلامن ، ئەگـەر لەسـەر شـتێك لێ تـان بویـە کێشەوناکۆکی بیگەڕێنەوە لای خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ ئەگـەر ئێـوە خۆتـان بـە موسلمان دەزانن‌و، بڕواتان بەخوای گەورەو بەرۆژی بـەرێ هەیـە ، ئـەوە بـۆ ئێـوە باشترە وخێری تێدایە

وە پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێ :

( من أطاعني فقد أطاع الله ، ومن عصاني فقد عصى الله ، ومن يطع الأمير فقد أطاعني ، ومن يعص الأمير فقد عصاني ) متفق عليه .

واتە : هەرکەسێك بە گوێی من بکات ، بەگوێی خوای گەورەی کـردووە، کەسـێك بەگوێی من نەکا بە گوێی خوای گەورەی نەکردووە، کەسێك بە گوێی فەرمانـدەو براگەورەکەی خۆی بکات ، بەگوێی منی کـردووە، کەسـێك بـەگوێی فەرمانـدەو براگەورەکەی خۆی نەکا ، بە گوێی منی نەکردووە

وە دەفەرموێ : ( اسمعوا وأطيعوا، وان استعمل علـيكم عبـد حبشـي كـان رأسـه زبيبة) بخاري .

واتە: گوێڕایەلی و فەرمانبەری برا گـەورە کـەتان بکـەن بـا بەندەیـەکی حەبەشـی فەرمانتان بەسەردا بکاو ببێتە برا گەورەتان، کە سەری وەك مێوژە رەش وابێ[١٣٩]

---

[١٣٩] . وە لە فەرمودەیەکی تریدا دەفەرموێ :

(... ولا تنازعوا الأمر اهله ولو كان عبداً أسود) المستدرك على الصحيحين. ج١، ص١٧٥، رقم ٣٣٠. وەرگێڕ.

وە دەفەرموێ : ( تسمع وتطيع للأمـير، ،وإن ضـرب ظهـرك واخـذ مالـك، فـاسمع واطع) مسلم .

واتە: بە گوێی برا گەورە دەکرێ و پەیڕەوی لێ دەکرێ، با لە ( پشت ) یشت بدا، با ماڵ و دارایيت لێ وەربگرێ، هەر بە گوێی بکە و پەیڕەوی لێ بکە.

وە دەفەرموێ : ( من کرە من أمیرە فلیصبر علیە، فإنە لیس احد من النّاس، من خرج من السلطان شبراً، فمات علیە، إلا مات میتة جاهلیة ) مسلم .

واتە: ئەگەر کەسێك شتێکی لە برا گەورەکەی خۆی دی کە پێی ناخۆش بـوو، بـا سەبری لەسەر بگرێ ، سەرەخەری‌و سەرپێچی نەکا، ئابڕوی نـەبا ، هـەر کەسـێك بستێك لە فـەرمان و دەسـەڵاتی بـرا گـەورە دەربچـێ و، لەسـەر ئـەوە مـرد، بـە مردنێکی نەفامی مردوە، واتا لەسەر نەفامی مردوە [140]

---

واتە : لەبەرانبەر خەڵکی شایستەو شەرعی ململانێ‌و ناکۆکی مەکەن ، ئەگەر بەندەیەکی رەشیش براگەورەتان بێت ، کاروفرمان‌و دەسەلاتی لێ دامەمالن .

[140] . وە دەفەرموێ :

( من رأی من امیرە شیئاً یکرهە فلیصبر ) صحیح البخاری .

واتە: ئەگەر هەر کەسێك لە ئێوە شتێکی لە فەرماندە و براگەورەی خۆی دیت کە پێی ناخۆش بوو با سەبری لەسەر بگرێت .

وە دەفەرموێت : ( من خرج من سلطان شبراً مات میتة جاهلیة )

واتە: هەر کەسێك بەقەد بستێك لە برا گەورەکەی خۆی دەربچێ و هەڵگەڕێتـەوە، بـە مردنێکی نەفامانە مردووە.

وە دەفەرموێ : ( من فارق الجماعة شبراً فمات إلا مات میتة جاهلیة ) بخاری .

بۆیە فەرمانبەرێتی و بەگوێ کردنی برا گەورە لە چاکە و شەرعدا، بنچـینەیەکی گەورە و شکۆدارە لە بنچینەکانی خەڵکی سوننە و جەماعە، پێشەوا پێشینەکان لە کورتەی بیروباوەڕدا ئەومیان دەرز و تۆمار کردوە، کەم کتێب لە کتێبەکانی بیرو باوەڕەکان ( عقائد ) لەو بابەتە چۆڵن ، بەڵکو ئـەو بابەتـە یـان هـەر نـاوبردوە و رونیان کردۆتەوەو لێکیان داوەتەوە، چونکە ئـەو بابەتـە بـۆ هـەموو موسـڵمانێك فەرزێکی شەرعییە، وە کارێکی بنچینەییە بۆ بەدیهێنانی توند و بەندیو دیسپلینو رێککاری ( إنظباط ) لە دەوڵەتی ئیسلامیدا.

ئەهلی سوننە و جەماعە: کۆبونەوە و نوێژ و جەژنەکان کردن لـەدوای ئـەو بـرا گەورانە بە پێویست دەزانن ، وە فەرمان کردن و رێگرتن لە خراپە و حەج و جیهاد کردنیان لەگەڵ دەکرێ ، چ چاك بن یا خراپ و گوناهبار بن ، وە دەبێ دوعای چاکە و راست بوونەوە و خۆراگریان بۆ بکرێ ، دەبـێ ئامۆژگاریـان بکـرێ ، ئەگـەر بـە ئاشکرا باش بن ، وە ئەگەر سەرپێچی (مخالفة) یەکی جگە لە کوفریش یـان کـرد نابێ بە شمشێر بۆیان دەربچن و شەڕیان لەگەڵدا بکەن .

بەڵکو دەبێ لەبەر فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ) سەبریان لەگەڵدا بگیرێ و بەگوێیان بکرێ لـە غـەیری تـاوان نـەکردن ( معصـیة )، مـاتو کـوفری ئاشـکرا و گـەورە

---

واتە: هەر کەسێك بەقەد بستێك لە کۆمەڵەکەی خۆی جیا بێتەوە و هەڵگەڕێتەوە ، ئەگەر مرد، بە مردنێکی جاهیلانە دەمرێت. وەرگێڕ.

وە دەفەرموێ: ( من حمل علینا السلاح فلیس منا ) بخاری .

واتە : هەر کەسێ چەك لەدژی موسڵمانان هەڵگرێو لەگەڵیاندا بجەنگێ ، لە ئۆممەتی ئێمەو لەسەر رێبازی ئێمە نیە . وەرگێڕ .

( بواح ) یان لێ بەدی ناکرێ، وە لەبەر بەرپابوونی ئاشوب و ئاژاوە نابێ شەڕیان لەگەڵدا بکرێ ، بەڵکو شەڕ لەگەڵ کەسانێ دەکرێ کە ئۆممەت پارچە پارچە و کەرت دەکەن ، دوای ئەوەی کە هەموو یەك پارچەیە

وە پێغەمبەری خوای گەورەیش (ﷺ) دەفەرمووێ :

( خیار أئمتكم الذين تحبونهم ويحبونكم، ويصلون عليكم وتصلون عليهم....وشرار أئمتكم الذين تبغضونهم ويبغضونكم وتلعنونهم ويلعنونكم ) مسلم .

واتە : باشترین پێشەواکانتان ، ئەوانەن کە ئێوە ئەوانتان خۆش دەوێ و، ئەوانیش ئێوەیان خۆش دەوێن ، نوێژتان لەسەر (تەرم) دەکەن ، (واتە ئەوەندە باش و شیاون)، وەخراپترین و بەدترین پێشەواکانتان ئەو پێشەوایانەن کە ڕقیان لە ئێوە دەبێتەوە و، ئێوەش ڕقتان لەوان دەبێتەوە

وە نەفرەتیان لێ دەکەن و نەفرەتتان لێ دەکەن ( واتە هێندە خراپ و بەدکارن ).

یەکێك گووتی : ئەی پێغەمبەری خوا جا شمشێریان لێ هەڵنەکێشین و بەشمشێر هەڵیان نەپەرێنین ؟ ، فەرمووی :

( لا ، ما أقاموا فيكم الصلاة ، وإذا رأيتم من ولاتكم شيئاً تكرهونه، فاكرهوا عمله ولا تنازعوا يداً من طاعة ). مسلم .

واتە : نەخێر وایان لێ مەکەن ، ماتو نوێژتان لەنێودادەکەن ،ئەگەر شتێکی خراپ و ناشەرعیتان لە براگەورەکانتان دیت ، وەکاتێ کە دەیان بێزێنن ، شتێك لە براگەورەکانتان دەبینن و پێتان ناخۆشە ، بیانبێزێنن و پێتان ناخۆش بێ ، ڕقتان لە کردارە بەدەکانیان ببێتەوە ونەك لە خۆیان ، دەستی خۆتان لێ یان دامەماڵن وسەرپێچی یان نەکەن ، بەڵکو هێشتا پەیرەویان لێ بکەن . وەدەفەرموێ :

( إن يستعمل عليكم أمرا فتعرفون و تنكرون ، فمن كره فقد بريء ، ومـن أنكـر فقد سلم ، ولكن من رضي و تابع ) .

واتە : بێ گومان پێغەمبەر (ﷺ) چەند برا گەورەیەك لەسەر ئێـوە دادەنـێ ، کـە دەیاناسن ودەیان بێزێنن و رقتان لێ یان دەبێتەوە ، ئەوەی پێی ناخۆش بـێ ئـەو کەسە پاکە و، ئەوەی کە رقی ببێتەوە ، ئەو کەسە ساغ و سەلامەتە ، سەحابەکان گوتیان :

( يارسول الله ألا نقاتلهم ) ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایا شەڕو جەنگیان لەگەڵدا نەکەین ؟ فەرمووی : ( لا ما صلو) نەخێر شەڕیان لەگەڵدا مەکەن ، لەبەر ئەوەی ئەی ئەوانە نوێژ ناکەن ؟ . ئیمامی مسلم گێڕاییتیەوە

بەڵام بە گوێ کردنیان لە خراپەوگوناهوتاوان و سەرپێچـی کردنـدا دروسـت نیـە ، چونکە بەکردار لـە سـوننەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) ، نـەهی لـەوە کـراوە . وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ :

( السمع والطاعة على المرء المسلم فيما أحب وكره ، مالم يؤمر بالمعصـية ، فإذا أمر بالمعصية فلا سمع ولا طاعة ) بخاري .

واتە : پێویستە لەسەر مرۆڤی موسلمان پەیڕەوی‌و گوێڕایەڵی فەرماندەو براگەورە موسلمانەکانی خۆی بکات ، لەوەی کە پێی خۆشە و لـەوەی کـە پێـی نـاخۆش و زەحمەتە ، ماتو فرمانی بە ئەنجامدانی گوناهو تاوان و ناشەرعی پێ نەکات ، وەلێ ئەگەر فرمانی بەکردنی گوناهو تاوانو نا شەرعی پێکرد، بـا بـە گـوێی نـەکاتو پەیڕەوی لە بیرو بۆچونو فرمانو بڕیارەکانی نەکات ،گوناهباریش نابێت .

وە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ :

لاطاعة في معصية الله ، إنما الطاعة في المعروف . البخاري .

واتـە : بـەگوێکرنی هـیچ کەسـێك لەسـەرپێکردنی خـوای گەورەدانیـە ، بـەلکو بەگوێکردن لە چاکە و لە فرمانی خوای گەورەدایە .

**ئەهلی سووننە و جەماعە** : پێیان وایە کە پێشەوای موسلمانان بـارێکی گـران و بەرپرسیاریەتیەکی زۆرو واجباتێکی گەورەی لەلایەن خوای گەورە لەسەرە ، بۆیـە لەسەری پێویستە : پێشەوای مسـوڵمانان کـە لـە خـوا بترسـێو لـە فرمـانی ئـەو دەرنەچێ لە بارەی ئەوەی کە گەلێکی لەبەردەستە ، پێویسـتە وا بزانـێ کـەخۆی کرێگرتـەی خـوای گەورەیـە و ، خـوا بـەکرێ ی گرتـووە بـۆ ئـەو ئۆممەتـە ، تاسەرپەرشتیو پێشەوایەتی و شـوانێتی یـان بکـا ، بـۆ ڕاژەو خزمـەتی ئـایین و شەریعەتەکەی خۆی گرتـووە ، بـۆ جێ بـەجێ کردنـی یاسـاو فـەرمان و ئـەرك و حدودەکانی خۆی بەکرێ ی گرتووە .بەگشتی و بەتایبەتی لەسـەر پیـاوی پێشـەوا پێویستە نەترسێ و بێ باك بـێ ، بـۆ خـوای گـەورە دەسـت پـاك بـێ ، لەسـەر کۆنەکردنو لەسـەرکۆنەکەران نەترسـێ ، لەسـەر (ئـایین و خـوێن و مـاڵ و ئـابڕوو ناموس و بەرژەوەندی و کاروبار و ئاسایش و گیان و ئاکار و رەوشت و ... هتد) یان پارێزگاروسوربێت ، نابێ بۆ خۆی تۆڵە لەهیچ کەسێك وەربگرێتەوە ، چـونکە بەر ڕق و خەشم وقینی خوای گەورە دەکـەوێ ، وە دەبـێ هـەموو ڕق و قینێکـی بۆخوای گەورە بێ . هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ :

الَّذِينَ إِن مَّكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنكَرِ وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ {الحج/٤١}

واتە : ئەوانەی کە لە گۆی زەویدا جێگیرمـان کردوون، نوێژ ئەنجام دەدەن و، زەکـات لەماڵی خوای گەورە دەدەن و، فرمان بەچاکە دەکەن و ڕێ لەخراپەوناشەرعی دەگرن،

ئەو کەسانە ئیماندارن ، سەرەنجام و ئایندەی هەموو کارەکان بەدەست خـوای گەورەیـە و بۆ لای خوای گەورە دەگەڕێتەوە بۆ لێپرسینەوەیان

وە خوای گەورە دەفەرمووێ :

يَا دَاوُودُ إِنَّا جَعَلْنَاك خَلِيفَةً فِي الْأَرْضِ فَاحْكُم بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ الْهَوَى فَيُضِلَّك عَن سَبِيلِ اللَّهِ إِنَّ الَّذِينَ يضِلُّونَ عَن سَبِيلِ اللَّه لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ بِمَا نَسُوا يَوْمَ الْحسَابِ {ص/٢٦}

واتە : ئەی حەزرەتی داود پێغەمەر (سەلامی خوای گەورەت لەسەر بێت ) ئێمە ئێوەمان لە گۆی زەویدا لە جێ ی پێغەمبەرانی تر سـەلامی خـوای گـەورەیان لەسـەر بێـت کـردە جێنشین ، دە کەواتە : بـە شـێوەیەکی راست و رەوا ناوبـژی و دادگـەری‌و فـەرمانرەوایی لەگەل خەلکی سەرگۆی زەویدا بکـە ، بـەدوای هـەواو ئـارەزوخۆت و خـەلك نەکـەویت ، دەنالەرێگەی خوای گەورە سەرگەردان و گومڕا دەبیـت ، ئـەو کەسـانەی کـە لـە رێگـەی خوای گەورەدا گومرا دەبن یا گوم دەکرێن لـەرۆژی دوایـیـدا سـزاو ئـازارێکی زۆریـان بـۆ هەیە لەبەرانبەر ئەوەی کە رۆژی لێپرسینەوەیان لەبیر چۆتەوە و حسابیان بۆ نەکردووە

وە خوای گەورە دەفەرمووێ :

لُعِنَ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَى لِسَانِ دَاوُودَ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ ذَلِكَ بِمَا عَصَوا وَّكَانُواْ يَعْتَدُونَ {المائدة/٧٨} كَانُواْ لاَ يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ لَبِئْسَ مَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ {المائدة/٧٩}

واتە : لەسەرزاری حەزرەتی داوودو عیسـای کـوری مەریـەم ( سـەلامی خـوای گـەورەیان لەسەر بێـت ) نەفـەرت لـەو بێباوەڕانـەی بـەرەو نـەوەی ئیسـرائیل کـرا بـەهۆی ئـەوەی

کەلەخوای گەورە یاخی بوون و سەر پێچیان دەکردو، دەستدرێژیان دەکـرد ، وە رێیـان لـە وتاوان و خراپانە نەدەگرت کە دەیانکرد ، بەراستی ئەوە کـارێکی زۆربـەد و خـراپ بـوو کە دەیانکرد

وە پێغەمبەری خوای گەورە ش (ﷺ) دەفەموێ :

( ما من عبد يسترعيه الله رعية ، يموت يوم يموت وهو غاش لرعيته ، إلا حرم الله عليه الجنة ) ملسم

واتە : هەر بەندەیەك چەند رۆژێك لە دونیادا شـوانی چـەند کەسـێك ( گـەلێك ) ببـێ ، رۆژێك دادێ ئەو ئینسانە هەر دەمرێ ، ئەگەرخیانەتو ناپاکی لەگەڵ گەلەکەی کردبێ ، بێگومان لەبەر ئەوە خوای گەورە بەهەشتی لێ قەدەغـە و یاسـاغو حـەرام دەکـا ، واتـە ناچێتە بەهەشتەوە ، کەواتە دەچـێتە جەهەننەمـەوە تـا خـوای گـەورە رەحمـی خـۆی پـێ دەکاورزگاری دەکات

# بنچینە و بنەمای نۆیەم

## بیروبـاوەڕی ئەهلی سوننە و جەماعە سەبـارەت بە سەحابەو خانەوادەی پێغەمبەر و جێ نشینـایەتی

## ( ألأصل التـاسع )

## عقيدة أهل السنة و الجماعة في الصحابة و آل البيت و الخلافة

# بیروباوەڕی ئەهلی سوننە وجەماعە
# دەربارەی سەحابە و خانەوادەی پێغەمبەر و خەلافەت

**لەبنچینەکانی بیروباوەری سەلەفی صالح ، ئەهلی سوننە و جەماعە :**

**بریتییە لە :** خۆشویستنی سەرجەم سەحابەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ، ساغ بوون و پاکبوونی دڵ و دەروون و زمان بەرامبەریان ، چونکە ئەوان لەرووی خێر و چاکە و بیرو باوەڕەوە لەهەموو خەڵکی چاکترو تەواو تر بوونە ، وەلە رووی پەیڕەوی کردن لەپێغەمبەرو لە بەرنامەی خواو جیهاد لە پێناو دا کردنی لەهەموو خەڵکی زیاتر پێغەمبەر (ﷺ) هەڵیبژاردونەو پاکانەی کردونە ، وە تایبەتمەندی و بڕشتێکی بەشتێك پێداون کە هیچ کەسێك لەدوای ئەوان ناتوانێ بگاتە ئەو پلەو پایەیە ، بازۆر بەرزیش ببێتەوە ، ئەو شتەش بریتییە لەوەی کەئەوان بەدیتنی پێغەمبەرو لەگەڵ ژیانی ئەو، رێزداروئابڕو مەندو سەر بەرز بوینە ، بۆ ئاگاداریتان هاوەڵە بەرێزەکان هەر هەموویان داد گەرن ، بەهۆی ئەوەی کە پێغەمبەرێکی راستو دروستو دادگەریان هەبووە و ، پێغەمبەرەکەش (ﷺ) راست ودروستو دادگەری کردون ، ئەوانە لەدروست کراوەکانی خوای گەورە دۆستو پشتیوانی خوان ، لەدوای پێغەمبەرمان (ﷺ)چاکترین و پاکترین دروستکراوی ئەون لەو ئۆممەتە ، وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

وَالسَّابِقُونَ الأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ رَّضِيَ اللّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ {التوبة/١٠٠}

واتــە : ئەوانــەی کــە ســەرەتاو یەکــەمجار لــە کۆچــکەران و پشــتیوانەکان لــەبارەی ئیسلامبوونیان پێشکەوتن و پێشبڕکێی یان کرد ، ئەوانەش کە لەسەرخێرو چاکە بـەدوای ئەوان کەوتوون، خوای گەورە لەهەر هەموویان رازیە ، ئەوانیش لـەخوای گـەورە رازیـن ، بۆیە خوای گەورە بەهەشتێکی بۆ ساز و ئامادەکردوون کە جـۆو ڕوبـاری بـەژێر دادێ و ، بەهەمیشەیی لەنێو ئەو بەهەشتە دا دەمێننەوە ، دیارە ئەوەش سەرکەوتنێکی گەورەیـە بۆیە خوای گەورە ئەوەیان پێ دەبەخشێت

وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاء عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاء بَيْنَهُمْ تَرَاهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ السُّجُودِ ذَلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَمَثَلُهُمْ فِي الْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَى عَلَى سُوقِهِ يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ الْكُفَّارَ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِنْهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا {الفتح/٢٩}.

واتە : محمد ( صلى الله عليه وسلم ) پێغەمبەری خـوای گەورەیـە ، وە ئەوانـەی لەگـەڵ ئەون یا شوێن کەوتەی ئەون ، کردارو سیفەتیان وایە کە لەسـەر بـێ بـاوەڕان تونـد و بـێ بەزەیین ، وە لەنێوان خۆیاندا نەرم و نیان و بەزەیین

وە خوای گەورە دەفەرموێ :

لَكِنِ الرَّسُولُ وَالَّذِينَ آمَنُواْ مَعَهُ جَاهَدُواْ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ وَأُوْلَئِكَ لَهُمُ الْخَيْرَاتُ وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ {التوبة/٨٨} أَعَدَّ اللّهُ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ {التوبة/٨٩}

واتە : پێغەمبەری خوای گەورە و ئەو ئیماندارانەی کە لەگەلیدان ، بەسەروەت و سـامان و بە جەستە و لاشەی خۆیان لە پێناوی خوای گەورەدا خەبات و کرد و کۆشش یان کرد ، تێیـان کۆشـا، ئەوانـە خێروچـاکەی زۆریـان بۆهەیـە ، ئەوانـە لەسـەر رێ ی راسـتن و ، سەربەرزو سەرفرازن ، خـوای گـەورە بـاخ و بەهەشـتێکی بـۆ ئامـادەکردوون کـە چـەندان جۆورۆباری بەژێردادێ ، وەبە هەمیشەیی تیادا دەمێننەوە ، ئـەوەش سـەرکەوتنێکی زۆر گەورە و باشە

گەواهی بۆ دانیان بەوەی کە بەراستی ئەوان خاوەن چاکە و ئیمانێکی پتەو و بونـە ،ئـەوە بنچینەیەکی براوەی زاندراوە لە ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا، کە پێویستە ئەو شاهێدیە یان بـۆ بـدرێ ، خۆشویسـتنی ئـەوان ئیمـانو دینداریـیـەو، رق لێبونەوەشـیان کـوفرو بـەد ڕەوشتییە.

**ئەهلی سوننە و جەماعە:** تەنها بەچاکە نەبێ ناویـان نـاهێنن و باسـیان ناکـەن ، بۆیـە پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر خۆشی ویستونەو ، ئێمەی راسپاردوە کە خۆشمان بـوێن ، وەك دەفەرموێ :

**( الله الله في أصحابي لا تتخذونهم غرضا بعدي ، فمـن أحـبهم فـبحبي أحـبهم ، ومـن أبغضهم فببغضي أبغضهم، ومن اذاهم فقد اذانـي ، ومـن اذانـي فقـد اذى الله ، ومـن اذى الله يوشك أن يأخذه ) سنن ترمذي / ألباني**

واتە : هەر خوایە دەربارەی سەحابەکانی مـن دەزانـێ کـە چۆنن ، بۆیـە لـەپاش منـیش کــەس ڕقتــان لێ یــان نەبێتــەوە ، هەرکەسـێك بـەدڵ ئـەوانی خـۆش بـوێ ، منـیش پڕبەخۆشویستی خۆم ئەو کەسەم خۆش دەوێ ، هەر کەسێکیش ڕقی لێیـان بێتـەوە ، پـڕ بەڕقی خۆم ڕقم لێی دەبێتەوە ، هـەر کەسـێ ئـەوان ئـازار بدا ، منـی ئـازار داوە ،هـەر

کەسێ من ئازار بدات خوای پاکی ئازارداوە ، هەر کەسێ خوا گەورە ئازارو تـوڕە بکـا ، بالە خۆی بترسێ کە خوای گەورە خەشمی لێ بگرێت

هەرکەسێ هاوەڵێتی پێغەمبەری کردبێ ﷺ، یا پێغەمبەری خوای دیتبێ (ﷺ) و ئیمانی پێ هێنابێ ئەو کەسە سەحابەیە ، با هاوەڵێتی یەکەی تەنها بۆماوە ( یەك ساڵ یـا یـەك مانگ یا یەك رۆژ یا یەك سەعات ) یش بێت

هەریەکێك لەو هاوەڵانەی کە لە ژێر درەختەکە خۆیان فرۆشتە خواو پێغەمبەری خـوا و، پەیمانیان پێدا ناچنە ناو ئاوری دۆزەخ ، چونکە خوای گەورە لێ یان ڕازی بوە ، ئـەوانیش لەخوای خۆیان ڕازین ، ژمارەی ئەوانەش لە (١٤٠٠) هاوەڵ زیـاترە وەك خـوای گـەورە دەفەرموێ :

لَقَدْ رَضِيَ اللَّـهُ عَـنِ الْمُـؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعونَـكَ تَحْـتَ الشَّـجَرَةِ فَعَلِم مـا فـي قُلُـوبِهِمْ فَـأَنزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا {الفتح/١٨}

واتە : بێگومان خوای گەورە لە و بڕوادارانە خۆش بوو کـە لـە ژێـر درەختەکـە دەسـتیان لەنێو دەستی تۆ داناو بەیعەتیان بە تۆ دا، خـوای گـەورە دەیزانـی کـە چـی لـە نێـو دلی ئەوانە دایە ، بۆیە خوای گەورە خۆگری و دلگیری بەسەردا ڕشـتن ، وەبـە سـەرکەوتنێکی نزیك خێرو پاداشتی دانەوە

وە پێغەمبەریش (ﷺ) فەرموویەتی :

( لا يدخل النار أحد بايع تحت الشجرة ) بخاری

واتە : هیچ کەسێك لەوانەی کە لەژێر درەختەکە پەیمانو بەیعەتیان دایە پێغەمبـەر (ﷺ) ناچنە جەهەننەم

**ئەهلی سووننە و جەماعە:** بیرو باوەڕیان وایە کە شایستە ترین و لە پێشترین کەس و خەلك بە پێشەوایەتی کردنی خەلك لە دوای پێغەمبەر (ﷺ) ئەم چوار هاوەلە بەرێزەن ابوبکر ، عومەر ، عسمان ، علی ئەوانە باشترین موسلمان و کۆچکەرن ، بە کۆرا لەدوای پێغەمبەر (ﷺ) چاکترینی خەلکی ئەم ئۆممەتەن بۆیە پێغەمبەری خوای گەورە ش (ﷺ) دەفەموێ :

أوصيكم بتقوى الله والسمع والطاعة وان عبدا حبشيا ، فانه من يعش منكم بعدي فسيرى اختلافا كثيرا ، فعليكم بسنتي ، وسنة الخلفاء المهديين الراشدين ، تمسكوا بها ، وعضوا عليها بالنواجذ ، واياكم ومحدثات الأمور ، فان كل محدثة بدعة ، وكل بدعة ضلالة (صحيح سنن أبو داود) للألباني

واتە ئامۆژگاریتان دەکەم کە لە خوای گەورە بترسن و، گوێ رایەلی براگەورەکەت بکە، ئەگەر بەندەیەکی سەر ڕەشی حەبەشیش بێت ، چونکە ئی واتان هەیە لە دوای من دەژی ، راجیایی و جیاوازیەکی زۆر دەبینێ ، بۆیە خۆتان لە کاروباری داهێنراولە بیرو باوەڕو لە دیندا بپارێزن ، چونکە هەموو کارێکی تازە لەوبارەیەوە داهێنراوە ، وە هەموو داهێنراوێکیش گومڕایی و سەر گەردانییە

ئەهلی سوونئە و جەماعە: دەربـارەی بـەرپابوونی نـاکۆکی نێـوان هاوەڵـەکان تـەنها ئـەو درەختەی کە لە نێوانیان بوە و بەیعەتیان لە ژێـر داوە، بـۆ بـوونی برایـەتی و یـەکرێزیان بەسە کە دوبەرەکی یان تێ نەکەوێ ، وە کار و فەرمانی خۆیان بەخوای دادوەر دەسـپێرن و هانا و پەنا تەنها بۆ ئەو دەبەن ، ئەگـەر هـەر یـەکێك لـەوان راسـتی کـرد و ئارمـانجی پێکا، دوو خێر و پاداشتی بۆ هەیە، ئەگەر یەکێکیش هەڵەی کردونە ی پێکا یەك خێر و پاداشتی بۆ هەیە ، ئەگەر خوای گەورە حەز بکا لە هەڵەکەشی دەبـورێ ، هـیچ کەسـێك

لە ئەهلی سوننە  جنێو بە سەحابەکان نادا، بەڵکو بە جوانترین شێوە کە شایستە بەوانـە باسیان دەکەن ، لەبەر فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرمووێ :

( لا تسبوا أصحابي، ولاتسبوا أصحابي فوالذي نفسي بيده لو أن احدكم أنفق مثل أحدٍ ذهباً، ما أدرك مد أحدهم ولاتصفه ) مسلم[141]

واتە: ئەی خەڵکینە هەرگیز جنێو بە هاوەڵ و یاوەرانی من مـەدەن، سـوێند بـەو خوایـەی کە منی بەدەستە، هەر یەکێك لە ئێوە بەقەد کێوی ئوحد زێڕ ببەخشێ ، هێشـتا ناگاتـە (مست) ێکی یەکێکی ئەوان، بەڵکو ناگاتە نیوەی (مست) یشیان [142]

---

[141] تێکڕای سەحابە نەچووینە ناو فیتنە، بەڵکو کاتێ کە فیتنە ڕوویداوە، سەحابەکانی پێغەمبـەر (ﷺ) دەیان هەزار کەس بوونە، کەچی تەنها چـەند سـەد کەسێك بەشداریان کـرد کـە نەگەیشتە (هەزاران)، هەروەك ئیمامی ئەحمەد لە (مسند) ی خۆی گێڕاویەتیەوە، وە عبدالرزاق لە (مصنف) و ابن کثیر لە (بدایة) یان هێناوەتەوە.

**وەرگێڕ:** سەبارەت بە ڕووداوو ئاشوب  و ئاژاوەکانی نێوان بەرەی سـەحابەو موسـڵمانە ڕەسـەنەکان ، حوزەیفەی کوڕی یەمانە پرسیاری لـە پێغەمبـەر کـرد و گـوتی: چ فـەرمانێکم پـێ دەکـەیت ئەگـەر گەیشتمە فتنەی نێوان موسڵمانان، پێغەمبەر (ﷺ) لە وەڵامدا فەرموی: دەست بگرە بە کۆمـەڵی موسڵمانان و پێشەواکەیان و بەوانەوە پابەند بە.

[142] لە فەرمودەیەکی تریدا دەفەرموێ: ( لاتسبوا اصحابي ) بخاری

واتە : جنێو بە هاوەڵانی من مەدەن   وەرگێڕ.

١  بۆ وێنە پێغەمبەر  (ﷺ) سەبارەت بە فاتیمەی کچی دەفەرموێ : ( فاطمة بضعة مني ) . رواه بخاری

واتە : فاطیمەی کچم پارچەیەکە لە من

وە دەفەرموو ێ : ( فاطة سيدة نساء أهل الجنة ) بخاری

**ئه‌هلی سوننه و جه‌ماعه :** بیرو باوه‌ڕیان وایه كه سه‌حابه پاك و بێ تاوان نـین له‌هه‌ڵـه‌و گوناهو كه‌موكوڕی، به‌ڵكو ئه‌وانیش ئاده‌میزادن و هه‌ڵه و تاوان ده‌كه‌ن ، وه خوای گه‌وره تێكڕای ئۆممه‌تو زانایانی له‌هه‌ڵه وگونـاه پاراسـتوه نـه‌ك تـاك . وه‌كۆ پێغه‌مبـه‌ر (ﷺ) ده‌فه‌رموێ :

( إن الله لايجمع أمتي على ضلالة ويد الله على الجماعة ) سنن الترمذي والألباني

واته: خوای گـه‌وره تێكڕایـی ئۆممـه‌تی مـن له‌سـه‌ر لادان‌و گـومڕایی كۆناكاتـه‌وه، بـه‌ڵكو ده‌ستی خوای گه‌روه له‌گه‌ڵ جه‌ماعه‌ت و له‌سه‌رووی جه‌ماعه‌ته.

**ئه‌هلی سوننه و جه‌ماعه:** بڕوایـان وایـه كـه ئـه‌و چـوار هاوه‌ڵانـه: ( ابـا بكـر، عمـر، عوسمان، علی ) ( ڕه‌زای خوایان له‌سه‌ر بێت ) چـاكترین خـه‌ڵكی ئـه‌و ئومـه‌تن لـه دوای پێغه‌مبه‌رمان (ﷺ) ، وه به‌پێی ئه‌و ته‌رتیبه خه‌لیفـه سـه‌ر ڕاسـت و ڕاسـته‌ڕێ كـراون، ئه‌و چوار پێشه‌وا به‌رێزانه وێرای خه‌لافه‌تی ئیمـامی حه‌سـه‌نی كـوڕی ئیمـامی عـه‌لی ، سی سال خه‌لافه‌تی پێغه‌مبه‌ریان به‌سه‌ر بردووه ( ڕه‌زای خوای گه‌وره‌یان لێ بێت )

وه‌ك پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ده‌فه‌رموێ: ( إن الخلافة في أمتي ثلاثون سنة ثم ملك بعد ذالك )

واته : سه‌رده‌میێتی خه‌لیفێتی له پاش من سی ساڵ ده‌بـێ لـه ئۆممـه‌تی منـدا ، لـه دوای ئه‌وه ده‌بێته حوكمی پاشایه‌تی

**ئه‌هلی سوننه و جه‌ماعه:** له‌دوای ئه‌وه ئه‌و ده هاوه‌ڵه به‌رێزه هه‌ڵبژێرن كه ڕاسته‌وخۆ موژده‌ی به‌هه‌شتیان پێ دراوه ، وه‌ك پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ناوی بردون ، كه ئه‌مانه‌ن : ابـوبكر صدیق ، عومه‌ری كوڕی خه‌تتاب كه‌به‌فاروق ناسراوه ، عوسمانی كوری عه‌ففان كه‌بـه زوو

---

واته : فاتیمه‌ی كچی من گه‌وره‌ی ژنانی ناو به‌هه‌شته . وه‌رگێر

نورەین ناسراوە، علی کوڕی ئەبی تالیب ئەمینداری ئۆممەت رەزای خوا لەهەموویان بێ ، لەپاش ئەوانە ئەهلی بەدر کە بەشدرایان لـەو شـەڕە دا کـرد ، پاشـان ئـەو خەڵکـەی کـە بەیعەتی رەزوان یان دا ، لەپاشان هـەمو هاوەڵـەکان ، خـوای گـەورە لەهـەر هـەموویان رازی بێ ، بۆیە هەر کەسێ خۆشی بوێن و دوعا یان بۆ بکا و مافیان رەچاو بکا و خێری چاکە و گەورایەتی یان بزانێ ئەوە لەسەر فرازانە ، وەهەر کەسێ ڕقـی لێ یـان ببێتـەوەو بیان بێزێنی وجنوێیان پێ بدا لەسەر شۆڕو فەوتاوانە

**ئەهلی سووننە و جەماعە:** ئەهلی بەیتی پێغەمبەریان (ﷺ) خۆش دەوێ، چـونکە کـار بەو فەرموودەیە دەکەن کە دەفەرموێ :

( أذكركم الله في أهلي بيتي ، أذكركم الله في أهلي بيتي ) مسلم

واتە: ئاگادار بن ، من بۆ خوا ئاگادارتان دەکەمەوە دەربارەی ئەهلی بەیتو خانـەوادەی خۆم کە لەگەڵیاندا بەڕ ێزبن و خۆشتان بوێنو، قسەی خراپیان پێ نەڵێن

وەدەفەرموێ : ( إ ن الله أصطفى بني أسماعيل واصطفى من بني إسماعيل كنانة، وأصطفى من قريش بني هاشم ، واصطفاني من بني هاشم ) مسلم.

واتە : بێگومان خوای گەورە بـەنی ئیسـماعیلی هەڵبـژارد ، وە لـە بـەنی ئیسـماعیلیش هۆزی کینانەی هەڵبژارد ، لەهۆزی کینانەش تیرەی قورەیشی هەڵبژاردووە ، وەلە هۆزی قورەیش بەنی هـاشمی هەڵبـژاردوە ، لەبـەنی هـاشمیش منـی هەڵبـژاردوە ، وە ژنـەکانی پێغەمبەریش هەر لە خانەوادە ( **أهل البيت** ) ی پێغەمبەرن رەزای خوایان لێ بـێ ، بـە پێ ی دەقی قورئان خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ) دایکـی ئیمانـداران ، وەك خـوای گـەورەو میهرەبان دەفەرموێ :

يَا نِسَاء النَّبِيِّ لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِّنَ النِّسَاء إِنِ اتَّقَيْتُنَّ فَلَا تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِهِ مَرَضٌ وَقُلْنَ قَوْلًا مَّعْرُوفًا {٣٢} وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَى وَأَقِمْنَ الصَّلَاةَ وَآتِينَ الزَّكَاةَ وَأَطِعْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا {الأحزاب/٣٣}

واتە : ئەی ژنەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ، ئێوە وەکو هیچ کام لە ژنەکانی تری خەلك نین ، لە خوا بترسن و خۆتان بپارێزن ، بەناسك و نازلەسەر زەوی مەڕۆنو قسە مەکەن ، مەبادە ئەو کەسەی کە دڵی نەخۆشە تەماە بیگرێ ، هەمیشە قسەی چاكو شیاوو بەجێ بکەن ، وەلە ماڵی خۆتاندا بێننەوە ، وەکو جاهیلیەتی پێشوو لەنێو خەڵکدا جوانی خۆتان پێشان مەدەن ، نوێژ بکەن و زەکات بدەن ، تاعەتی خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی بکەن ﷺ ، ئەی ئەهلی ماڵی پێغەمبەر (ﷺ) بەراستی خوای گەورە گەرەکیەتی هەموو جۆرە پیسی و تاوانێك لە ئێوە داماڵی و دوری بخاتەوە ، بەو جۆرەی پاکە پاکتان بکاتەوە

وە خوای گەورەو میهرەبان دەفەرموێ :

النَّبِيُّ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ وَأَزْوَاجُهُ أُمَّهَاتُهُمْ {الأحزاب/٦}

واتە : پێغەمبەری خوای گەورە (ﷺ) بەرانبەر بە ئیمانداران لە دل و دەروون و لە لاشەی خۆیان لە پێشترە کە برواتان پێی بێ و قوربانی لە پێناو دابدەن ، وە خێزانەکانی دایکی ئیمانداارانن ، دەبێ وەکو دایکی خۆیان بیانپارێزنو مامەلەیان لەگەلدا بکەن

وە خوای گەورەو میهرەبان دەفەرموێ :

وَاذْكُـرْنَ مـا يُتْلَـى فـي بُيُـوتِكُنَّ مـنْ آيَـاتِ اللَّـهِ وَالْحِكْمَـةِ إِنَّ اللَّـهَ كَـانَ لَطِيفًـا خَـبِيرًا {الأحزاب/٣٤}

واتە : ئەی هاوسەرانی پێغەمبەری خوای گەورە (ﷺ) بۆ خەلك و بۆخۆتان بـاس و یـادی ئەو زیكرو یـادو ئایـەت و حیكمەتانـە بكـەن كـە لـە مالەكانتانـدا دەخوێنـدرێ و بـاس دەكرێت ، بە گرنگی بزانن و فەرامۆشی مەكەن ، كاری پێبكەن ، خوای گەورە هەمیشـە بە سۆزو بە لوتف و بەئاگایە

ئەو ژنانەشی ئەمانەن (خدیجەی كچی خوەیلەد ، عائیشـەی كچـی ئـەبو بكـری صـدیق ، حەفسەی كچی عمری كوری خەتتاب ، ئوم حەبیبیەی كچـی أبـی سـفیان ، ئـوم سـەلمەی كچی ئەبی ئومەیەی كوڕی موغەیرە ، سەودەی كچی زەمعەی كـوڕی قـەیس ، زەینـەبی كچی جەحش ، مەیمونی كچی حـاریس ، جـوەیرەی كچـی حـاریس كـوڕی ئـەبی ضـرار ، صەفیەی كچی حیی كوری أختب )

**ئەهلی سوننە و جەماعە:** بڕوایان وایە كە ئەمانە پاكن و بەرین لەهـەموو خراپەیـەك ، هـەر ئەوانـە لـە دونیـا و لـەدوارۆژدا خێزانـی پێغەمبـەرن (ﷺ) ڕەزای خـوای گـەورە لەهەموویان بێت

لەهەموانیش یان خەدیجـەی كچـی خوەیلـەد و عائیشـەی كچـی ئەبوبـەكری ڕاسـتگۆ بـە چاكتر دەزانن ، ئەو عائیشەی كە خوای گەورە لە كتێبی پیرۆزی خۆی پاكانـەی كـردوە ، بۆیە هەر كەسێ تۆمەتبار ( **قذف** ) ی بكـا بـەو شـتەی كـە خـوا پاكانـەی لـێ كـردوە، كوفری كردوە وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

إِنَّ الَّذِينَ جَاؤُوا بِالْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَّكُم بَـلْ هُـو خَيْـرٌ لَّكُـمْ لِكُـلِّ امْـرِئٍ مِّنْهُم مَّا اكْتَسب منَ الْإِثْمِ وَالَّذِي تَوَلَّى كِبْرَهُ مِنهُمْ لَهُ عَذَابٌ عَظِيمٌ {النور/١١}

واتـە: ئـەی پێغەمبـەر (ﷺ) بێگومـان ئـەو کەسـانەی کـە بوهتانیـان بـە حـەزرەتی عائیشەی دایکی ئیمانداران هەلبەست کۆمەلێك بـوون لـە خۆتـان ، یاوایـان خـۆ پیشـان دەدا کە لە خۆتانن ، ئەم بوهتان هەلبەستنە بە شەڕو خـراپ مەزانـە بـۆ سـەر خۆتـان ، بـەلکو ئـەوە خێـری تیایـە بـۆ ئێـوە ، بـۆ ئـەوەی ئـەو دوڕوانـە دەرکـەون و بناسـرێن ، هەریەکێك لە ئێوە بە پێ ی ئەو گوناهو تاوانـەی کـە کردوویـەتی لـەرۆژی دوایـی سـزاو پاداشتی خۆی هەیە ، نەخاسمە ئەوەی کـە سەرپەرشـتی کـردوون و گەورەیانـە گـەورترین سزاو ئازاری بۆ هەیە

وە پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێ :

( فضل عائيشة على النساء ، كفضل الثريد على سائر الطعام ) البخاري.

واتە: گەورەیی و چاکەی عائیشـە لەسـەر هـەموو ژنـەکانی تـری دونیـا ، وەکـو چـاکەی تێکوشەیە لەسەر هەموو خواردنەکانی تر

# بنچینە و بنەمای دەیەمین

# هەڵوێستی ئەهلی سوننە و جەماعە لەبەرامبەر خەڵکی ئارەز و باز و بیدعەچی دا

# ( الأصل العاشر )

# موقف أهل السنة و الجماعة من أهل البدع و الهواء

# مەوقیفی ئەهلی سوننەوجەماعە
# دەربارەی خەڵکی ئارەزوو باز و بیدعەکار

**لە بنچینەکانی بیروباوەڕی سەلەفی صالح ، ئەهلی سونە و جەماعە :**

ئەوەیە کەخەڵکی ئارەزوو پەرست و بیدعەچی دەبیزێنن و ڕقیـان لێ دەبنــەوە ، لەوانــەی کە شتی تازە لەئاین دا دێنن کـە پێشـتر نـەبوە ، بۆیـە خۆشـیان نـاوێن و برادەرایـەتی و هاوەڵێتی یان ناکەن ، گوێ لە گوتە و قسەیان ناگرن ، لەگـەڵیان دانانیشـن ، وەلـەبارەی ئایینەوە گفتوگـۆ و دیالـەکتیك و مێزگردیـان لەگەڵدا ناکـەن، وە گـوێ ی خۆیـان لـەوە دەپارێزن کە گوێ لەشتە پڕو پوچـەکان و رونکردنـەوە و لێکدانـەوەی حـاڵو بـاری ئـەوان بگرن ، وە ئوممەتیان لێ ئاگـادار دەکەننـەوەو خـەڵکیان لێ هانـدەدەن و لێ رادەپـەڕێنن، وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ :

( ما من نبـي بعثه الله في أمتي قبلي إلا كان له من أمته حواريون وأصـحاب يأخـذون بسنته ويقتدون بأمره ، ثم انها تخلف من بعدهم خلوف يقولـون مـا لايفعلـون ، ويفعلـون مالا يؤمرون ، فمن جاهدهم بيده فهو مؤمن ، ومن جاهدهم بلسانه فهو مؤمن ، ومـن جاهدهم بقلبه فهو مؤمن ، وليس وراء ذلك من الإيمان حبة خردل )

سنن أبي داود / الألباني

واتە: هەر پێغەمبەرێك سەلامی خوای گەورەی لەسـەر بـێ لـە پـێش مـن خـوای گـەورە ناردبێتی بێگومـان لـە نێـو ئوممەتەکـەی دا چـەند هـاوەڵ و پاڵپشـتێکی هەبووینـە کـە بەرنامـە و ڕێبـاز (سـوننەت ) ی ئـەو بگرنـە بـەر و پـەیڕەوی لـە بـیرو بـاوەڕ و کـار و فرمانەکانی بکەن ، لە پاشـان لـەدوای ئـەوان چـەند جـێ نـیش و پاشماوەیـەك ماینـەوە،

ئەوەی دەیڵێن کارو فرمانی پێ ناکەن ، هەر کەسێك بەدەستی خـۆی جیهادیـان لەگەڵدا بکا ئیمانداره ، هەر کەسێ بە زوبانی خۆی جیهادیان لەگەڵدا بکا ئیمانداره ، هەرکەسێ بە دلی خۆی جیهادیان لەگەڵدا بکا ئیمانداره ، لە دوای ئەوە دەنکە خەرتـەلێك لـەبارەی ئیمانەوە حیسابی نیە ، واتە : ئەگەر ئەوەش نەکرێ ئەو کەسە هـەر ئیمانـدار نیـە. وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمۆی :

( سيكون في آخر أمتي اناس يحدثونكم ما لم تسمعوا انتم و لا ابـاؤكم ، إيـاكم و ايـاهم ) مسلم

واتە : ئوممەتی من خەلکانێك پەیدادەبن، قسەتان لەگەل دەکـەن بەشـێوەیەك کـە ئێـوە و باب و باپیرانتان هەرگیز گوێتان لەو شتانە نـەبوە، بۆیـە ئاگاتـان لـە خۆتـان و لـەوانیش بێت کارتان تێ نەکەن و پێیان هەلنە خەلەتێن

ئـەهلی سـوننەو جەماعـە: بیدعـە بـەوە پێناسـە دەکـەن کـە شـتێکی تازەیـە و لـەدوای پێغەمبەرەوە (ﷺ) لەڕووی هەواو ئارەزوەوە داهـاتوەو دروسـتکراوە، دوای ئـەوەی کـە ئایینی پیرۆزی ئیسلام تەواو بووە، بریتیی یە لـە هـەر کارێـك کـە بەلگـەی شـەرعی لـە کتاب و سوننە دا لە سـەرکردنی نـەهاتووە . هـەروەها بریتییـە لـە خواستن و داهێنـانی شـتێکی تـازە لـە ئـایین دا لـەڕووی شـان لـە شـاندانی شـەریعەتی ئیسـلام و هاوتـایی بەمەبەستی خـوا پەرسـتی و نزیـك بوونـەوە لـە خـوای گـەورە ، بۆیـە بیدعـە بەرامبـەر سوننەیە، کەچی سوننە ڕێنمایی ( هدى ) یەوە، بیدعەیش گومڕاییە ( ضلالة )ە

بیدعە: بەهەمو جۆرەکانیەوە لە لەروی بیروبـاوەرو خواپەرسـتیەوە لەئیسـلامدا حـەرام و یاساغە و ، ئینسـان لـە خـوا ی گـەورەو لـە بەهەشـت دور دەخاتـەوە و ، بـەرەو ئـاوری دۆزەخی دەبات بۆیە پێغەمبەری خوای گەورەش (ﷺ) دەفەموێ :

( عليكم بسنتي ، وسنة الخلفاء المهديين الراشدين تمسكوا بها، وعضوا عليها بالنواجذ واياكم ومحدثات الأمور ، فإن كل محدثة بدعة ، وكل بدعة ضلالة ، وكل ضلالة في النار ) سنن ابي داود/ الباني

واتە: لەسەر تانە لەسە رێبازو رەوشتی من بـن و پـێ یـەوە پابەنـدو پەیوەسـت بـن ، وە لەسەر تانە کە لەسەر رێبازی خەلیفە سەر راست و رێنمایی کراوەکانی من بـن ، چـونکە ئـەو خەلیفانـە دەسـتیان بـە رێبـازی منـەوە گرتـووە وپێیـەوە پەیوەسـتن ، بۆیـە ددان و خرێنەکان ( **نواجذ**) تان لەسەر رێبازی منو ئەوان دابگـرن و بـەری مـەدەن، ئاگـادار بـن لەکاری تـازە و داهێنـراو دوربـن ، چـونکە هـەموو شـتێکی تـازەو داهێنـراو و داهـاتوو لـەبارەی خواپەرسـتی و بیروبـاوەڕەوە بیدعیــە و، هـەموو بیدعیـەکیش سەرلێشـوان و گومراییە

**بیدعــە:** لای ئـەهلی سـوننە لەگـەڵ تەواویـەتی یەکتاپەرسـتی ( **کمـال التوحیـد** ) تێـك دەگیرێن و رِەتی دەکاتەوە ، بیدعە هۆکارێکە لە هۆکارەکانی هاوبەش پەیدا کـردن ، وە مەبەستی خواپەرستیەکە کە خوای گەورە بڕیاری نەداوە، وە دابینکردنی هۆکاریش بـۆ کردنی بیدعە بە حوکمی مەبەستەکانی هەڵدەگرێ ، وە هەموو بیانوو و بە هانەیـەك لـە رووی بەرپاکردن و داهێنانی بیدعەیەك لە ئاین بەکاردەهێنرێن ، بێ قسە پێویسـتە ئـەو بەهانانە بەربەست بکرێن ، چونکە ئاین لەکاتی خۆیەوە تەواو بووە و پێویستی بەهیچـی تر ناکات . وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا {المائدة/٣} .

واتە: ئا ئەمڕۆ ئایینی ئێوەم بۆ ئێوە تەواوو تۆكمـە كـردوە ، وە نـاز و نیعمـەتی خۆشـم تەواو بەسەر ئێوەدا داڕشتوە ، وەبەوەش لێتان ڕازیم كەتەنها ئیسلام ئایین و ڕێبازی ژیان تان بێت

وەپێغەمبەری خوای گەورە یش (ﷺ) دەفەرموێ :

( من أحدث في أمرنا هذا ماليس منه فهو رد).

واتە : هەر كەسێك شـتێك لـەكاروباری ئـایینی ئێمـە دا دابێنـێ ، كەلـە ئایینەكەمانـدا نەبێ ، ئەو شتەی بەسەر دا دەدرێتەوە و لێی وەرناگیرێو لێ ی قبول ناكرێت

وەدەفەرموێ : ( من عمل عملا ليس عليه أمرنا فهو رد ) مسلم

واتە : هەر كەسێ كارێك بكا لە ئایینی ئێمە دانەبێ و فرمانمان لەسەری نـەبێ ، بەسـەر خۆی دا دەرێتەوە

وە دەفەرموێ: ( فإن خير الحديث كتاب الله، وخير الهدي هدي محمدٍ ، (ﷺ) وشـر الأمـور محدثاتها، وكل بدعة ضلالة ) مسلم

واتـە: بەڕاسـتی باشـترین قسـە و فـەرمودە كتـێبی خوایـە [143] ، وە باشـترین دیـاری و ڕێنماییكـەر دیـاری موحەمـەدە ﷺ ، خـراپترین كـارو كـردەوەش ، داهێنراوەكانـە، وە هەموو داهێنراوێكیش گومڕاییە

[143] وە خوای گەورە دەفەرموێ : وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللّهِ حَدِيثًا {النساء/٨٧}

یان دەفەرمووێ : وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللّهِ قِيلاً {النساء/١٢٢}

واتە: ئایا قسە وگوتەی كێ لە هی خوای گەورە راسـترو دروسـترو باشترە

وە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ : (إن أحسن الحديث كتاب الله) البخاري .

واتە: بێگومان باشترین و پاكترین قسە و فەرمودە تەنها كتێبی خوای گەورەیە. وەرگێڕ.

**ئەهلی سوننە و جەماعە** : بیدعە تەنها بەیەك جۆرو پلە دانانێن ، ئەگەرچی چەندان جۆری هەیە ، بەکردنی هەندێ جۆریان پیاو پێی لەئاین دەردەچێ و، هەندێکیان لە ریزی گوناهە گەورەکانن ، وەهەندێکیان لەگوناهە گچکەکانن ، بەڵام هەر هەموویان لە پێناسەی گومڕایی دا هاوەبەشن ، وە بیدعەی تەواو ( **كلي** ) لەلای ئەوان وەکو بیدعەی بەشی ( **جزئي** ) نی یە ، وە بیدعەی تێکەڵ و ئاوێتەکراو ( **مركبة** ) وەکو بیدعەی سانا و ساکار ( **بسيط** ) نیە، وە بیدعەی هەقیقی وەکو ئەو بیدعەیە نیە کە دەخرێتە سەری ، هەموو ئەوانە لە خودی خۆیاندا و، لە رووی حوکمی شەرعیانە وە وەکو یەك نین ، هەر وەك بیدعەکان لە ڕووی حوکمی شەرعیانەوە جیاوازیان هەیە ، چونکە هەندێك یان کوفرن ، هەندێکیان فسقن ، وە حوکمی بکەر ( **فاعل** ) ە کەش هەر جیاوازیان هەیە، بۆیە ئەهلی سوننە تەنها حوکم بەسەر ئەهلی بیدعەدا نادەن ، بەڵکو حوکمەکە لە کەسێکە وە بۆ کەسێکی ترەوە بەپێی بیدعەکە جیاوازی هەیە، چونکە نەزان و نەفام وەکو زانا نیە، وە زانای کۆششکار وەکو زانای بانگ کار نیە دەربارەی ئەو بیدعەیەی دەیکا، یا بە دوای هەوا و ئارەزو دەکەوێ ، بۆیە مامەڵە لەگەڵ ئەو کەسەدا ناکەن کە خۆی بەبیدعەکانی دادەپۆشێ ، وەك ئەو کەسەی کە بیدعەکانی خۆی دەردەخا، یا ئەو بانگ کەرەی کە دەعوە بۆ بیدعە دەکا، چونکە ئەو بانگبەرە زیانەکانی دەست درێژی دەکەنە سەر غەیری خۆی ، بۆیە دەبێ بە ئاشکرا رێی لێ بگیرێ و باسی بکرێ و، دەبێ سزای بدرێ و بەربەست بکرێ ، تاواز لە بیدعەکانی بێنێ ، چونکە ئەوەی تاوانەکان دەردەخا شایستەی سزادان و پشت تێ کردنە ، بۆیە ئەهلی سوننە لەبەرامبەر هەر هەلوێستێك ڕادەوەستن کە پێچەوانەی ئەوەی ترە ، وە رەحم بە تێکرا ( **عامة** ) ی ئەهلی بیدعە و لاسایی کەروەکانیان دەکەن ، وە دوعای خێر و هیدایەتیان بۆ دەکەن، وە داوای گەڕانەوە سەر رێبازی پێغەمبەر (ﷺ) و هیدایەتی بۆ دەکەن ، وە ئەو رێبازەیان بۆڕون دەکەنەوە ، تا پەشیمان ببنەوەو بەداوی کەون ، وە حوکمی ڕواڵەتیان بەسەر دا دەدەن و نهێنیەکانیان بەخوای گەورە دەسپێرن، ئەگەر بیدعەکانیان کوفر نەبن.

# نیشانەکانی خەڵکی ئارەزوو باز و بیدعەچی

بێ گومـان خـەڵکی ئـارەزوو بـازو بیدعـەکار چـەند نیشـانەیەکیان هەیـە کەلـە سـەریان دەدرەوشێتەوەو بەو نیشانانەوە دەناسرێن ، وەك خوای گەورە لەکتابی خۆی دا باسی ئـەو نیشانانەی کردوە ، وە پێغەمبەری خواش (ﷺ) لە سوننەتی خۆی دا روونـی کردونەتـەوە ، ئەوەش بۆ ئاگادارکردنەوەی ئوممەتە لەو نیشانانە، ئەو نیشانانەش بریتین لەمانە:

نەزانی بەرامبەر مەبەستەکانی شەریعەت ، پارچە پارچەیی و جوێ بوونـەوە لەکۆمـەڵ ، دیالێکتیك و ڕقە بەرایەتی و ناحەزێتی یەکتری کردن ، بە دوای هەواو ئارەزوو کـەوتن ، لوتبەرزی و سەرسام بون بە خۆ ، وەپێش خستنی ئەقڵ لەسەر نەقڵ (دەقەکان) ، نـەزانی بەرانبەر بە سـوننەتی پێغەمبـەر (ﷺ)، چـونە نێـو مەسـەلە هاوشـێوە و وێـك چـووەکان (**متشابهات**)، بەر هەڵستی کردنی سوننە بە قورئان ، زێدە رۆیی کردن لـە گـەورەکردنو بەرزکردنەوەی کەسانێك ، زێدە رۆیـی کـردن لـە خواپەرسـتیدا، خـۆ هاوشـێوەکردن و وێ چواندن بەبێ باوەڕەکان ( **التشبه بالكفار** )[١٤٤] ، ناو و ناتۆرە نان لەئەهلی سـووننە و، رق لێبوونەو بێزاندنی ئەهلی ئەسەر و دوژمنایەتی کردنیان ، هەڵگرتن و لابردنی هەواڵەکان ( **أخبار** ) ی پێغەمبەر (ﷺ) و سوکایەتی پێ کردنیان ، تەکفیرکردنی ئەو کەسـانەی کـە پێچەوانەی خۆیانن بەبێ بەڵگە ، داوای کۆمەکی کردن لە دژی ئەهلی حەق بەخـەڵکێکی سەردار و خاوەن دەسەڵات ، چونە پاڵ دوژمنانی ئیسلام لە دژی موسلمانان

[١٤٤] بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ :( خالفوا المشركين..) بخاری

واتە : پێچەوانە و دژایەتی هاوبەش پەیداکەران بکەن وەرگێر

**ئـەهلی سـوننە و جەماعـە :** چـوار کۆمـەڵ بەبنـەما و بنچـینەکانی بیدعـە دادەنێن

ڕەتکەرەوەکان ( **الروافض** )

دەرچووەکان ( **الخوارج** )

ئەندازە گیروبڕیاردەرەکان ( **القدرية** )

تکاکارەکان ( **المرجئية** )

لەپاش ئەوانە لەهەر کۆمەڵێك چەندان کۆمەڵی تری لێ دەبینەوە تا هـەفتاو دوو کۆمـەڵ تەواو دەبێ، هەروەك پێغەمبەری خوای گەورە (ﷺ) دەربارەی ئەوەوە فەرموودەی هەیە.

**ئەهلی سوننە و جەماعە :** لەبارەی کاردانەوە لـەدژی خـەڵکی ئـارەزوو بـاز و مـەککار هەوڵێکی زۆر و بەجێ یان داوەو هەمیشە بۆیان لە ڕەبەت ( کـەمین ) دان ، وە گوتـەیان لەسەر ئەهلی هەواو بیدعە زۆر زۆرە کە ئێمە تەنها دوو گوتەیان بەنموونە دێنینەوە

**ئیمامی أحمدی کوڕی سنانی قەتتان ڕەحمەتی خوای لێ رازی بێ دەڵێ :**

ئەگەر لە دونیا هەر بیدعە داهێنەرێك هەبێ ، ئـەهلی حـەدیس رقیـان لێـی دەبێتـەوە ، ئەگەر هەر پیاوێك بیدعەیەکی داهێنا ، تـام و شـیرینێتی فـەرموودەی لـەدڵو دەروونـدا دادەماڵێ و نامێنێ

**ئیمامی ئەبو تەمامی حەنزەڵی رەزای خوای لێ بێ دەڵێ :**

نیشانەی خەڵکی بیدعەکار لەئەهلی ئەسەردا هەیە ، نیشانەی بێدینێتی ئەوەیە کە ناوی خراپوگـومڕا لـە ئـەهلی ئەسـەر دەنـێن ، چـونکە هەڵوەشـاندنەوەو پوچـەڵ کردنـەوەی

شوێنەواریان دەوێ ، وەنیشانەی جەهمیە ئەوەیـە کـەناوی ( مشـبهە ) لەئـەهلی سـوننە دەنـێن ، نیشـانەی ( مرجئـەکان ) ئەویـە کـەدەڵێن : ئـەهلی سـوننە سـەر پـێچ و کەمتەرخەمن ، نیشانەی رافیزەکان ئەوەیە کە دەڵێن : ئەهلی سوننە دانەر (ناصبة) یـە ، هەموو ئەوانە ناوێك لەئەهلی سوننە دەنێن ، کۆبوونەوە بوونی ئـەو ناوانـەش بەحـەلال دەزانن

## یەکێك بە ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەلی گووت :

لەمەککە لەلای ئیبن قەتیلـە باسـی ( أصـحاب الحـديس ) یـان کـرد ، نـاوبراو گـووتی اصحاب الحديس گەلێکی بەدو خراپن ، بۆیـە ئیمـام لـەم کـۆڕە هەسـتاو جلـەکانی خـۆی دادەوەشاند لەبەر ئـەم قسـەیە : (واتـە : لـەوە بـەریم کـە ئـەو پیـاوە دەیلێـت) چـووە ماڵەوە، هەر دەیگووت : (بێدینە ، بێدینە ، بێدینە) مەبەستی پێ ئیبن قەتیلە بوو خوای گەورە ئەهلی سوننە و فەرموودەی پاراستوە لەهەموو ئەو نەنگانـەی کـە دەدرێنـە پاڵیان ، ئەوانە هیچ شتێك نین ، تەنها ئەهلی سـوننە و سـوننی نـە ، ئـەهلی رێبـازێکی لێزرازینە، خوای گەورە سەرکەوتووی کردوون تا بە دوای کتێبی خوای گەورە و، سوننەتی پێغەمبەرەکـەی (ﷺ) بکـەون ، وە خـوای گـەورە دڵ و سـینەی فـراوان کـردون بـۆ خۆشویستنی پێغەمبەر و خۆشەویستنی پێشەواکانی ئـاین و زاناکـانی ئۆمـەت ئەوانـەی کە کار بە زانستەکەیان دەکەن، چونکە هەر کەسێك گـەلێکی خـۆش بـوێ ئـەوە لەوانـە، هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ :

( المرء مع من احب ) البخاري ، ج٥، ص٢٢٨٣، رقم ٥٨١٦

واتە : پیاو ( مرۆڤ ) لەگەڵ ئەو کەسە دایە کە خۆشی دەوێت [١٤٥]

هەر کەسێ کە پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵەکانی ڕەزای خوایان لێ بێت شوێن کـەوتووانیان، وە شوێن کەوتووەکانی تابیعەکانی خۆش بوێ، وە زاناکانی شەریعەت و ئەهلی حـەدیس و ئەسەری خۆش بوێ لەو سێ سەردەمەی یەکەمین ، وە هەموو ئەوانەشی خۆش بوێ کە تا ئەمڕۆ بە دوای ئـەو بەرنامـە و ڕێبـازە کەوتونـە بـا بـاش بزانـێ ئـەو کەسـە خـاوەنی سوننەیە.

[١٤٥] مەسەلەی خۆشویستن و دۆستایەتی و هاوڕێیەتی کردن لە ئسلامدا زۆر گرنگە، بۆیە پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) دەفەرموێ :

( المرء على دين خليله ، فلينظر أحدكم من يخالل ) المستدرك ، ج٤، ص١٨٨، رقم ٧٣١٩.

واتە: پیاو لەسەر ئاین و ڕێبازی هاوڕێکەیەتی ، با سەیر بکا ئاخۆ کێی بە برادەر گرتووە. وەرگێڕ.

# هەندێ لە ڕاسپاردەکانی پێشەوایانی سەلەف لەبارەی ئاگاداربوون لە خەڵکی بیدعەکەر

- ئەمیری ئیمانداران عومەری کوڕی خەتتاب ڕەزای خوای لێ بێ دەفەرمووێ : ( لەمەودوا خەڵکانێك دێن بە شوبوهاتی قورئان قسان ( گفتوگۆ ) لەگەڵ ئێـوە دەکـەن، بەڵام ئێوە بە سوننە بیانگرن و قسەیان لەگەڵدا بکـەن ، چـونکە خـاوەن و هاوڕێیـانی سوننەتەکان زاناترن بەکتابی خوای گەورە)
- لە عـەبدوڵڵای کوڕی عومـەرەوە دەگێڕنەوە کاتێ کە پرسـیاریان لـێ کـردوە دەربـارەی ئەو کەسانەی کە بەرهەڵستی ( إنكاري ) قەدەر دەکەن ، فەرمویەتی: ئەگەر هـەر کاتـێ گەیشتنە ئەوانە پێیان بڵێن کە عبدالله ی کوڕی عومەر لەوانە بەرییە، وە ئەوانـە لـەمن بەرین ، سێ جار ئەوەی فەرموو.
- عبدالله ی کوڕی عـەبباس ( ڕەزای خـوای لـێ بـێ ) دەفـەرموێ : ( لەگـەڵ خـەڵکی ئارەزوو پەرست دامـەنیشن ، چونکە کۆڕ و کۆبونەوەی ئەوانە، تـەنها دڵ و دەروون ڕەق و نەخۆش دەکات )
- زانای زاهید و خواناس فەزیلی کوڕی عەییاز (ڕەزای خـوای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (قەت خەڵکی بیدعـەکار مەکە ئەمیندار لەسەر ئاینەکـەت ، وە لـەکاری خۆتـدا پـرس و راوێـژی پـێ مەکـە، وە لەگـەڵی دامەنیشـە، وە هەرکەسـێ لەگـەڵ خـەڵکی بیدعـەکار دابنیشێ خوای گەورە دووچاری دلکوێری دەکا )

- ئـەمیری ئیمانـداران لـە فـەرمودەی سـوفیانی سـەوریدا ( رەزای خـوای لێ بـێ ) دەفەرموێ: (هەر کەسێ گوێی خۆی بداتە خـاوەن بیدعـە، وە دەشـزانێ کـە ئـەو کەسـە خاوەن بیدعەیە، تاوانە کە لەو کەسە دادەماڵدرێ و دەچێتە سەر گوێگرەکە)
- کاتێ کە ئیمامی شافعی ( رەزای خوای لێ بێ ) گـەلێکی دیتـوە و زۆر بـە ڕەوانـی قسەیان لەسەر شتێك کـردووە، ئیمام لـم وەڵامیانـدا فەرمویـەتی: (یـا ئێـوە بـە خێـر و خۆشی دراوسێیەتیمان بکەن ، یا لەلای ئێمە هەستن و دوور بکەنەوە).
- پێشەوای ئەهلی سوننە ئیمـامی ئەحمـەدی کوڕی حەنبـەل ( رەزای خـوای لـێ بێ ) دەفەرموێ: (نابێ هەرگیز لە کاروباری موسڵماناندا کۆمەکخوازی (**إستعانة** ) بە خەڵکی بیدعەکار و ئارەزو پەرست بکرێ ، چونکە بەوە گەورەترین زیان بە ئایین دەگا).
- ئیمامی شافعی لـەو گوتەیـەدا حـوکمی خـەڵکی بیدعـەکار و ئـارەزوو پەرسـت ڕوون دەکاتەوە و دەفەرموێ :

(حوکم و بڕیاری من دەربارەی ئەوانەی کە ئەو قسانە دەکەن ، دەڵێم: دەبێ لەسـەر وشـتر بار بکرێن و، بە لاسك (جریـد) یـان لـێ بـدرێ و، بـە بەرچـاوی خەڵکـەوە بـەناو تـیرە و هۆزەکاندا بسوڕێن درێنەوە، وە پێیان بگوترێ ئەوە سزا و پاداشـتی ئـەو کەسـانەیە کـە واز لە کتاب و سوننە دێن و ئەو قسە پڕوپۆچانە دەکەن و وەریان دەگرن).

# بنچینە و بنەمای یازدەم

## بەرنامەی ئەهلی سووننە و جەماعە
## لەبارەی ئاکارو ڕەوشتەکانیان

## ( الأصل الحادي العشر )

## منهج أهل السنة و الجماعة
## في السلوك و الأخلاق

## بەرنامەی ئەهلی سووننە و جەماعە دەربارەی ڕەوشتو ئاکارەکان

**لە بنچینەکانی بیروباوەڕی سەلەفی صالح ، ئەهلی سوننە وجەماعە:**

ئەوەیەکە فەرمان بە چاکە دەکـەن و ڕێ لـە شـەڕ و خراپـە دەگـرن ، ئـەوەش گـەورەترین کارودروشمی ئیسـلامە، هـۆی مانـەوە و پاراسـتنی جەماعـەی ئیسـلامیش ئەوەیـە کـە فـەرمان بـە چـاکە دەکـرێو نـەهی لـە خراپـە دەکـرێ ، ئـەوەیش هەمیشـە واجبێکـی شەرعییە، وەك خوای گەورەش دەفەرموێ :

كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُـونَ بِاللّهِ {آل عمران/١١٠}

واتە: بەراستی ئێوە باشترین ئوممەتن کە لە نێو ئەو خەلکە بۆ ئەو خەڵکە پەیـدا بووینـە، فەرمان بە چاکە دەکەن و ڕێ لە شەرشو خراپە دەگرن و بڕوایان بە خوای گەورە هەیە.

وە پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێ :

پێیان وایە فەرمان بە چاکە کـردن و ڕێ گـرتن لـە خراپـە لەسـەر ئـەم ئوممەتـە بـەکردارو بەگوفتار هەر کەسەو بە پێ ی بۆلوان و توانای خۆی واجـبترین واجبـە ، وەبـەر ژەوەنـدی گشتیش لەوە دایە . بۆیە خوای گەورەش دەفەرموێ :

وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُوْلَئِـكَ هُـمُ الْمُفْلِحُونَ {آل عمران/١٠٤}

واتە : با لە نێو ئێوەدا ئوممەتێك هەبێ ، یا ئێوە هەمووتان ئوممەتێك بن کە خەڵك بەرەو چاکە و ئاینی خوای گەرە بانگ بکەن , وە فرمان بە چاکە بکەن و ، ڕێ لە خراپە بگـرن ، ئەو کەسانە بە تەئکید سەربەرزو سەرفرازن

خوای گەورەش دەفەرموێ :

لَيْسُواْ سَوَاء مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ يَتْلُونَ آيَاتِ اللّهِ آنَاء اللَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ {آل عمران/١١٣} يُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ ويُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَأُوْلَئِكَ مِنَ الصَّالِحِينَ {آل عمران/١١٤}

واتە : جولەکەو گاورە خاوەن کتێبەکان لە مەسەلەی باوەڕ بوون بەخوای گەورە و ئایینداریدا هەموویان وەك یەك نین ، بەلکو لە نێویاندا خەلکانێك هەن بە ئەنجامدانی دروشم و کارەکانی دین هەلدەستن ، لە نیوە شەواندا ئایەتەکانی خوای گەورە دەخوێنن و، سوژدە دەبەن ، بڕوایان بە خوای گەورە و بە رۆژی دوایی هەیە و ، فرمان بە چاکە دەکەن و ، ڕێ لە خراپەدەگرن ، وە لە ئەنجامدانی چاکەو بەدەستهێنانی خێرو پاداشت پێشبڕکێ و پەلە دەکەن ، ئەوانە لە چاکەکارانن

وەپێغەمبەری خوای گەورە ش (ﷺ) دەفەمویێ :

( من رأى منكمْ منكراً فَلْيغيره بيده ، فإن لم يستطع فبلسانه، فإن لم يستطع فبقلبه وذلك أضعف الإيمان ) مسلم

واتە : هەر یەکێك لە ئێوە گوناهو بێ شەرعیەکی دیت ، ئەگەر دەتوانی با بەدەست بیگۆڕێ ، ئەگەر بە دەست نەیتوانی با بە زوبان بیگۆڕێ ، ئەگەر بە زوبانیش نەیتوانی ، با بەدڵ ڕقی لێ ببێتەوە، ئەوە لاوازترین هەلوێستو پلەوپایەی ئیمانە

پێیان وایە واز هێنان لە فرمان بە چاکە کردن و ڕێ گرتن لە خراپە دەبێتە مایەی دابەزینی سزای خوای گەورە بۆسەر بەندەکانی و بەر نەفرەت بوونیان ، وە دەبێتە هۆی

لاداني ئۆممەت وبلاوبوونەوەی فەسادوگەندەلی وخراپەکاری لەژیانی خەلکدا   وەك خـوای گەورە دەفەرموێ :

فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِ أَنجَيْنَا الَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ السُّوءِ وَأَخَذْنَا الَّذِينَ ظَلَمُواْ بِعَذَابٍ بَئِيسٍ بِمَا كَانُواْ يَفْسُقُونَ {الأعراف/١٦٥}

واتە: کاتێ کە ئەوەی بیریان خرابویەوەو ئامۆژگاریان پێکرابوو لـەبیریانکرد ، ئەوانـەمان نغرۆکردن و سزادان ، وەلێ ئەوانەی کەرێگریان لە خراپـەکاری دەکـرد رزگارمـان کـردن ، وەئەوانەی کە ستەمیان لە خۆ و لە خەلك دەکرد سـزایەکی سـەخت و دژوارو گیرۆدەمـان دان بە هۆی ئەو گوناهو تاوان و خراپەکارییەی کە دەیانکرد

وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

لُعِنَ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَى لِسَانِ دَاوُودَ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ ذَلِكَ بِمَا عَصَوا وَّكَانُواْ يَعْتَدُونَ {المائدة/٧٨} كَانُواْ لاَ يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ لَبِئْسَ مَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ {المائدة/٧٩}

واتە : لەسەرزاری حەزرەتی داوودو عیسـای کـوری مەریـەم ( سـەلامی خـوای گـەورەیان لەسەر بێـت ) نەفـەرت لـەو بێباوەڕانـەی بـەرەو نـەوەی ئیسـرائیل کـرا بـەهۆیْ ئـەوەی کەلەخوای گەورە یاخی بوون و سەر پێچیان دەکردو، دەستدرێژیان دەکـرد ، وە رێیـان لـە وتاوان و خراپانە نەدەگرت کە دەیانکرد ، بەراستی ئەوە کـارێکی زۆربـەد و خـراپ بـوو کە دەیانکرد

**ئـەهلی سوننە و جەماعـە:** بڕوایـان وایـە کـە دەبـێ ئـەمر بـە مـەعروف و نـەهی لـە مونکەریش نەرمی تێدابێ، وە دەبێ بانگەوازیش بە لێزانی و بەپەنـدو ئامۆژگـاری چـاك وپڕ لەنرخو بەها بێ ، وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

ادْعُ إِلِى سبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِـيَ أَحْسَـنُ إِنَّ رَبَّـك هُـو أَعْلَمُ بِمن ضَلَّ عَن سبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ {النحل/١٢٥}

واتە: ئەی محمد ﷺ بانگەوازی بۆ لای ڕێباز و بەرنامەی خوای گەورە بکـە، بـە لێزانـی و بە پەند و ئامۆژگاری چاك ، وە بە جوانترین شێوە گفتوگۆیان لەگەڵـدا بکـە، بـۆ ئـەوەی سەرگەردان و هەرەتە نەبن و دور نکەونەوە لە خوای گەورەو لە ئیسلام ، خوای گەورە لە تۆ ئاگادارترە ئاخۆ کێ لەڕێ ی خوای گەورە لای داوەو سەر لێشـێواوە و، خـوای گـەورە لە تۆ ئاگادارترە ئاخۆ کێ ڕێنمایی کراوە

وە دەڵێن دەبێ پیاو ئارام لەسەر ئازاردانی بگرێ، ئەگەر کاری فـەرمان بـە چـاکە بکـا و نەهی لە خراپە بکا، چونکە زۆر کۆسپ و تەگـەرە و تـاڵیو ناسـۆریو ئاسـتەنگی دێنـە ڕێ ، وەك خوای گەورە لەسەر زاری لوقمانی حەکیم دەفەرموێ :

يَا بُنَيَّ أَقِمِ الصَّلَاةَ وَأْمُرْ بِالْمَعْرُوفِ وَانْهَ عَنِ الْمُنكَرِ وَاصْبِرْ عَلَى مَا أَصَـابَك إِنَّ ذَلِـكَ مِـنْ عَزْمِ الْأُمُورِ {لقمان/١٧}

واتـە ئـەی ڕۆڵەکـەم ، نوێـژ بکـەو، فرمـان بەچـاکە بکـە و ڕێ لـە خراپـە و ئـاژاوە و ناشەرعی بگرە ، سەبر لەسەر ئەو ئێش و ئازارو تاڵی وناسـۆریانە بگـرە کـە دەت هێنـە ڕێ ، ئەوە لە ورە بەرزی و خۆڕاگری کارکردنە

دوای ئەوەی کە بە کاری فەرمانکردن بە چاکە و نـەهی کردن لـە خراپـە هەڵدەسـتن، لـە هەمان کاتیشدا دوو ئەرکی تری گرنگیان دەکەوێتە سەرشان ، کە برتییە لە:

١- پارێزگاری کردن لە جەماعە و پێکەوە گرێدانی دڵان

٢- بەرپاکردنی برایەتی و تەبایيو یەکدەنگی و وەلانان و لەنێو بردنی پارچە پارچەیی و ناکۆکی ڕیزەکان

**ئـەهلی سـوننە:** هەڵدەسـتن بـە ئامۆژگـاری کردنـی هـەموو ئینسـانێکی موسـڵمان و، یارمەتی دانیان لەسەر خێر و چاکە و خواپەرستی ، وك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ :

(الدين النصيحة ، قلنا لمن يارسول الله ﷺ ، قال : لله و لكتابه ولرسوله وللأئمة المسلمين وعامتهم) مسلم

واتە: دین خۆی لە خۆیدا ئامۆژگاری (دلسۆزی) یە، سەحابەکان گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ کێ ئامۆژگاری یە ، فەرمووی : ئاین ئامۆژگاری‌و دلسۆزی یە بـۆ خـوا و بـۆ کتابی خوا و بۆ پێغەمبەری خوا و بۆ پێشەواکانی موسڵمانان و بۆ خەڵکی بـە گشـتی واتە: دلسۆزی بوونە لەگەل هەموو ئەوانەدا

وە هاوکاری یەکترکردن لەسەر خێرو چاکە پارێزکاری بە واجب دەزانن

وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُواْ عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَاتَّقُواْ اللّهَ إِنَّ اللّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ {المائدة/٢}

واتە : ئەی خەڵکینە ، لەسەر خێرو چاکەو پارێزکـاری هاوکـاری یـەکتر بکـەن ، لەسـەر سـتەم و ناشـەرعی و خراپـەو دوژمنکـاری هاوکـاری یەکترمەکـەن ، لـە خـوای گـەورەو میهرەبان بترسن ، سزای خوای گەورە توندو بەئازارە

**ئەهلی سوننە و جەماعە:** سورن لەسەر پاراسـتنی کـارو دروشـمـەکانی ئیسـلام ، وەك : بەرپابوونی نوێژی جومعە و جەماعەت [١٤٦]، وەك حەج [١٤٧] و جیهاد و جەژنـەکان ، جا

---

[١٤٦] وەك خوای گەورە دەفەرموێ
حَافِظُواْ عَلَى الصَّلَوَاتِ والصَّلاَةِ الْوُسْطَى وَقُومُواْ لِلّهِ قَانِتِينَ {البقرة/٢٣٨}

واتە : هەمیشە پارێزگاری لە نوێژەکانتان بکەن و پێیانەوە پابەند و سەرگەرم بن ، هەموو نوێژەکان و نوێژی ناوەڕاست (عەسر) بکەن ، وە تۆبە بکەن و هەمیشە دەست بە دەستنوێژ و نزا وپاڕانەوەو چاو بە فرمێسك بن بۆ خوای گەورە

وە خوای گەورە سەبارەت بە گەورەیی و گرنگی نوێژ دەفەرموێ :

إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاء وَالْمُنكَرِ وَلَذِكْرُ اللَّهِ أَكْبَرُ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ {العنكبوت/٤٥}

واتە: بەڕاستی نوێژ ئینسان لە کاری بەد و ناشەرعیو خراپ دەپارێزێ .

وە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ( الصلاة عماد الدين )

واتە: نوێژ کۆڵەگە و بڕ بڕەی ئایینی پیرۆزی ئیسلامە .

وە دەفەرموێ : (العهد الذي بيننا وبينهم الصلاة فمن تركها فقد كفر) إمام احمد .

واتە: ئەو پەت و پەیمانو جیاوازییەی کە لە نێوان ئێمە و ئەوان ( کافرەکان) دا هەیە نوێژە، هەر کەسێك نوێژ نەکا و بڕوای پێی نەبێ پێی کافر دەبێ

وە دەفەرموێ : ( تارك الصلاة ملعون ملعون ، وجاره ملعون إن رضي به ) .

واتە: نوێژنەکەر نەفرەت لێکراوە ، کەسو کارو دراوسێکەشی بەهەمان شێوە نەفرەت لێکراوە ئەگەر پێی رازی بێت .

وە دەفەرموێ : ( صلوا كما رأيتموني أصلي ) بخاري .

واتە: وەکو من نوێژ بکەن کە دەمبینن چۆن نوێژ دەکەم .

وە دەفەرموێ : (صلاة الجماعة تفضل صلاة الفذ بسع وعشرين درجة ) بخاري .

واتە: نوێژی بە کۆمەڵ بە ( ٢٧ ) دەرەجە خێری لە نوێژی بە تەنیا زیاترە.

و ەدەفەرموێ : ( إن أحدكم إذا صلى يناجي ربه ) البخاري .

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە نوێژی کرد با هاواری خوای گەورە بکات و لە خوای گەورە بپاڕێتەوە تیایدا، چونکە بەهۆی ئەوە سەربەرز و سەرفراز دەبێت .

وە دەفەرموێ : ( من صلى صلاتنا، واستقبل قبلتنا، وأكل ذبيحتنا ، فذلك مسلم ) بخاري .

چ لەگەڵ فەرماندە چاکەکان بێ یا لەگەڵ فەرماندە خراپ و تاوانبارەکان بێ، تەنها بیدعەکار نەبن ، دەبێ ئەو ئەرکەیان لەگەڵدا ئەنجام بدرێت ، چونکە هەر یەکێك لەو ئەرکانە بە کۆمەڵ نەبێ ناکرێن .

وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ {١} الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ {المؤمنون/٢}

واتە : بێگومان ئیمانداران سەربەرزو سەرفرازن ، ئەوانەی لە ئەنجامدانی نوێژەکانیان گەردەنکەچ و مل کەچن بۆ خوای گەوە .

وە پەلە دەکەن لە جێ بەجێ کردنی نوێژە نووسراوو فەرزکراوەکان (صلوات المكتوبة)[١٤٨] و، سوورن لەسەر کردنیان بە جەماعەت لە سەرەتای بانگەوە،

---

واتە: هەرکەسێك نوێژی ئێمەی کرد، وە ڕووی لە ڕووگەی ئێمە کرد، وە سەربڕاو و قوربانی ئێمەی خوارد، ئەوە موسڵمانە.

وە دەفەرموێ : ( إن صلاة شغلاً ) بخاري .

واتە: بەڕاستی نوێژ خێرو بەرەکەت و ڕەحمەت و خشوع و خضوع و خەریك بوونە...) ە لەگەل خوای گەورە . وەرگێڕ.

[١٤٧] . بۆیە سەبارەت بە گەورەیی حەج ، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ : ( نعم الجهاد الحج ) بخاري :

واتە : خۆشترین جیهاد حەجە

وە دەفەرموێ : ( الحج المبرور ليس له جزاء إلا الجنّة ) بخاري .

واتە: حەجی تەواو و چاك و پاكو وەرگیراو پاداشتەکەی لای خوای گەورە تەنها بەهەشتە. وەرگێڕ.

[١٤٨] . چونکە خوای گەورە دەفەرموێ :

إِنَّ الصَّلَاةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَابًا مَّوْقُوتًا {النساء/١٠٣}

**چونکە کردنی نوێژەکان لە سەرەتاکەی خێرترە لە کۆتاییەکەی ، وە فەرمان بـەوە دەکەن کە دەبێ نوێژکەر لە نوێژەکەدا ملکەچ بێ بۆ خوای گەورە و دڵ و دەروونی تەنها بە خوای گەورەوە بەند و ئۆقر بێت .**

**ئـەهلی سوننە و جەماعـە : وە سـیەت دەکـەن کـە موسـڵمانان لـە شـەوەکاندا هەستنەوە بۆ ئەنجامدانی خواپەرستی ، چونکە ئەوە یەکێکە لە دیارییەکانی خوای گەورە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ، بۆیە خوای گەورە فەرمانی پێ کردووە [149]**

---

واتە: نوێژ لەسەر ئیمانداران بەکاتێکی دیاریکراوو نوسراو و بڕیار دراوە کە دەبێ هەمو جار لـەو کاتە دیاریکراوەدا بکرێت .

وە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ : (الصلاوات الخمس إلا ان تطوع شيئاً) بخاري .

واتە: نوێژە پێویستەکان تەنها پێنجن، ئەگەر یەکێك بۆ خۆی زیاد بەخێر نوێژی تری سوونەت بکا ، خێری دەگاتێ

وە لە پێغەمبەریان پرسی (ﷺ) چ کردەوەیەك زۆر بە خێرە؟ لە وەڵامدا فەرموی: ( الصلاه على وقتها ) بخاري .

واتە: نوێژ کردن لە کات و ساتی خۆیدا زۆر بە خێروگرنگە. وەرگێڕ.

[149] . وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ {١} قُمِ اللَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا {٢} نِصْفَهُ أَوِ انقُصْ مِنْهُ قَلِيلًا {المزمل/٣}

واتە: ئەی ئەو کەسەی (ئەی پێغەمبەر) کە خۆت لەناو پەتو و پێخەودا پێچاوەتەوە و خۆت حەشار و مەلاس داوە، دە هەموو شەوان: شەو هەستە بۆ خواپەرستی (بۆ شەونوێژ)، تەنها کەمێك لە شەو نەبێ، جا نیو شەو خواپەرستی بکە یا کەمێك لە نیوەی کەمتر خوا پەرستی بکە، تـا جەسـتەت شەکەت و کپ نەبێ، ئەوەش بۆ ئەوەی خۆت بۆ رابەرایەتی و سەرکردایەتی کردنی بەرەی مرۆڤایەتی ئامادە بکەیت . وەرگێڕ.

وە خاتوو عائیشەی دایکی ئیمانداران ( رەزای خوای لـێ بـێ ) دەگێڕێتـەوە کـە پێغەمبەری خوای گەورە (ﷺ) شەوان هەڵدەستایەوە عیبادەتی دەکرد تا هەردوو پێیەکانی دەئاوسان . حەزرەتی عائیشەش پێی دەگوت : ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە بۆ وادەکەی لە کاتێکدا خوای گەورە لە گوناهەکانی پێش و پاشی تۆ خۆش بووە، پێغەمبەریش (ﷺ) دەیفەرموو:

(أفلا أحب أن أكون عبداً شكوراً) بخاري .

واتە: ئەی عائیشە ئایا پێم خۆش نیە کە ببمە بەندەیەکی سوپاسگوزار؟ بۆیە ئاوا خۆماندوو دەکەم .

**ئەهلی سوننە و جەماعە:** لە کاتی تاقیکردنەوەکانیاندا بەوە جێگیر و دامـەزراو دەبن کە لە کاتی بەلاوموسیبەتدا سەبرو ئارام دەگرن ، وە لە کاتی خێر و خۆشیدا سوپاسی خوای گەورەیان دەکەن ، وە لە کاتی قەزا و قەدەردا ڕازی دەبن و خۆیان تەسلیمو ڕادەستی خوای خۆیان دەکەن . وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ {الزمر/١٠}.

واتە : بێگومان خـوای گـەورە بـەبێ حسـاب و شـومار خێـرو پاداشـی خـۆڕاگران دەداتەوە

وەپێغەمبەری خوای گەورەش (ﷺ) دەفەموێ :

ان عظم الجزاء مع عظم البلاء، وان الله اذا أحب قوما ابتلاهم ، فمن رضي فله الرضى ، ومن سخط فله السخط . البخاري .

واتە : گەورەیی خێروپاداشت بەپێ ی زۆری و گـەورەیی دەردو بەلایـە، وە ئەگـەر خوای گەورە گەلێکی خۆش ویست بەدەردو بەلا و ناخۆشی تاقیان دەکاتەوە ئاخۆ لێ ی دەردوچن ، جا هەرکەسێك بە ناخۆشـی و تاقیکردنـەوەکانی خـوای گـەورە رازی بـێ، خـوای گـەورە لـێ ی رازی دەبـێ، وەهەرکەسـێکیش لەناخۆشـی و تاقیکردنەوەکانی خوای گەورە ناڕازی و دلگـران بـێ، خـوای گـەورە لێـی نـارازی دەبێت .

وە هەرگیز داوای بەلاو پەتەر لە خوای گەورە ناکەن و نایخوازن، چونکە ئەوان نازانن ئەگەر بەلایان بەسەر بێ ئاخۆ خۆڕاگر دەبن یان نا؟، وەلـێ ئەگـەر لـە لای خـوای گەورە بەلایان بۆ هات و تاقی کرانەوە، سەبرو ئارامی لەسەر دەگرن و سوپاسی خوا دەکەن .

وەك پێغەمبەری خوای گەورە (ﷺ) دەفەموێ :

**لاتتمنوا لقاء العدو، واسألوا الله العافية ، فاذا لقيتموهم فاصبروا ، واعلموا أن الجنة تحت ظلال السيوف . (صحيح سنن الترمذي) للألباني .**

واتە : خۆزگەی ڕوبەروبوونەوە و بەیەکگەیشتن لەگـەل دوژمـنـدا مـەخوازن، داوای خێرو خۆشی لە خوای گەورەومیهرەبان بکەن ، ئەگەر لەگەل دوژمندا بەیەکگەیشتن و رووبەروو بوونەوە خۆڕابگرن ، چۆك مەدەن و مەبەزن ، بزانن کە بەهەشت لە ژێر پێی دایکان دایە، واتە بەهۆی بەدەست هێنانی رەزامەندی دایکان خوا لێتان رازی دەبێ و دەچنە بەهەشت .

**ئەهلی سوننە :** لە کاتی هاتنی بەلاَ و پەتەر و موسیبەت‌و مەینەتیدا لە ڕەحمەتی خوای گەورە بێ هیوا و ئومێد نابن، چونکە خوای گەورە ئەوەی حەرام کردوە [150]، بەڵکو لەو ڕۆژانەدا ( لە ڕۆژانی پڕ بەلاَ و تاڵی و ناسۆرییدا ) لەسەر هیواوئاواتێك دەژین کە زوو دەروی خێرایان لێ ببێتەوە، وە لەسەر ئارامیـەك دەژیـن کـە بـڕوای تەواوایان پێیەتی، بۆیە زۆر متمانەیان بە بەڵێنی خوای گەورە هەیە، وە دەزانن کە هـەمو تـاڵی‌و تەنگاویـەك خۆشـییەکی لەگەڵدایـە، وە هۆیـەکانی ئـەو بـەلاَ و ناخۆشییانە لە دڵ و دەروونی خۆیاندا دەتوێژنەوە و لێکی دەدەنەوە، وە بڕوایان وایە کە پەتاو پەتەر و ناخۆشی وبەلاَیان توش نابێ، مەگەر بەهۆی گوناهوتاوان ولادانی خۆیان‌و فرمانی خوای گەورەوە نەبێ ، وە دەزانن کە سەرکەوتنیش پاش‌و پێش‌و دوا دەکەوێ ، بەهۆی ئەوەی کە بـاش پـەیڕەوی لەفەرمانـەکانی خـوای گـەورە و پێغەمبەر (ﷺ) ناکەن و بەهۆی ئەوەی کە کەوتونە نێو گوناه و تاوانـەوە، وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

وَمَا أَصَابَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُو عَن كَثِيرٍ {الشورى/٣٠}

واتە: ئەو بەلاَ و ناخۆشیانەی کە توشتان بوونە، بەهۆی ئەوەیە کە بەدەستی خۆتان بەدەستان هێناوەو ئەنجامتان داوە .

وە لە کاتی تەنگانە و ناخۆشیداو، بۆ سەرخستنی ئایینی خوای گەورە، پشـت بـە هۆکارەکـانی زەمـین و شـتە فریـودەرو دونیاییـەکان نابەسـتن ، وە لـە یاسـاکانی

---

[150] . وەك خوای گەورە دەفەرموێت : ... فَلاَ تَكُن مِّنَ الْقَانِطِينَ {٥٥} قَالَ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِ إِلاَّ الضَّآلُّونَ {الحجر/٥٦}.

واتە: هەرگیز لە ڕەحمی خوای گەورە بێ هیوا و هومێد مەبن، تەنها گومڕا و ستەمکاران لە ڕەحمی خوای گەورە بێ هیوا و ئومێد دەبن. وەرگێڕ .

بوونەوەریش بەری و بێ ئاگا نابن، بەڵکو وا دەزانن کە لە خوا ترسان و پەشـیمان بوونـەوە لـە گونـاھ و تاوانـەکان و، پشـت بەسـتن بـە خـوای گـەورە لـە ھـەموو کاتەکانداو، سوپاسکردنی خوای گەورە لەکاتی خێر و خۆشیدا ھۆکاری زۆر گرنگ و کاریگەرن کە بەھۆی ئەوانەوە خێر و خۆشـی و ئاسـودەیی لـە دوای تەنگانـە و ناخۆشی بگەڕێتەوە نێو ئومەتەکەمان .

**ئەھلی سوننەو جماعە:** بروایان وایـە کـە لـە ژیانـدا لـە لایـەن خـوای گـەورەو میھرەبان لەبارەی کاروباری دونیاو دوارۆژیاندا بەجۆرەھا شێوە تاقی کراونەتەوە، ئەو تاقیکردنەوەو دەردو بەلا و پەتەرانەش بۆیان دەبێتە کەفارەت بۆ رەشبوونەوەی گوناھو تاوان و ھەلەو کەمو کوریەکانیان ، و مایەی بەرزبوونەوەی خێرو پاداشت و پلەوپایەیان.

وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

هُنَالِكَ ابْتُلِيَ الْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا زِلْزَالًا شَدِيدًا {الأحزاب/١١}

واتە : لەوێدا بڕواداران تاقی کرانەوە و ، دوچاری تاقیکردنەوەیەکی زۆر سەخت و بەھێز بوون، دلەکانیان زۆر بەتوندی ڕاچلەکاو لەرزا

وەپێغەمبەری خوای گەورەش (ﷺ) دەفەموێ :

مايزال البلاء بالمؤمن والمؤمنة في نفسه وولده وماله ، حتى يلقى الله وما عليه خطيئة . (صحيح سنن الترمذي) للألباني . واتە : ھەمیشە خوای گەورە ئینسانی ئیمانداری پیاو و ئافرەت دوچاری دەردو بەلا دەکات و ، بە خۆی و بەسەر و مال و منال و دایك و باوکی تاقی دەکاتەوە ، تا بە خوای گەورە دەگات سەبارەت بەوەی کە لەسەریەتی .

وەپێغەمبەری خوای گەورە (ﷺ) دەفەموێ :

**الدنيا سجن المؤمن ، وجنة الكافر . مسلم .**

واتە : دونیا بەندیخانەی ئیمانداره لەبەر ئەوەی لەبەر ترسی خوای گەوره ناتوانێ بەئارەزوی خۆی هەموو شتێك بکات و سنوره کانی خوای گەوره ببەزێنێت ، کەچی بەهەشتی ئینسانی بێباوەڕە لەبەر ئەوەی لەخوای گەوره ناترسێ و بەئارەزووی خۆی هەموو شتێك دەکات و لە هیچ ناگەڕێتەوە و حساب بۆ قەبرو قیامەت و حەشرو حساب ناکات .

**ئەهلی سوننەو جماعە:** زۆر لەوە دەترسن کە گەڵ بەهۆی ئەوەوە سزا بدرێ کـە کوفرانەی نیعمەتەکانی خوای گەوره دەکا و بڕوای بەو نیعمەتانە نییە، بۆیە ئەوان لە هەموو خەڵکی مکوڕترن لەسەر سوپاس و ستایش کردنـی خـوای گـەوره وبـێ هاوتاو ، هەمیشە لەسـەر ئـەوە بـەردەوامن لـەبارەی هـەموو نیعمەتـە گچـکە و گەورەکانەوە کە خوای بێ هاوتا بە بوونەوەر و بە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بەخشیون.

وەك پێغەمبەری خوای گەوره (ﷺ) دەفەموێ :

**انظروا الى من هو أسفل منكم ، ولا تنظروا الى من هو فوقكم ، فانه أجدر أن لا تزدروا نعمة الله عليكم . (صحيح سنن الترمذي) للألباني .**

واتە : لە هەندێ شتدا تەماشای ئەوکەسە بکەن کە لە خوار خۆتانەوەیە ، سەیری ئەو کەسە مەکەن کە لەسەرووی ئێوەیە ، ئەوە شایستەترە بۆ ئەوەی کە نازوو نیعمەتی خوای گەوره نە پوکێنێتەوەو لای نەبات .

**ئەهلی سوننەو جماعە :** کاتێ کەیادی خوای گەورە دەکەن لـە تـرس و لـە ڕێـزو خۆشەویستی خوای گەورە دلیان ڕادەچلەکێ ، پێستیان ڕێك دێت .

وەك پێغەمبەری خوای گەورە (ﷺ) دەفەموێ :

إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ { ٢} الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ {٣} أُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا لَّهُمْ دَرَجَاتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ {الأنفال/٤}

واتە: بەڕاستی بڕواداران ئەو کەسانەن، کاتێ کە باسی خوایان لەلا دەکرێ، یەکسەر دڵیان ڕادەچڵەکێ و وێك دێن، وە کاتێ کە ئایەتەکانی خوای گـەورەیان بەسـەردا دەخوێندرێتەوە ، یەکسەر ئیمانیان پێی زێدە دەبێ و ، زیاتر پشت بەخوای خۆیان دەبستن ، ئەوانەش ئەو کەسانەن کە نوێژ دەکەن ، وەخێرو سەدەقە دەکەن لەو رزق و ڕۆزیو دارایی یەی کە خوا پێی داون دەیبەخشـن ، بەراسـتی ئەوانـە بـڕواداری تەواو و ڕاستەقینەن ، لەلای خوای خۆیان پلەو پایەی بەرزیان بۆ هەیە ، وە رزق و ڕۆزیەکی نەبڕواوە و لێخۆشبوونیان بۆ هەیە

**ئەهلی سـوننەو جماعـە :** بـە جـوانترین ئاکـار و ڕەوشـت کـار و کـردەوە خۆیـان ڕادەزێننەوە، وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ :

(أكمل المؤمنين إيماناً أحسنهُمْ أخلاقاً) صحيح سنن الترمذي /الألباني .

واتە: تەواوترین بڕوادار ئەوەیە کە لە ڕووی ئیمانەوە ئیمانی تـەواوتر بـێ، وە لـە ڕووی ئاکارو کردەوە وە، ڕەوشتی لە خەڵکی تر جوانتر بێت .

وە دەفەرموێ : (إن من أحبكم إليّ وأقربَكُم مني مجلساً يوم القِيامـة ، أحسـنكم أخلاقاً ) صحيح سنن الترمذي والألباني .

**واتە: ئەو کەسەتان لەلای من لە هەمووان خۆشەویستترە و، لە کـۆڕ و کۆبونـەوەی ڕۆژی دواییدا لەمن نزیکترە کە لەهەمووتان ئاکار و ڕەوشتی بەرزوجوانترە [151]**

---

[151] . بۆیە خوای گەورەش زیاتر بە ئاکار جوانی مەدح و سەنای پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەکا، وەك دەفەرموێ :

**وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ {القلم/٤}**

واتە: ئەی موحەممەد بەڕاستی تۆ لەسەر ڕەوشتێکی زۆر جوان و بەرز و گەورەی .

وە حەزرەتی عائیشەی دایکی ئیمانداران لە باسی پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ : کان خلقه القرآن.

واتە: ڕەوشت و ئاکاری پێغەمبەر (ﷺ) هەمووی بریتی بوو لە قورئانی پیرۆز ، بەپێی قورئان و سروش هەڵس و کەوتی دەکرد .

وە بۆ خۆشی (ﷺ) دەفەرموێ : ( إنما بعثت لأتمم مكارم الأخلاق ) .

واتە: من بۆ ئەوە نێردراوم تا ئاکار و ڕەوشتی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی تۆکمە و چاك بکەم. وەرگێڕ .

( ۱ ) چونکە خوای گەورە دەفەرموێ :

إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيراً {النساء/١٤٥}.

واتە : بێگومان دووڕووەکان لە نێو ئاگردا لە کونج و گەلێری هەرە خوارەوەن، وەرگێڕ.

( ۲ ) وەك پێغەمبەر ( ﷺ ) دەفەرمووێ : ( المؤمن هين لين )

واتە: پیاوی ئیماندار لەسەر خۆ و نەرم و نیانە، وەرگێڕ.

( ۱ ) وەك خوای گەورە دەفەرمووێ : وَالْمُسْتَغْفِرِينَ بِالأَسْحَارِ {آل عمران/١٧}.

واتە: بڕواداران هەمیشە بە سپێدە و بە بەرەبەیانان داوای تەوبە و لێخۆش بوون لـە خـوای گـەورە دەکەن. وەرگێڕ.

( ۲ ) وەك جەعفەری کوڕی محمد دەفەرمووێ :

( إلتمس لأخيك سبعين عذراً ) شعب الإيمان / ج ٦ ، ص ٣٢٣ ، رقم / ٨٣٤٤

واتە: حەفتا پەڵپ و پۆزش بۆ براکەت بێنەوە و یەکسەر حوکمی بەسەردا مەدە. وەرگێڕ .

( ١ ) چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ : ( طوبى لمن شغل عيبه عن عيوب الناس ) .

واتە : خۆشی بۆ ئەو کەسەی کە بە عەیبەکانی خۆی خەریکە، لە جیاتی ئەوەی بەس بە عەیبەکانی خەڵکی ترەوە خەریك بێت . وەرگێڕ.

( ٢ ) چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ : ( الحياء شبعة من الإيمان ) .

واتە : شەرمو حەیا بەشێکە لە ئیمان .

وە دەفەرمووێ : ( الله أحق ان يستحيا منه ) بخاری .

واتە : خوای گەورە لە هەموو کەس شایستە ترە کە شەرمی لێ بکرێت. وەرگێڕ.

( ٣ ) چونکە خوای گەورە دەفەرمووێ :

فَلْيَضْحَكُواْ قَلِيلاً وَلْيَبْكُواْ كَثِيراً جَزَاء بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ {التوبة/٨٢}

واتە: ئەی خەڵكینە زۆر بگرێن و کەم پێبکەنن .

وە پێغەمبەر یش (ﷺ) دەفەرمووێ :

( لو تعلمون ما أعلم لضحكتم قليلاً ولبكيتم كثيراً ) بخاری .

واتە: ئەوەی من دەیزانم ئەگەر ئێوەش بیزانن، زۆر دەگرێن و کەم پێدەکەنن .

وە دەفەرموێت : ( كثرة الضحك تميت القلب ) . واتە : زۆر پێکەنین دڵ دەمرێنێت .

( ١ ) وەك خوای گەورە دەفەرمووێ :

وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ {الحشر/٩}.

واتە: بڕواداران لەژیانی دونیا سیفەتیان وایە ،خەڵك وەپێش خۆدەخەن ولەسەر خۆهەڵیان دەبژێرن، ئەگەرچی بۆ خۆشیان دوچاری هەژاری ونەداری دەبن وپێویسیان پێیەتی .وەرگێڕ.

( ٢ ) چونکە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ :

( من كان يؤمن بالله واليوم الاخر فليكرم ضيفة ) بخاری .

واتە: هەرکەسێ بڕوای بەخوای گەورە و بەدوارۆژ هەیە، بارێز لەمیوانەکەی خۆی بنێت .

وە دەفەرموێ : ( الضيافة ثلاث أيام ) بخاری .

واتە: میوانداری لای کەمی تا سێ ڕۆژان واجبە ، دواتر سووننەتە

وسەبارەت بەخواردن وبەرەکەتی میوان دەفەرموێ :

( طعام الاثنين كافى الثلاثة ) بخاری .

واتە: لەکاتی هاتنی میواندا، خواردنی دووان بەس دەکا بۆسێیان . وەرگێڕ.

( ٣ ) چونکە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ :

( لا تصحاب الا مؤمنا ولا يأكل طعامك إلا تقي ) أبو داود/ج ٤ ، ص ٢٥٩، رقم/٤٨٣٢.

واتە: تەنها بڕوادار بکە بەدۆستو پشتیوانو هاوەڵی راستە قینەی خۆت، وە خواردن وخۆراکی خۆت بدەبە پیاوی خواناس . وەرگێڕ.

( ١ ) چونکە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ :

( ليس منا من لم يرحم صغيرنا ويوقر كبيرنا ) المستدرك على الصحيحين/ج١/ص١٣١، رقم/٢٠٩.

واتە : ئەوکەسە لەسەر ڕێبازی ئێمە نییە ئەگەر ڕەحم بەگچکەکان نەکات ، وە گچـەکانیش ڕێـزی گەورەکان نەزانن . وەرگێڕ.

( ٢ ) چونکە خوای گەورە دەفەرمووێ :

فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ {الحجرات/١٠}.

واتە: چاکسازی لەنێوان دڵان و براکانتاندا بکەن ، لەخوای گەورە بترسن ، بەڵکو خوای گەورە ڕەحمتان پێ بکات .

وە خوای گەورە دەفەرمووێ :

وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِن بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِن فَاءَتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ {الحجرات/٩

واتە: ئەگەر دوو دەستەوتاقم و کۆمەڵ لـە ئیمانـداران لەگـەڵ یـەکتری بەشـەڕ هـاتن و یەکتریان کوشت، ئاشتەوایی و تەبایی یان لەنێواندا بکـەن ، ئەگـەر یـەکێکیان لەسـەر ئەویکە یاخی بوو و نەهاتە ژێر باری دانوستان و ئاشتەوایی ، لەگەڵ ئەوەدا شەڕ بکەن کەیاخی بووە تا دەگەرێتەوە لای حوکم و فرمانی خوای گـەورە و رازی دەبـێ ، ئەگـەر گەرایەوە لای حوکمی خوای گەورە و پـێ ی رازی بـوو ، بەدادگـەریی ئاشـتەوایيان لـە نێواندا بکەن ، چونکە خوای گەورە دادگەرانی خۆش دەوێت . وەرگێڕ.

( ٣ ) چونکە خوای گەورە لەبارەی ئەوە دەفەرموێ :

وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حُسْنًا وَإِن جَاهَدَاكَ لِتُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا {العنکبوت/٨}

واتە: ئامۆژگاریو وەسیەتمان بەئینسان کردوە کەلەگەڵ دایك وباوکی دا چاك بێو قسەی خراپو سوکیان پێ نەڵێ ، وەلێ ئەگەر هەولیان لەگەل دای شیرك بۆمن پەیدا بکەی کە هیچ زانست و زانیاریت دەربارەی نیە و کاری تۆ نیە ، بە گوێیان مەکە ، خوای گەورە لەوان گەورترە . وە دەفەرمووێ :

فَلاَ تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلاَ تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلاً كَرِيمًا {الإسراء/٢٣}.

واتە: گچکەترین شتی ناشیرین ودڵ بریندرکەر بەدایك وباوکتان مەڵێن ، زوێرو هەراسانو هەڵەتەیان مەکەن، بەڵکوقسەی بـەرێزیان لەگەڵدا بکـەن، وەپێغەمبـەر(ﷺ) دەفـەرموێ : یـەکێك لەتاوانـە گەورەکان ئازاردانی دایك وباوك ( عقوق الوالدين ) ە . وەرگێڕ.

( ١ ) وەك پێغەمبەر (ﷺ)دەفەرمووێ :

( مازال جبریل یوصینی بالجارحتی ضننت أنه سیورثه ) بخاری .

واتـە : خۆشەویستەکەم ، فریشـتە جبریـل هێنـدە ئامۆژگـاری پـێ کـردم دەربـارەی دراوسـێکانم کەلەگەلیاندا باش بم ، تاوام زانی ئەگەر مردم ، دراوسێیەکەم میراتم لێ دەرگێت .

بۆیە پێغەمبەر (ﷺ)دەفەرمووێ :

( من کان یؤمن بالله والیوم الاخر فالیکرم جاره ) بخاری .

واتە : هەرکەسێك بڕوای تەواوی بەخواگەورە و بەڕۆژی دوای هەیە، بارێز لەدراوسێکەی بگرێـت . وەرگێڕ.

( ٢ ) چونکە پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) دەفەرمووێ : ( لا یدخل الجنة قاطع ) بخاری .

واتە: ئەو کەسە ناچێتە نێو بەهەشت کەصیلەی ڕەحم دەبڕێت .

وە دەفەرمویێ : ( من کان یؤمن بالله والیوم الاخر فالیصل رحمه ) بخاری .

واتە : هەرکەسێك ئیمانی تەواوی بەخوای گەورە و بەڕۆژی دوایی هەیە، باصیلەی ڕەحم جێبـەجێ بکات . وەرگێڕ.

( ٣ ) چونکەخوای گەورە سەبارەت بە بەد گومانی دەفەرمووێ :

إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ {الحجرات/١٢}

واتە: هەندێ گومان بردن گوناهو تاوانە ، بۆیە خۆیان لێبپارێزن ، لە خۆتانەوە بە بێ بەلگە گومانی خراپ بەخەلك مەبەن .

وە دەربارەی جاسوسی کردن دەفەرموێ : وَلَا تَجَسَّسُوا {الحجرات/١٢}

واتە : هەرگیز سیخوڕی لەسەر یەکتری مەکەن .

وە پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرمووێ : ( ولا تجسسوا ولا تحسسوا ) بخاری .

واتە: هەرگیز سیخوڕی لەسەر یەکتری مەکەن و بەدوای ئەنگەکانی یـەکتر مەکـەون و هەسـت لـە ئەنگەکانی یەکتری ڕامەگرن . وەرگێڕ.

وەپێغەمبەری خوای گەورە (ﷺ) دەفەموێ :

ما من شيء يوضع في الميزان أثقل من حسن الخلق ، وان صاحب حسن الخلق ليبلغ به درجة صاحب الصوم والصلاة . (صحيح سنن الترمذي) للألباني .

واتە : هیچ شتێك کە لە ترازوو دادەنرێ لە جوانی کردارو گوفتارو رەوشت گرانتر و بە نرختر نیە ، بۆیە خاوەنی کردارو گوفتارو رەوشتی جوان بەهۆی ئەوەوە دەگاتە پلەو پایەی ئینسانی رۆژوگرو نوێژکەری بەردەوام .

# ئەو شتانەی لەئاکار و رەوشتی سەلەفی سالّح ، ئەهلی سووننە جەماعەن

● لەزانست و کاردا زۆر پاك و دڵسۆزن، لەوە دەترسن کە توشی ڕیاو ڕوپامایی بن. دلسۆز بوون لەگەل ئاین بۆ خوای تاك و تـەنیا لەسـەر ئـەم کـارە گرنگانـە بـەرپا دەبێت :

- دەبێ کارەکە تەنها بۆ خوای گەورە بیچت .
- دەبێ کارەکە بەپێ ی شەرعی خوای گەورە بێت .

وەك خوای گەورە فرمانی بە دلسۆزی کردووە لە کردارو گوفتار دا ، هۆشداریداوە لە شیرك و روپامایی ، وەك خوای گەورە دەفەموێ :

إِلاَّ الَّذِينَ تَابُواْ وَأَصْلَحُواْ وَاعْتَصَمُواْ بِاللّهِ وَأَخْلَصُواْ دِينَهُمْ لِلّهِ فَأُوْلَـئِكَ مَعَ الْمُؤْمِنِينَ وَسَوْفَ يُؤْتِ اللّهُ الْمُؤْمِنِينَ أَجْرًا عَظِيمًا {النساء/١٤٦}

واتە : تەنها ئەو کەسانە نەبێ کە تەوبەیانکردووە و ، چاك بوونە ، وەدەستیان بە پەت و بەرنامەی خوای گەورە وە گرتووە و ، بە دلسۆزی و نیاز پاکی کارو دروشمەکانی ئاینی خۆیان ئەنجام دەدەن ، ئەوانە لەگەل ئیمانداارنن ، لەمەو دوا لە رۆژی بەرێ خوای گەورە و کار بەجێ خێرو پاداشتێکی زۆرو زەوەندی ئیمانداران دەداتەوە

وەك خوای گەورە دەفەموێ :

وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاء وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ وَذَلِكَ دِينُ الْقَيِّمَةِ {البينة/٥}.

واتە : بەندەکانی خوای گەورە فرمانیان تەنها بەوە پێکراوە کە بە لسۆزی و نیازپاکی خوای گەورە بپەرستن ، ئەو خوایەی کە خاوەنی ئاینێکی پاكو پەرۆزو بێ نەنگەیەوە

فرمانیان پێکراوە کە بە لسۆزی و نیازپاکی نوێژ بۆ خوای گەورە بکەنو زەکات لە سەروەتو سامانیان بدەن ، چونکە ئەم ئایینە ئاینێکی رێكو پێكو بە پێزو بە هێزە

- خۆیان بە سەبرو خۆڕاگری جوان رادەزێننەوە لە پێناو خوای گەورەدا لەسەر ئەو نازو نیعمەتانەی کە خوای گەورە بەئاشکراو بە نهێنی بەسەری دا رشتوون ، وە سەبر لە سەر بەلا و موسیبەتەکان دەگرن کە لە ژیاندا توشیان دەبێت ، دەزانن کە سەبرو خۆراگری لە سیفەتی پێغەمبەرانە سەلات و سەلامی خوای گەورە یان لەسەر بیێت بۆ یە وەك خوای گەورە دەفەموێ :

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اصْبِرواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَاتَّقُواْ اللّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ {آل عمران/٢٠٠}

واتە : ئەی ئەو کەسانی کە ئیمانتان بە خوای گەورە ومیهرەبان هێناوە خۆڕاگرو خۆگرو ئارامگر بن ، خۆڕاگری و ئارامگری بەسەر خۆتاندا بێنن ، لەسەنگەری بەرگریکردن لە پێناو خوای گەورەدا بەردەوامو خۆڕاگربن ، لە خوای گەورە بترسن ، بەلکو سەربەرزو سەرکەوتووی دونیاو دوا رۆژ بن

وەك خوای گەورە دەفەموێ :

فَاصْبِرْ كَمَا صبر أُوْلُوا الْعَزْمِ مِنَ الرُّسُلِ وَلَا تَسْتَعْجِل لَّهُمْ {الأحقاف/٣٥}

واتە : ئەی پێغەمبەر (ﷺ) خۆڕاگر بە وەکو ئەو پێغەمبەرانەی کەخاوەن ورە بوون ، سەبرو ئارام یان گرت لە سەر کێشە و گیرو گرفتەکانی ژیانیان ، پەلەیان لێ مەکە

وەك خوای گەورە دەفەموێ :

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اسْتَعِينُواْ بِالصَّبْرِ وَالصَّلاَةِ إِنَّ اللّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ {البقرة/١٥٣}

واتە : ئەی ئەو کەسانی کە ئیمانتان بە خوای گەورە ومیهرەبان هێناوە ، بە هۆی سەبرو خۆراگری و نوێژکرنەوە ، خۆتان ڕابگرن و داوای کۆمەکی و هاوکاری لە خوای گەورە و میهرەبان بکەن ، بێگومان خوای گەورە ومیهرەبان لە گەڵ خۆراگراں دایە

- قەدەغە کراوەکانی خوای گەورە بەگەورە دەزانن ، ئەگـەر ئـەتکی قەدەغـەکراوەکانی خوا بکرێ لەسەری بەجواب و بوێرن ، زۆر لەشتە پـیرۆزو ڕێـز لێگیراوەکـانی موسـڵمانان بەپایەدار دەزانن ، وەزۆر خێرو چاکەیان پێ خۆشە

ومن يُعَظِّمْ شَعَائِرَ اللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى الْقُلُوبِ {الحج/٣٢}

واتە هەرکەسێك هێماو دروشم و خواپەرستیەکانی خوای گەورە بە گەورە و بە بەرز ڕابگرێ ، لە لە خوا ترسان و لە چاکەی خۆیەتی

وەپێغەمبەری خوای گەورە ش (ﷺ) دەفەموێ :

لايؤمن أحدكم حتى أكون أحب اليه من ولده ، و والده ، والناس أجمعين البخاري

واتە : هەریەکێك لە ئێوە ئیمان و بیروباوەری تەواو نابێ تا منی لە خۆ و لە رۆلەکەی و لە دایك و باوك و لە هەموو خەلکی بە تێکرا خۆشتر نەوێت

- هەمیشە هەوڵ دەدەن واز لـە دوو ڕوویـی بێـنن بـە دزی وبەئاشـکرا(١) ، هەمیشـە کاروکردوەکانی دوارۆژ وەپێش کاروکردەوەکانی دونیا دەخەن

• دڵ و دەروونیــان نەرمــە (٢) ، زۆر دەگــرییێن لەســەر ئــەو کەمتەرخەمییانــەی کــە لەهەقی خوای گەورەیاندا کراوە ، یازێدەڕۆییان لە شتێکدا کردوە تا خوای گــەورە لیێ یــان خۆش بێت ، زۆر گرینگی و بایەخ بە بیرکردنەوە لەمردن و بــە گریــان دەدەن ، کاتــێ کــە مردوێــك دەبیــنن ، زۆر بــیر لــەداو رۆژ و ناخۆشــیەکانی ئاویلکــەو ســەرە مــەرگ و گۆڕدەکەنەوە ، تا دڵیان دەهەژێ و رادەچڵەکێ

• زۆر خۆیان لەبەرانبەر خــوای گــەورە بەکــەم دەزانــن ، ئــی وایــان هەیــە کــە زۆر بــەرز دەبێتەوە بۆ لای خوای گەورە بەهۆی ئەوەوە

• بەشــەووبە رۆژ زۆر داوای لێخۆشــبوون لــەخوای گــەورە دەکــەن و پەشــیمان دەبنــەوە لەکردارەوگوفتارە بەدەکانیان ، لە گوناهەکانیان دڵنیانین ئاخۆ خوای گەورە لێیــان خــۆش دەبێ یان نا، لەبەر مل کەچیان و لەترسی خــوا داوای لێبــوردن لــەخوای گــەورە دەکــەن لەسەر ئەو کەم و کوڕیانــەی کــە هەیانــە ، ئەگــەر کــاری چــاکیش بکــەن هــەرگیز بــاس‌و ســەنای خۆیــان ناکــەن، ئەگــەر سەناشــیان بکــرێ ، خۆیــان دەبێــزنن و ســەرکۆنەی دڵ و دەروونی خۆیان دەکەن ، وادەزانن کەم و کــوڕی و درێغــی یــان هەیــە لــە تاعەتکردنــدا ، بۆئەوەی تووشی ڕیاوهەڵە و تاوان نەبن

• زۆر وردەکاری لەخواپەرستی و لەتەقوادا دەکەن ، کەسیان بانگەشەی ئــەوە ناکــا کــە ئەو لە خەلکی ترلە خوا ترس ترە ، زۆر لەخوای گەورە دەترسن و دڵیان دەلەرزێ

• گرنگی بە دروستکردنی کۆشك و بینا و ساختومانی جوان و بەرزو ڕازاوە نادەن ، بــە پیێ ی پێویست نەبێت ، زێدە ۆیی ناکەن لە خەرجکردن و جوانکاری دا

وەپێغەمبەری خوای گەورە ش (ﷺ) دەفەموێ :

واللە ! ما الدنیا في الاخرة الا مثل مایجعل أحدکم اصبعه هذه في الیم ، فلینظر بم ترجع.
مسلم

واتە    سوێند بەخوای گەورە و میهرەبان ژیانی دونیا لە چاو دوارۆژ تەنها وەکو ئەم ئەنگوستەیە کە بیخەیتە نێو دەریایەك ، تەماشای بکە چەند ئاوی پێوە دەنوسێت ، ژیانی دونیاش هەر ئەوەندە کەم و بێ نرخە

- زۆر لەخوا دەترسن مەبادە سەرەنجام و دوا رۆژی ژیانیان خراپ بێ ، لە زیکر و یـادی خوای گەورە بێ ئاگا نابن ، دونیـا لای ئـەوان زۆر سـوك وسـادەیەو زۆر بەتوونـدی رەتـی دەکەنەوە ، زۆر گرنگی بە دروستکردنو سازکردنی مالو خانوو نادەن، مەگەر بـە پـێ ی پێویستی ژیان نەبێ ، گرنگی بە نەخشو نیگارو خۆڕازاندنەوە نادەن لەبەر دوارۆژیان
- بـەو هەڵـە و تانــە و تەشــەرانە ڕازی نــین کەلــەئاین و لەخــەڵکی دینــداروئایین پەروەروموسلمان دەدرێ ، ڕەددیان دەدەنەوە ، پـەلپ و پـۆزش بـۆ ئـەو کەسـە دێننـە وە کەپێویست دەکا و فـەرموودەی لـەبارەی هـاتوە (٢) ، هەمیشـە لای یـەکتری دەگـرنو، عەیبو عاری برایانی موسلمان دادەپۆشن ، بەتوندی سـەرکۆنەوگفتوگۆی لەگـەل دەکـەن لەوکاتەی کـە تەزکیـەی خۆیـان دەکـەن ، حەزناکـەن عـەیبو عاروشـەرمگەی براکانیـان دەرکەوێ ، لەجیاتی ئەوەی بە عەیبو عاری خەلکی یەوە خەریك بن ، بە عەیبو عاری خۆیانەوە خەریك دەبن ،(١) ،هەول دەدەن عـەیبو عـاری جگـە لـە خۆشـیان داپۆشـن ، رازونیازونهێنییـەکانیان دەپـارێزن ، وازلـە نـەیاریتی و ململانێـی خـەلکی دێـنن لەسـەر بابەتێك ، بەلکولەگەل یاندا گوزەرو هەل دەکەن ، لەسەر ناهەق لەگەل هیچ کەسێکدا بـە خراپەو ناشەرعی روبەرونابنەوەو دوژمنایەتیان ناکەن

لە کۆڕوکۆبونەوەکانی خۆیاندا دەروی باسکردنی پاشەملە (غەیبەت) دادەخەنو زمانی خۆیان لە وە دەپارێزن، تا کۆڕوکۆبوونەوەکانیان نەبێتە کۆڕی گوناهو تاوان کردن وەك خوای گەورە دەفەموێ :

وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ وَاتَّقُوا اللَّـهَ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ {الحجرات/١٢}

واتە : ئەی ئیماندارینە هەندێکتان لە پاشـەملە بـە خراپـی باسـی هەنـدێکتان مەکـەن ، ئایە کەس لە ئێوە پێی خۆشەکە بە مردوویی گۆشتی براکەی خـۆی بخـوات ، بێگومـان هەر یەکە لە ئێوە ئەوەی پێ نا خۆشە ، بەلکو رقی لێ دەبێـتەوە ، دەکەواتـە لـە خـوای گەورە بترسن ، لە پاشە ملە هەرگیز بە خراپە باسی یەکتری مەکەن ، ئەگـەر واشـتانکرد خوای گەورە زۆر لێخۆشبەرو بەبەزەییە

- زۆر بەشەرم و ئەدەب و گران و سەنگین وسۆز و سەکینەن، کەم پێ دەکەنن، کەم قسە دەکەن و دەڵێن، زۆر بێ دەنگ و هێدك و لەسەر خۆن، کاتێ قسە دەکەن بە هێواشـی و لێزانی و بە ئەسپایی یەوە دەدوێن ، تا بەرانبەرەکەیان باش تێ بگا و هەرس بکـا، دڵیان بە شتی دونیا ئاسودە و خۆش نی یە، ئـەوەش لەبـەر ژیـری و زۆر زانـی تیـان، چونکە دەزانن ئەم ژیانە کۆتایی دێ و دەڕوا، دوا ڕۆژ گرنگ و چارەنووسی مرۆڤە

وەپێغەمبەری خوای گەورە ش (ﷺ) دەفەموێ :

من كان يؤمن بالله واليوم الاخر فليقل خيرا ، أو ليصمت

واتە : هەرکەسێك بڕوای تەواوی بە خوای گەورە و بە ڕۆژی دوای هەیە با چاکە بلێ دەنا با بێدەنگ بێ

وە فەرموویەتی من صمت نجا صحيح سنن ابي داوود / للالباني

واتە : ئەوەی بێدەنگ بوو رزگاری بوو

- زۆر بەزەیی و لێبوردنن بەرانبەر بەو کەسانەی کە ئازاریان دەدەن ، یا مال و دارایـی یان لێ دەسەنن و تا نەوتەشەریان لی دەدەن، یا شتێکی تری وا یان لەگەڵدا دەکەن .

وەك خوای گەورە ش (ﷺ) دەفەموێ :

وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ {آل عمران/١٣٤}

واتە ئەوانەی لە کاتی توڕە بووندا ڕق و کینەی خۆیان دە خۆنەوەو، بەسەر نەفس و هەواو شەیتانی نەگریسی خۆیاندا زال دەبن ، ئینسانی ئیماندارو چاك و لە خوا ترسن ، خوای گەوە چاکەکارانی خۆش دەوێت واتە خوای گەورە و میهرەبان ئینسانی چاکەکارو باشی خۆش دەوێت

- بێ ئاگا و غافلگیر نین لە دوژمنایەتی کردنـی شـەیتانی بـەدو نـەگریس، بـەلکو هـەردەم هەول دەدەن بۆ دۆزینەوەو زانینی فروفێلّ و جێ و ڕێ و تەلە و داوکەکان ( مکائد ومصـائد) ی شەیتانی گلاو و نەگریس، وە هیچ دەست نوێژ و تارەت و خوت خوتـە (وسوسـە ) یـەکی خراپ یش یان نی یە لە نوێژ و دەست نوێـژ و تـارەت و لـە هـیچ جۆرە عیبـادەتێکی تـردا، چونکە هەموو ئەوانە لە شەیتانەوەن . ( بۆ ئەوەی کار لە بابا بکـەن و کـۆنترۆل بکەنـە سـەر سایکۆلۆژیەتی ئەو خوا پەرستە و لە ڕێ ی ڕاست لا ڕێ ی بکەن) وەرگێڕ.

• بەشە و و بە ڕۆژ، بە نهێنی و بە ئاشکرا، بە پێ ی توانا و پێویست زۆر خێـرو چـاکە دەکەن، زۆر لە کاروبار و ڕەوشتی هاوەلە بەڕێزەکان دەپرسن بۆ ئەوەی لە بارەی خـواردن و خـەوتن و جـل و بـەرگ و مـال ومنـالو حـەلال و حـەرام و ئـەو شـتانەی کـە هەیانـە پەیڕەویان لێ بکەن

زۆر بەخشەر و دەست ڕۆ و سـەخین و مـالّی خۆیـان بـە هـەژارو نـەداران دەبەخشـن، ڕقیان لە ڕەزیلی و ڕژدی یە، بۆ دەرچوون و مانەوە و گەشت کردن هاوەلایـەتی براکانیـان دەکەن ، بۆ سەرخستنی ئایینەکەیان پالدەدەنە لای یەکترو لای یەکتری دەگرن ، ئەوەیان لا مەبەستێکی گەورەیە ، زۆر هەولّی بـەدیهێنانی برایـەتی و تـەبایی لـەنێوان یـەکتریو برایانیان دەدەن ، هەولّی پەیـداکردنی خۆشەویسـتیان لـەنێوان دەدەن ، لـەوەدا برایانیـان وەپێش خۆیان دەخەن

ڕێز لەمیوان دەنێن ، بۆ خۆیان خزمەتی دەکەن ئەگەر عوزرێکی شەرعی یـان نـەبێ ، هێشتا وا نازانن کەئەوخوارنەی دەر خۆردیان داوە ئەو خزمەتەی کـە کردوویانـە بەسـە و شایەنی میوانە ، ماتو لەلای ئەوانە ، ئاوا بیر دەکەنەوە و گومانی چاکی پێ دەبەن ، بە پیل داوەتی برایەکانیانەوە دەچـەن ، ئەگـەر خواردنەکـەیان ناشیاو (حـەرام) نـەبێ ، یـا ئەگەر ئەو داوەتەیان تایبەت کردبێ تەنها بەدەولّەمەندەکان (جگـە لەهـەژاران) یـا ئەگـەر لەجێی داوەتەکە گوناە و ناشەرعی یەك هەبێ

جوان ڕەفتارن لەگەلّ گچکە چونکە چاکەی لەسەر گەورە هەیە ، خۆش رەفتارن لەگەلّ پیاوی دور چونکە چاکەی لەسەر پیاوی نزیـك هەیـە ، وە رەفتـاری جـوان لەگـەلّ پیـاوی نەزانن دەکەن چونکە چاکەی لەسەر زانا هەیە

* چاکسازی نێوان خۆیان دەکەن ٢، چونکە باشترین دەرگای خێر و ترۆپکـی چـاکەیە و، بەچاککردنی نێوانەکان نەخشە و پلانەکانی شـەیتانی نـەگریس وگلاو هەڵدەوەشـێننەوە ، کەمەبەستی پێ بەرپاکردنی ئاژاوەو ڕقە بەرایەتی یە لـە نێـوان خەڵکانـداو ، مـەبەستی پێ تێکدانی نێوان موسڵمانانە

* نــەهی و نــەفرەت لــەئێرەیی (حســد) بــردن بەیــەکتری دەکــەن ، چــونکە ئێرەیــی رقەبەرایەتی و دوژمنایەتی لەنێوان مسوڵمانان بەرپادەکا و جێی دێڵێ ، وەئیمانیان پـێ کـز و لاواز دەکـا و، دونیانیــان لەبــەردەم خۆشەویســت دەکــا بــەبێ ئــەوەی کــە هــیچ مەبەستێکی شەرعی تێدا بێت

* فەرمان بەوە دەکەن کە (مرۆڤ ) لەگەڵ دایك و باوکی دا چاك بێ و ، رێزیـان بگـرن و چاکەیان لەگەڵدا بکەن ، رەزامەندیان بەدەست بێنن ، لەگەڵیاندا بەخشـەر بـن ، ئـێش و ئازاریان نەدەن

وەك خوای گەورە (ﷻ) دەفەموێ :

وَقَضَى رَبُّك أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ وبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَك الْكِبَر أَحَدُهُمَا أَوْ كلاَهُمَا فَلاَ تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلاَ تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلاً كَرِيمًا {الإسراء/٢٣}

واتــە : ئـەی پێغەمبــەری خــوای گــەورە (ﷺ) ( ئـەی بەنـدەی ئیمانـدار ) ئاگـادار بــە ، پەروەردگارەکەت بڕیاری داوە کە جگـە لـە خـوای گـەورە کەسـی تـرو هـیچ شـتێکی تـر نەپەرستی و بەندایەتی بۆ نەکەیت ، وە بڕیاری داوە و فرمانی کردووە کە لەگەل دایـك و باوکتدا چاك بیت ، جا کاتێ کەیـەکێك لـەم دووانـە ، لـە دایـك و باوکـت یاهـەردوکیان دەگەنە تەمـەن و هەرەتی پیری و پەککەوتەیی ، سوکترین قسـەیان پـێ مـەلێ و هـەرگیز

دلیان مەڕەنجێنە ، نیگەران و هەراسانیان مەکە ، رەتیان مەکەوە ، بەلکو قسـەی بـەرێو جێیان لەگەلدا بکە

وەك خوای گەورە (ﷻ) دەفەموێ :

ووصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْنًا عَلَى وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ {لقمان/١٤}

واتە : ئامۆژگاری ئینسان مان کردووە کە لەگەل دایـك و باوکیـدا بـاش و بـەرێز بێـت ، بەتایبەت لەگەل ئەوە دایکەی کە سك لە دوای سك ، بـە ئـێش و ئـازارو بێتاقەتیـە کـی زۆرەوە بۆ ماوەی نۆ مانگ لە نێو زگی دا هەلیگرتووی ، وەتـا دوو سـالیش لـە مـەمك جیا دەبێتەوە شیری مەمکی لاشەی خۆی پێدەدات ، ئەمانە هەمووی بۆ دایکەکە ئـێش و ئازارو بارو بێتاقەتین ، لەبەر ئەوە فرمانمان پێکردووە کە سوپاسگوزاری دایك و باوکت و ئێمەی خوای کردگاریش بکەیت ، چونکە ئایندە و گەڕانەوەو سەرەنجامت بـۆ لای منـە و ، لەرۆژی دواییدا من لێتان دەپرسمەوە

فـەرمان بـەوە دەکـەن کـەپیاو لەگـەلّ دەرو دراوسـێ ی خۆیـدا چـاك بـێ ، وە لەگـەلّ بەنــدەکانی دا نــەرمو نیــانو بــەبزە بــێ ، وەپەیوەنــدی ســۆز وخــوێش وهاموشــۆ ( صلة الرحم) جیّ بـەجیّ بکـا ، وەسـەلام لەخـەلّکان بکـا ، وەرحـم بەهـەژار و نـەدارو هەتیوو رێبواران بکا

نەهی لەخۆ هەلکێشان و شانازی بەخۆ وەکردن وتەکەببورو لوتبەرزی و بەخۆ سەرسام بوونو یاخی بوون دەکەن ، وەنەهی لەخۆهەلکێشان بەسـەر دروسـتکراوەکانی تـر دەکـەن بەناهەق ، وەفەرمان دەکەن بە بەکارهێنانی چاکە و دادگەری لە هەموو شتێکدا.

* گالتەو سوکایەتی بە هیچ شتێك ناکەن، لەوشتە چاکانەی کـە شـەرعی خـوای گـەورە برەوی پێ داون و ڕەوای کردوون بۆئەوەی کە ئێمە ئەنجامیان بدەین

وەپێغەمبەری خوای گەورە ش (ﷺ) دەفەموێ :

لاتحقرن من المعروف شيئا ، ولو أن تلقى أخاك بوجه طلق . مسلم

واتە : لە خێرو چاکە کردندا گالتە بە هیچ شتێکی کەم مەکە ، ئەگەر بە زەردەخەنەو روویەکی گەشیشەوە بێ کە بە برایەکەت دەگەیت هەر کەم نیەوە زۆرە

* نەهی لە گومان بردنی بەدو لە سیخوری لەسـەر یـەکترکردن دەکـەن ٣ ، نـەهی لـەوە دەکەن کە ئینسان نەنگەو شەرمگاو عـەوراتی بـرا موسـلمانەکانی خـۆی دەربخـات ، یـا تانەو تەشـەری لـێ بـدات چـونکە هـەر یـەکێك لەوانـە پەیوەنـدی کۆمەڵایـەتی نێـوان مرۆڤەکان تێك دەدا و ، ڕیزەکانی نێوان برایان پارچە پارچـە دەکـاو، تـۆوی خراپاکـاریو دوبەرەکی دەڕوێنێ و بلاو دەکاتەوە، وە لە نێوخۆدا ڕقیان لەیـەکتری نابێتـەوە ، چـونکە ئەوان یاساو فیقهی ڕق لێ بونەوەو تێك دان وخراپەکاری باش دەزانن

* لە خۆیـان و لـە خـەلك تـوڕەو زوێـر نـابن ، چـونکە لـە خراپـە و مەترسـی توڕەبـوون تێدەگەن

وەك خوای گەورە دەفەموێ :

وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ {آل عمران/١٣٤}

واتە ئەوانەی لە کاتی توڕە بووندا ڕق و کینەی خۆیان دە خۆنەوەو، بەسەر نەفس و هەواو شەیتانی نەگریسی خۆیاندا زال دەبن ، ئینسانی ئیماندارو چاك و لە خوا ترسن ، خوای گەوە چاکەکارانی خۆش دەوێت

واتە خوای گەورە و میهرەبان ئینسانی چاکەکارو باشی خۆش دەوێت

# دوا وتە میسکە

**ئەوە :** بیرو باوەڕە ی وەچەو ڕەوە ی یەکەمە لەو ئۆممەتـە ، کـە بیروبـاوەڕێکی سـاغ و ساف و پاك و بێگەردە ، ڕێبازێکی راست و ڕەوان و دروستە لەسەر بەرنامە و پـەیڕەوی کتاب و سوننە و فەرموودەی پێشینە و پێشەوا چاکەکانی ئەو ئۆممەتەیە ، ئـەو ڕێبازەیـە کە دڵی پیاوە سەرەتایەکانی ئەو ئۆممەتەی زیندووکردوە

**ئەوبیروباوەرە :** بیروباوەری ( پێشینە چاکەکان و کۆمەڵی سەرفراز و سوننە و جەماعە) یەو، بیروباوەری هەر چوار پێشەوا خاوەن مەزەبە شوێن کەوتوەکانە ، بیروباوەری تێکرای جمهور ی فەرمودەناس و شەرعزانەکانە، بیروباوەڕی هەموو ئەو زانـاو موسـلمانانەیە کـە تا ئەم ئەمڕۆمان و تا رۆژی دوایی لەسەر ئەو رەوت و ڕێبازە دەڕۆن و کاری پێ دەکەن و لێ ی لانادەن ، چونکە تا رۆژی دوایی ئەو ڕێبازە هەر دەمێنێ

بۆیە : ئێمە لەسەرمانە کە خو بەو بیروباوەڕە بگرین و پێی یەوە پابەند بین وهەرگیز لێـی لانەدەین ، بەهۆی ئەوەوە بگەڕێینەوە سەر ئەو سەرچاوە ساف و بێگەردەی کـە چـاکترین پیاو چاکی سەلەف و ئەو ئۆممەتەی لێ هەڵقوڵاون

وە دەبێ ئێمە لەوە دا بێدەنگ بین کـە ئـەوان لەسـەری بێـدەنگ بوونـە، وە بـەو شـێوەیە خواپەرسـتی بکـەین کـە ئـەوان ئـەنجامیان داوە ، دەبـێ هەمیشـە بـە کتـاب و سـوننە پەیوەسـت بـین ، وە پەیوەسـت بـین بـە کـۆڕای پێشـینەی ئـەو ئۆممەتـە و پێشـەواکانی،

پەیوەست بین بەو پێوانە راست و دروستەی کە لە کاروبارە تازە ونوێیەکاندا دێنە پێشێ و دەبێ لە ژێر تیشکی چەمك و تێگەیشتنی ئەوانە کار بکەین

ئەمیری ئیمانداران (عومەری کوڕی خەتتاب) ( رەزاورەحمەتی خوای لێ بێ) دەربارەی ئەوە دەفەرموێ :

(بەراستی زانیم کەی خەڵکی چاك یا خراپ دەبن، ئەگەر فیقە لەلای گچکەکان بوو، بەڵام گەورەکان لێیان یاخی بوون و لە بەر لوتبەرزی کاریان پێ نەکرد، ئەوکاتە خەڵك خراپ دەبێ ، وە ئەگەر فیقە لەلای گەورەکان بوو، بەڵام گچکەکان بە دوایان کەوتن و پەیڕەویان لێ کردن ، خەڵك باش دەبێ )

ئیمامی عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئەمیری ئیمانداران رەزای خوای گەورە ی لی بێ دەفەرموێ :

(بڕوانن ئاخۆ ئەو زانستە لە کێ وەردەگرن ، چونکە ئەو زانستە ئایینە) واتە : ئایا ئەو زانستە لە پیاوی چاك یا خراپ وەردەگرن ، چونکە وەرگرتنی زانستە شەرعیەکان وەرگرتنی دیینە ، بۆیە دەبێ بزانن کە دین لە کێ وەردەگرن ، بەغەیری سەرچاوەی راستەقینەی خۆی دووچاری هەڵەو لاڕێ و لادانتان دەکات وەرگێر

هاوەڵی شکۆدار عەبدوڵای کوڕی مەسعود دەفەرموێ :

( هێشتا ئەو خەڵکە خێری پێوە ماوە ئەگەر زانست و زانیاری لە خۆتر گەورەکانیان وەربگرن ، بەڵام لە خۆ گچکەتر یا لەهی خۆ خراپتریان وەرگرت ، دەفەوتێن

**ئەی برای موسڵمان بزانە:**

خوای گەورە بە تەنیا ئێمەی بۆ هەق ڕاستەڕێ کـردوە، هـەر کەسـێ داوای ڕێنمـایی لـە غەیری خوای گەورە (کتاب و سوننە) و تێگەیشتنی سەلەفی سـالح بکـا، یـا شـتێکی تـر بێنێ دوای ئەوەی کە خوای گەورە یاسـای دانـاوە، ئـەو کەسـە لـە گومڕاییـەکی تـەواو ئاشکرا دایە، دوورە لە ڕێی ڕاست و بەدوای غەیری ڕێی ئیمانداران کەوتووە.

ئێمە دڵنیاین کە دەمرین بەر لەوەی کە یاساکانی گەردوون کۆتاییان پێ بێ، ئەی بۆچـی بیدعە لە ئاین زیاد بکەین؟

ئیمامی مالك ڕەزاو ڕەحمەتی خوای گەورەی لێ بێ زۆر جار ئەو سرودەی دەگوت

وخير أمور الدين ماكان سنة　　　　وشر الأمور المحدثات البدائع

واتە: باشترین کاروباری ئاین ئەو شتانەن کە سوننەتن و لەسەر ڕێبازی پێغەمبـەرن (ﷺ) ، خراپترین کاروباریش ئەوشتانەن کە لە بارەی دیندا داهاتوون و زیاد کراون

باشترین بەندە و خواپەرست (بـەپێی کـۆڕا و یەکـدەنگی موسـڵمانان پێغەمبـەری خوایـە (ﷺ)، بۆیـە هـەر عیبادەتێـك لەگـەڵ عیبـادەتی ئـەودا پێچـەوانە بـێ ، بیدعەیـە و خاوەنەکەی لە خوا نزیك ناکاتەوە و هیچی بۆ زیـاد ناکـا لەلایـەن خـوای گـەورە، بـەڵکو تەنها دووری دەخاتەوە وەك خوای زانا دەفەرموێ :

ومنْ أَحْسنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ للهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ واتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْـرَاهِيم حَنِيفًـا وَاتَّخَـذَ اللّـهُ إِبْرَاهِيم خَلِيلاً {النساء/١٢٥}

**واتە:** ئاین و بیروبڕوای کێ لە هی ئەو کەسە باشتر و پەسند ترە کە بە تەواوی ڕووی خۆی بە دەست خوای گەورەوە داوە و پیاوێکی چاك و پاکە، پەیڕەویش لە ئایینی پاکی حەزرەتی ئیبراهیم دەکا ، سەلامی خوای گەورەی لەسەر بێت

گومانی تێدا نیە کە تاکە ڕێگەی یەکبوونی موسڵمانان تەنها یەکبوونی بیروباوەڕە، ئەو بیروباوەڕە بێگەردەی کە جیلی یەکەمی ئەو ئۆممەتە هەڵیان گرتوە و کاریان پێ کردووە بە پاکی و بەدادگەری

# پوختەی قسان

ئەوەیە کەئێمە هەرگیز چاك نـین و سـەرناکەوین لـە کـارو بـارو بانگەوازەکەمانـدا ، ئەگـەر شـتی گـرنگتر پـێش شـتی گـرنگ دەسـت پـێ نەکـەین ، بۆیـە دەبـێ ئێمـە بانگەوازەکەمان لەبیروباوەڕی پاك و بێ گەردی یەکتاپەرستی ( توحید ) ەوە دەسـت پـێ بکەین ، دواتر هەموو کارەکانی وەك ( سیاسەت ، ئەحکام ، ئاکار ، ئاداب ، رەوشت ، مامەڵە هەموو) شتەکانی ترمان لەسەر ئەوەوە بینا بکەین

وە بۆ هەموو ئەو کاروبارانەمان دەبێ شتەکانمان لە دیاری کتاب و سوننە و تێگەیشـتنی ئەو ئۆممەتە دەرچـن و سەرچـاوەی بگـرن ، ئـەوەش بریتییـە لـە رێگـا راسـتەکەی خـوای گەوردوە ، ئەو بەرنامە راست و بەپێزەی کە خوای گەورە فرمانی پێ کردوین کە لەسەری بژین و بمرین ، وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلاَ تَتَّبِعُواْ السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِ ذَلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ {الأنعام/١٥٣}

واتە : ئا ئەوە رێگا راستەکەی منە، دە بەدوای بکەونو لێـی لا مـەدەن ، بـە دوای ئـەو رێچکە و رێبازانە مەکەون کە بەهۆیانەوە پارچە پارچە دەبن و لەو رێگا راستەی خـوای گەورە لادەدەن ، ئائەوە ئەوەیەکە خوای گەورە وەسـیەتو ئامۆژگـاری پێکـردون، بـەلکو لە خوای گەورە بترسنو کار بە فرمانی خوای گەورە بکەن

بیروباوەڕی سەلەفی ساڵح تاکە ڕێگا و ڕێبازە کە کاروباری ڕەوشتی ئەو ئۆممەتی پێ چاك و لەبار دەبێت

بۆیە : داواکارین لە خوای گەورە هەروەك شارەزای بەرنامەی سـەلەفی سـاڵحی کـردین ، بمان گێڕی لەوان ، لەگەڵ ئـەوان لـە ژێـر بەیـداخ و سـەرداریێتی گـەورەی دروسـتکراوەکان موحەمەدی پێغەمبەرمان (ﷺ) کۆمـان بکاتـەوە لـە ڕۆژی دوایـی داو ، دڵ و دەروونمـان لەسەر ڕێی ڕاست لانەدا دوای ئەوەی کە بەرەحمی خۆی هیدایـەتی داویـن ، وە بمانکاتـە یەکێك لەو بەندە خواناس و یەکتا پەرستە چاکانە کە لەسەر ڕێبازی ئەوانن و تەنها کار بەو ڕێبازە پـیرۆزو پێـزە دەکـەن ، وەخـواش لەسـەر ئـەوە و لەسـەر هـەموو شـتێکی تـر تواناداره ، گـوێگر و هۆشـیارو هەسـتیارە ، وەهـەر بـۆ خـۆی وەڵامـدەرەوەی داواکـان و گیراکەری ڕازو نیاز و نزاکانە

# چەند دانراوێك لەبارەی بیروباوەڕی سەلەفی سالّح
# ( ئەهلی سوننە و جەماعە )

تاك تاکە لە زانا پایەدارەکانی ئـەهلی سـوننە و جەماعـە دانـراوی زۆریـان لـەبارەی بیروباوەڕی پێشینە چاکەکان رێك خستونە و، گرنگیان بە یاساو رێساکردنی بنچـینەکانی ئەو بیروباوەڕە داوە و، بەکتاب و سوننە بەلگەیان لەسـەر هێناوەتـەوە ، وەکـار دانـەوەی خەلّکی بیدعەکاریان کردوەو نهێنی و نەنگەکانیان دەرخستون ، وە بەزانسـت و زانیـاری راسـتەقینە بـەرگری نـەفامێتی و بەسـوننە بـەرگری بیدعــەیان کـردوە ، وەخــەلّکی بیدعـەکاریان لـە چـەکەکانی خۆیـان دامـالّیون ، وە هەمیشـە هـەقیان سەرخسـتەوە و ئاشکرایان کردوە ، وە شتی پڕوپوچیان پوکاندۆتەوە ، وەهەموو ئەو شتانشەیان تەنها بـۆ سەرخستن و پاراستنی ئایین کردوە

وە پێویستە کەمن لێرەدا تەنها باسی هەندێ لەودانراو و سەرچـاوانە بکـەم کـە بـۆ ئامادەکردنی ئەو کورتە پەرتووکەیـە کردوومنـە سەرچـاوی خـۆم و کـەلّکی زۆرم لێ یـان وەرگرتوە ، تابرای مسولّمان لەسەر رۆشنایی و زانیاری بێ دەربارەی بیروبـاوەڕی پێشـینە چاکەکان و ، بزانێ کە ئەو بیروباوەڕە بیروباوەری پێشینە چاکەکانە وەبزانـێ کـە تـەنها ئـەوە بنچـینە بنـەمای بیروبـاوەڕی ئیسـلامی یـە ، ئـەو لادانوگۆڕانکاریانــەش کــە لەسەدەکانی دوایی بەسەری دادێ ، ئەوە شتێکی زیـادو زیـان بەخشـە کـە دێتـە ناوئـەو بیروباوەڕی کەسـەلەفی سـالّح و هاوەلّـە بـەرێزەکان و پێغەمبـەری ئـەو ئایینـە گەورەیـە وەریان گرتووە

بیروباوەری سەلەفی سالح کۆمەلێکی زۆرو گەورە لە زانایانی ئەو ئۆممەتە بڕیاریـان لەسـەر داوەو پەسەندیان کردوە لەو دانراوانەیاندا ، بۆ وێنە کە هەندێ لەو دانراوانەش ئەمانـەی خوارەوەن :

**تێبینی :** ئەو دانراوانەش وەك خۆی تۆماریان دەکەین و ، وەریان ناگێرینـە سـەر زوبـانی کوردی تا خوێنەر باشتر بیاناسێت . وەرگێر.

سوپاسێکی بێ پایان بۆ پەروەردگاری بوونەوەرو جیهان

کەبەیارمەتی ئەو ئەم کتێبە تەواو بوو لە وەرگێران

**مافی لە چاپدانی پارێزراوە بۆ وەرگێڕ**

**شـوان رابـەر**

**کوردستان / هەولێر**

**سالی /٢٠٠١ وەرمگێڕاوە**

# سەرچاوەکانی ئەم پەرتووکە ئەمانەن

١- (كتاب السنة) للإمام أحمد بن حنبل رحمه الله ، ٢٤١هـ.

٢- (كتاب السنة)، ابو بكر احمد بن يزيد الخلال ، ٢١١ هـ.

٣- (كتاب السنة)، حافظ أبو بكر بن ابي عاصم ، ٢٨٧هـ.

٤- كتاب السنة، محمد بن نصر المروزي ، ٢٩٤هـ

٥- شرح السنة ، الإمام حسن بن على البربهاوي ، ٣٣٩ هـ.

٦- شرح السنة، الإمام حسن بن مسعود البغوي ، ٤٣٦ هـ.

٧- الشريعة، الإمام ابو بكر محمد بن الحسين الأجري ، ٣٦٠ هـ.

٨- كتاب اصل السنة وإعتقاد الدين، الإمام حاتم الرازي ، ٣١٨ هـ.

٩- صريح السنة، الإمام ابو جعفر محمد بن جرير الطبري، ٣١٠ هـ.

١٠- شرح مذاهب أهل السنة ومعرفة شرائع الدين والتمسك بالسـنن، ابـو حفـص عمـر بن احمد بن عثمان بن شاهين، ٢٧٩ هـ.

١١-أصول السنة، الإمام ابن ابي زمنين الأندلسي ، ٣٩٩ هـ.

١٢- أصول النزول- كتاب الصفات- كتاب الرؤيا، الإمام الحافظ على بـن عمـير الـدار قطني، ٣٨٥ هـ.

١٣- كتاب التوحيد وإثبات الصفات الرب عز وجل، الإمام ابو بكر محمد بن اسـحاق بـن خزيمة، ٣١١ هـ.

١٤- مقدمة إبن ابي زيد القيرواني، عبدالله بن أبي زيد القيرواني، ٣٨٦ هـ.

١٥- الإبانة عن شريعة الفرقة الناجية ومجانية الفرق المذمومة، الإمام ابو عبدالله بن بطة العكبري الحنبلي، ٣٨٧ هـ.

١٦- إعتقاد أئمة الحديث، الإمام الحافظ ابو بكر الإسماعيلي، ٣٧١ هـ.

١٧- الإبانة عن اصول الديانة، و رسالة إلى اهل الثغر، مقالات الإسلامين، جميعها للإمام ابي الحسن الأشعري، ٣٢٠ هـ.

١٨- عقيدة السلف اصحاب الحديث، الإمام ابو عثمان اسماعيل بن عبدالرحمن الصابوني، ٤٤٩ هـ.

١٩- المختار في اصول السنة، الإمام ابو على الحسن بن احمدابن البنا الحنبلي البغدادي، ٤٧١ هـ.

٢٠- شرح اصول إعقتاد اهل السنة والجماعة، الإمام ابو القاسم هبة الله بن الحسن بن منصور الطبري اللالكائي، ٤١٨ هـ

٢١- كتاب الأربعين في دلائل التوحيد، ابو اسماعيل الهروي، ٤٨١ هـ

٢٢- كتاب العظمة، ابو الشيخ الأصفهاني، ٣٦٩ هـ

٢٣- الإعتقاد والهداية، ابو بكر احمد بن الحسين البيهقي، ٤٥٨ هـ

٢٤- الحجة في بيان الحجة وشرح عقيدة أهل السنة، ابو القاسم اسماعيل بن محمد التميمي الأصفهاني، ٥٣٥ هـ

٢٥- العقيدة الطحاوية، الإمام احمد بن محمد بن سلامة أبو جعفر الطحاوي الأزدي الحنفي، ٣٢١ هـ

٢٦- لمعة الإعتقاد الهادي في سبيل الرشاد، الإمام موفق الدين ابو محمد عبدالله بن قدامة المقدسي ، ٦٣٠ هـ

٢٧- النصيحة في صفات الرب جل وعلا، الإمام ابو محمد عبـدالله بـن يوسـف الجـويني، ٤٣٨ هـ.

٢٨- كتاب التوحيد، الإمام محمد بن اسماعيل البخاري، ٢٥٦ هـ.

٢٩- كتاب التوحيد ومعرفة أسماء الله وصفاته، الإمام محمد بن اسحاق بـن منـدة، ٣٩٥ هـ.

٣٠- كتاب الإيمان ، الإمام ابو عبيد القاسم بن سلام، ٢٢٤ هـ.

٣١- كتاب الايمان ، الحافظ ابو محمد بن يحيى بن عمر العدني، ٢٤٣ هـ.

٣٢- كتاب الايمان، الحافظ أبو بكر بن محمد ابي شيبة، ٢٣٥ هـ.

٣٣- كتاب الإيمان، الحافظ محمد بن اسحاق بن منده، ٣٩٥ هـ.

٣٤- شعب الإيمان، الحفاظ ابو عبدالله الحليمي البخاري، ٤٠٣ هـ.

٣٥- مسائل الإيمان، القاضي ابو يعلي، ٤٥٨ هـ.

٣٧- الرد على الجهمية، الامام عثمان بن سعيد الدرامي، ٢٨٠ هـ.

٣٨- الرد على الجهمية والزنادقة، الإمام احمد بن حنبل، ٢٤١ هـ.

٣٩- الرد على من انكـر الحـرف والصـوت، الإمـام الحـافظ ابـو نصـر عبـدالله بـن سـعد السجزي، ٤٤٤ هـ.

٤٠- الإختلاف في اللفظ والرد على الجهمية والمشبهة، الإمام ابو محمد عبدالله بن مسلم بن قتيبة الدينوري، ٢٧٦ هـ.

٤١- خلق أفعال العباد والرد على الجهميـة واصـحاب التعطيـل، الإمـام البخـاري ٢٥٦ هـ.

٤٢- مسألة العلو والنزول في الحديث، الحفاظ ابو الفضل محمد بن ظاهر المقدسـي المعـروف بـ(ابن القيسراني)، ٥٠٧ هـ.

٤٣- العلو للعلي العظيم وإيضاح صحيح الإخبار من سقيمها، والأربعـين في صـافت رب العالمين، للإمام الذهبي، ٧٤٨ هـ.

٤٤- كتاب العرش وما روي فيه، الحافظ بن ابي شيبة المقدسي، ٢٩٧ هـ.

٤٥- إثبات صفة العلو، الإمام موفق الدين ابن قدامة المقدسي، ٦٢٠ هـ.

٤٦- أقاويل الثقات في تأويل الأسماء والصفات، الإمـام زيـن الـدين مرعـي بـن يوسف الكرمي المقدسي الحنبلي، ١٠٢٣ هـ.

٤٧- كتاب الأسماء والصفات.

(البعث والنشور و إثبات عذاب القبر، الإمام البيهقي، ٤٥٨ هـ.

٤٨- لوامع الأنوار البهية وسواطع الأسرار الأثرية.

(لوائع الأنوار السنية ولـواقح الأفكـار السـنية وشـرح قصـيدة ابـن ابـي داود الحائيـة، العلامة محمد السفاريني، ١١٨٨ هـ.

٤٩- وفارس التأليف في علم الإعتقاد-الذي لا يختلف فيه غثنان من أهل السنة-الشـيخ الاسلام ابن تيمية، ٧٢٧ هـ، فإنه رتب هذا العلم وقعد أصوله ومناهجه ومؤلفاتـه كـثيرة في هذا الباب منها: منهاج السنة النبوية.

درء تعارض العقل والنقل و بغية المرتاد في الرد على المتفلسـفة واهـل الإلحـاد و اقتضـاء السراط المستقيم لمخالفة اصحاب الجحيم والصارم المسلول على شاتم الرسول

كتاب الإيمان ورسالة الترمذية

قاعدة جلية في التوسل والوسيلة، الفرد على المنطقين، القعيدة الوسطية.

العقيدة الحموية، الرسالة التسعينية، شرح العقيدة الأصفهانية، شرح حديث النزول إضافة الى هذا (مجموع الفتاوي) الـتي جمـع فيهـا أكثـر مؤلفاتـه في سـبع وثلاثـين مجلداً ضخماً وأكثرها في ابو العقيدة.

٥٠- والفارس الثـاني في التـاليف تلميـذ الفـارس الأول "شـيخ الإسـلام الثـاني، والعـالم الرباني إبن القيم الجوزية ٧٥٢هـ، الذي له جهود طيبة في الرد على الفرق الضـالة، منهـا (الصواعق المرسلة على الجهمية والمعطلة)، (اجتماع الجيوش الإسلامية على غزو المعطليـة والجهميـة) (القصـيدة النونيـة) (الشـفاء العليـل في مسـائل القضـاء والقـدر والحكمـة والتعليل) (طريق الهجرتين و باب السعادتين) وغيرها من كتبه القيمة

هـەموو ئـەو پـەرتووك و دانراوانـەی کـە باسمـان کـردن، سـوپاس بـۆ خـوای گـەورە چاپکراون، زۆر پەرتووکیش هەن کە باسمـان نـەکردوون و چـاپ نـەکراون ، ئـی واش هـەن هێشتا هەر لە قۆناغو جیهانی دەستنوسدا ماونەتەوە

# فەرهەنگۆك

| | |
|---|---|
| ساختومان: کۆشك ،قصر. | پێشینە چاکەکان: سەلەفی سالح |
| کرۆك: ناوەڕۆك. | بێ پایان: بێ کۆتا، بێ شۆمار. |
| گێتی: جیهان ، دونیا. | گەواهی: شاهێدی. |
| ڕەها: موتڵەق. | پێشەنگ: پێشڕەو، سەرقافڵە. |
| نەزر: لەخۆگرتن. | تۆکمە: تەواو. |
| بێ خەوش: بێ نەنگ، بێ عەیب. | ڕەوت: ڕێگا ، ڕێباز. |
| خەملاندن: قەبلاندن، تەخمین. | پێوەر: پێوانە، قیاس |
| بارستە: حەجم، قەبارە. | ئاور: ئاگر. |
| دیســـپلین: توندبەنــد کــردن، ڕێکـــار، انظباط. | یاساغ: قەدەغە، ممنوع. |
| | ئایدۆلۆژیا: بیروباوەڕ. |
| ڕێسا: قاعیدە. | مکوڕ: سور. |
| ڕەوانبێژی: بەلاغە. | دەستەواژە: عیبارەت. |
| ئەرد: عەرد، ئەرز، زەمین. | ئاوەلواتا: هاومانا، مرادف. |
| ئاشوب: ئاژاوە، فیتنە. | هەرەس: إنهیار. |
| برەو: رەواج پێدان. | خڕنۆش: خاپور، وێران. |
| شەکەت: ماندو | دڕدۆنگ: دودڵ، قلق. |
| کەلەبەر: کونوکەلێن | لۆژیك: ژیربێژ، مەنتیق. |

| | |
|---|---|
| خودان: خاوەن. | پیتۆڵ: فەلسەفە. |
| گلکۆ: گۆڕ. | نەنگ: خەوش، عەیب. |
| بێ پەروا: بەراشکاوی ، بە سەراحەت. | وێرنە: وەهم. |
| گەلاڵە: ئامادە، بەرهەڤ. | ئەندێشە: خەیاڵ. |
| گزی: فڕو فێڵ. | ڕۆژی بەرێ: ڕۆژی دوایی، قیامەت |

# پێڕست و ناوەڕۆك

## هەندێ لەنووسراوەكانی شوان رابـەر

### یەكەم/ نووسراوە چاپكراوەكانی :

١- بنەماكانی راپۆرت / سالی ١٩٩٢
٢- ڕاپەڕینی ١٩٩١ی كوردستان / ١٩٩٢. چاپی دوو ەم ٢٠٠٤
٣- كۆڕەو شەرەكانی كۆڕێ و دانوستان/١٩٩٣ . چاپی دوو ەم ٢٠٠٤
٤- لێكۆڵینەوەی واقیعێك/ ساڵی ١٩٩٦
٥- لێكۆڵینەوەیەكی ڕەخنەیی/ ساڵی ١٩٩٧.
٦- پاراستنی پێگەو زانیاریەكان / ساڵی ١٩٩٨
٧- بنەماكانی كۆنوس و كۆبونەوە / چاپی یەكەم ساڵی ١٩٩٩ .چاپی دووەم ٢٠٠٠
٨- شەهیدی فەرماندە كاك مەلا عومەر/ چاپی یەكەم ١٩٩٩ . چاپی دووەم ٢٠٠٤
٩- شەهیدی كادیر سەمیر وەرتی/ چاپی یەكەم ١٩٩٩ ، دوو جار چاپكراوە.
١٠- لێكۆڵینەوەی یاسایی/ ساڵی ٢٠٠٠
١١- ڕەگەزپەرستی كۆنەپەرستی یە/ ساڵی ٢٠٠١
١٢- تیرۆرو تۆقاندن/ ساڵی ٢٠٠٢
١٣- سەركردایەتی كارگێری مەنهەجی/ ساڵی ٢٠٠٢
١٤- بێداری موسڵمانان لە ڕوانگەی ئیسلامەوە/ ساڵی ٢٠٠٢
١٥- عەلمانیەت : پێناسەو سەرهەڵدان/ ساڵی ٢٠٠٢ . دوو جار چاپكراوە .
١٦- شەهیدانی بزاڤی ئیسلامی كوردستان .٢٠٠٢
١٧- لێدانی عێراق لەلایەن ئەمریكا ٢٠٠٣
١٨- ڕۆژمێری مانگی ڕەمەزانی پیرۆز . چاپی یەكەم ٢٠٠٥ . چاپی دووەم ٢٠١١.
١٩- ڕێبەری كاری ڕێكخراوەیی هاوچەرخ .٢٠٠٥.

## دووەم / وەرگێڕاوە چاپکراوەکانی :

٤٣- جەنگی دەروونی / مقدم اکرم اسماعیل/ ساڵی ١٩٩٨.

٤٤- پەنجا خراپەکاری دیموکراتیـەت و هەڵبـژاردن و حزبایـەتی/ عبدالمجیـد ریمـی/ چاپی یەکەم ١٩٩٩. چاپی دووەم ٢٠٠٤

٤٥- چارەسەری دەروونی لە قورئانی پیرۆزدا / شێخ ابـراهیم نیعمـە/ چاپی یەکـەم ٢٠٠٠ چاپی سێ یەم ٢٠١٠

٤٦- ئیعجـازی پزیشـکی لەزانسـتی کۆرپەلـەدا/ د. محمـد عبـدالله/ سـاڵی ٢٠٠٠ . دوو جار چاپکراوە

٤٧- یەکبوونی ئیسلامی( بنچینەو هۆکارەکانی بەدیهێنانی) احمد غامدی/ساڵی ٢٠٠١.

٤٨- مەتنی وەرەقات لە ئسولی فقە/ ئیمامی جوەینی/ ساڵی ٢٠٠١

٤٩- سیفەتە کانی سەرکردەی بانگەوازکاری/ عقیل محەمـەد مەقتـەری/ سـاڵی ٢٠٠١ دوو جار چاپکراوە .

٥٠- بیرو باوەڕی سەلەفی سالح/ عبد الله ئەسەری ساڵی ٢٠٠١ .دوو جار چاپکراوە .

٥١- بەهەشـت / نووسینی عەلی حەسەن حەلەبی /٢٠٠٧ . چوار جار چاپکراوە .

٥٢- دۆزەخ / نووسینی عەلی حەسەن حەلەبی / ٢٠٠٧ . چوار جار چاپکراوە .

٥٣- شورەی موسلمانان بە قورئانو سوننە . ٢٠٠٨ سێ جار چاپکراوە .

٥٤- کۆبونەوەکانی ئەنجومەنی حوکمی بەغدا . ٢٠٠٨

٥٥- خۆ کەمگری لە ئیسلامدا / ئامادەکردنی صفا رشاد . ٢٠١٠

**سێ یەم/ نوسراوە چاپ نەکراوەکانی :**

٥٦- چەمکی حاکمیەت/ د. عبدالله عزام /ساڵی ١٩٩٦.

٥٧- مێژووی لایەنە سیاسیەکانی کوردستان/ سالی ١٩٩٧

٥٨- بزاڤی ئیسلامی لە کوردستانی عێراقدا/ ساڵی ١٩٩٧

٥٩- زەنگێکی خەتەر لە دەرگای (ناسیونالیزمی) لێدەدرێت/ ساڵی ١٩٩٨

٦٠- جیهانگەرایی (عولمە) . ١٩٩٩

٦١- فەرهەنگی: عەرەبی - کوردی .

٦٢- نووسینی سەدان بابەتی هەمە جۆر لە بلاْوکراوەو رۆژنامەو گۆڤار ە کان .

٦٣- نووسین و بلاو نە بونەوەی چەندان بابەتی دەستنووسی کوردیوعەرەبی.

٦٤- وەرگێڕانی چەندان گوتار لە عەرەبیەوە بۆ کوردی .

شـوان رابـەر

# الوجيز
# في عقيدة السلف الصالح

## ( أهل السنة والجماعة )

چاپخانەی منارە - هەولێر